# 1

من کابرایەکی ساواکیم؛ نە پێم شەرمە و نە بە خۆیشم دەنازم کە دەستم داوەتە ئەو کارە. ئەوەش کارێکە وەک هەموو کارێکی دی. یانی کارمەندەکانی وەزارەتی دارایی هەموویان دزن؟ یان ئەوانەی لە دادگاکاندا پۆلپۆل خەڵکی بێتاوان لە زیندانێ توند دەکەن یان بە سێدارەیانەوە دەکەن، هەموویان پیاوکوژن؟ خۆ کارکردن لە ئیدارەیەکی دەوڵەتیدا هەر تاوان نییە. باشە دەکرێ لە وڵاتێکی بێ پاسەوان و زێرەڤاندا بژیی؟ بۆ وڵاتێکی ئازادی وەک ئەمریکا 'سیئایئەی'ی تێدا نییە؟ بەریتانیا 'ئاژانسی ئینتلیجێنس'ی نییە؟ فەرەنسا ژووری عەمەلیات و رووسیا 'کاگێبێ'ی نییە؟ لە هەموو جێیەکدا هەیە و دەشبێ هەبن. ئەمڕۆیش ئەگەر پێویست بێ، ئامادەم کار بۆ هەموو کەس بکەم. چاک و خراپی کارێک، پێوەندیی بە لکوپۆکانیەوەیەتی. بەڵێ من بەرتیلم خواردووە. بۆ لە شارەوانی و دادگاکاندا بەرتیلخواردن باو نییە؟ لە دادگا و سوپایشدا هەیە. دەی بۆچی لە ئاژانسی تەناهیپارێز و هەواڵگریی وڵاتدا نەبێ؟ بەڵام من کەسم ئەشکەنجە نەداوە. رۆحلەبەرێکم نەکوشتووە. ئاخر پیاوی ئەو شتە نەبووم. بەڵام دیتوومە خراپەکارانیان ئەشکەنجە داوە. لێی گەڕێ... من فرە شتم دیتووە و زۆر شتیش دەزانم؛ تا دوێنێ نەمدەتوانی باسیان بکەم و بیانووسمەوە؛ نەمدەتوانی ئەوەی بیرم لێ کردووەتەوە و هەستم پێ کردووە، بۆ خەڵکی بدرکێنم. بەڵام ئێستا با بڵێین ئازادم. زاردورین لە گۆڕێ نییە. لەو وڵاتەدا کە من خەریکم بە کولەمەرگی دەژیم، هیچ نەبێ مافی ئەوەم هەیە ئەوەی چەندی چەند ساڵە لە دڵی خۆمدا هەڵمگرتووە بیخەمە سەر کاغەز. هیچ شەرمیش ناکەم. هەر خراپەیەکیشم کردبێ باسی دەکەم؛ باسی خەڵکی، وا ناگێڕمەوە نەچێتە ئەقڵەوە. جا ئێستا کە من خەریکم خۆم پیاوخراپ دەکەم، باشە بۆچی حەیای خەڵکی دیکەش نەبەم؟ من لە ئاستی سەرسەرەوەی ساواکدا بووم. لە خوارەوەڕا دەستم پێ کرد. هەڵبەت لە بوودەڵەکانیش نەبووم. ساڵانی سەرەتا تەنیا لەتە ئیسقانێکم بەر دەکەوت. گۆشتە چەور و نەرمەکەی بەوانی سەرەوە دەبڕدرا و پاشماوەکانی دەدرایە من و کەسانی وەک من؛ هیچی لێ هەڵنەدەکرێنرا؛ گوتم، ئا وا نابێ نا! دەبێ بەشی منیشی تێدا بێ؛ هەوڵم دا لە پلیکانەکان وەسەر بکەوم. ماوەیەکی زۆر هەر ئەوەندەم دەدرایێ ژن و منداڵەکەمی پێ بژێنم و کەچە ترۆمبێلێکیش بکڕم و سەیران و ئەملاوئەولایەکی پێ بکەم؛ ئەو قۆناغە رابرد. ئیتر ئەسکوێم لە بنی مەنجەڵێ گێراوە و ئەوەی پاشکەوتم کردبوو بوو بە تۆزی بانان. ئێستا جلوبەرگێکیشم نییە. چارەڕەشێکی هەڵشکاوم، داماوێکی نقوستان. فیشەکێکم وە لاقێ کەوتووە، چیی وای نەمابوو دڵم یان سەرم بگرێ. ئیتر راکەڕاکم پێ ناکرێ. هەر دەستم بۆ ماوەتەوە! مێشکم کای تێدایە. خۆ ئەگەر بڕوانامەی زانکۆم بەدەستەوەیە و بەکالۆریۆسێکیشم هەیە، خوێندەوارێکی باش نیم. چیم بە زەیندا بێ دەینووسم. نازانم چەنەوەڕی بکەم. فێری درێژدادڕییش نەبوومە. لەوەتەی هەم دە نامەم نەنووسیوە. کەسم نەبووە تا نامەی بۆ بنووسم. نە دۆستێک نە

ناسیارێک؛ هەڵبەت تا بڵێی راپۆرتم نووسیوە. ئێستا لە سای نووسینەوە نان دەخۆم؛ هیچ گفتولفتی ناوێ. هەر ئەوەنەی چەند کەسێک بیخوێننەوە و تێبگەن کە دەبێ 'باج'م بدەنێ، تەواوە.
ئەگەر راستیتان دەوێ، من ئەو کاغەزڕەشکردنەوەیەم بۆ ئەوەیە پارەیەکم دەست بکەوێ و ئەو کەشتییە شکاوە بگەیێنمە کەنارێ؛ زۆریش دوور نییە. هاوسەرەکەم خوا لێی خۆش بێ، چەند ساڵان بەر لە راپەڕین مرد. لاواز و ئیفلیج. رۆژ تا ئێوارێ ترسی ئەوەی بوو کە دۆخەکە دەگۆڕێ و من دەگرن و دەمکوژن. کوڕێک و کچەکەم بۆخۆیان لێیان دا و چوونە ئەمریکا. کوڕەکەم لە ئەمریکا جێی خۆی کردووەتەوە و کچەکەشم مێردی کردووە و منداڵی بووە و ژیانێکی تێروتەسەلی هەیە و هیچ کامێکیان حەزیان لێ نییە خزمایەتیی ساواکییەک بکەن و بەینیان لەگەڵیا هەبێ. منیش وازم لێ هێناون. ئەگەر مەسەلەی روقیە نەبووایە خەمی هیچم نەبوو. سەردەمانێک دوژمنی قەستەسەرم بوو. ئێستا پشتوپەنامە. ئێستا ئەوم خۆش گەرەکە و هەر زۆریشم خۆش دەوێ. پاش دایکە رەحمەتییەکەم، کەسم هێندەی وی خۆش نەویستووە، نە ژنەکەم، نە منداڵەکانیشم. ناتوانێ هیچ یارمەتییەکم بدا، بەڵام ئەوەندەیە جاروبار پەیامێکم بۆ دەنێرێ و هەواڵێکم لێ دەپرسێ. خۆم دەبێ بەرەی خۆم لە قوڕێ دەرکێشم.
کە منداڵ بووین یەکترمان زۆر خۆش دەویست. کە ئەو دەگریا، وێڕای ئەو دەنووزامەوە. چوار ساڵ لە من چکۆڵەتر بوو و بە گوێی دەکردم. هەر گوتبام: ئەوە چ دەکەی؟ بە غاردان دەهاتە لام و خۆی شیرین دەکرد. "روقیە، ئەوە خەریکی چ کەتنێکی؟"
چارەنووس لێکی دابڕین. ئێستا تەنیا و بێکەس کەوتوومەوە و هەوڵ دەدەم بە نووسینەوەی ئەم بیرەوەریانە پاروە نانێک پەیدا بکەم و دەست لە بەر کەس و ناکەسان پان نەکەمەوە. گوتم کەس و ناکەس؛ من دەست پان ناکەمەوە، خۆیان دەبێ بێن و حیسابەکەیان پاک بکەن.

دەی باشە، خۆ گوتم ئازادم. بەڵام ئەوەندەش ئازاد نیم چیی دڵم پێی خۆشە بێ پێچوپەنا بیهێنمە سەر کاغەز و لێفە لەسەر هەتیوان هەڵدەمەوە. ناوی کەس ناهێنم. چونکە هیچ سوودێکی نییە. خۆ دار هەڵێنی، سەی دز دیارە. من لە رەگی قوونی ئەوانەی دەوروبەریشم شارەزام و کەردار کەری خۆی وا ناناسێ. دەزانم چ بوون و چییان کردووە و بوونەتە چی و ئێستا چین و چۆن دەژین و لەگەڵ کام کۆمپانیا یان کارخانە و فرۆشگەدا ساتوسەودایان هەیە و پشکیان چەندەیە و مڵک وماڵیان لە ئەورووپا و ئەمریکا بە ناوی کێیە و داهاتیان چەندەیە. ئەوەش بڵێم بۆ ئەوەی بزانن سەرچاوەی بژێوی منیش لە کوێیە.
من ماوەیەک لە ئاژانسی تەناهی و هەواڵگریی وڵاتدا لە ئەورووپا سەرێک بووم لە ناو سەران. هەمووان لێم دەترسان و خۆیان لەگەڵ رێک دەخستم و تا رادەیەک لێم روون دەبۆوە شازادەکان و خەڵکی دەربار و پیاوانی دەسەڵات و سەرکردە و ساواکییەکان سەرمایەکانیان لە کوێ دەخەنە گەڕ. تەگبیر و راوێژیان بە من دەکرد کە کام پشک بکڕن و لە کام بانک پارەکەیان بخەوێنن یان لەگەڵ کام سەرمایەدار ببنە شەریک و ئەو وردەکارانەشم لێ دەزانین وا لە کەسوکاری خۆیان تەنانەت لە ژن و منداڵی خۆشیان دەیانشاردەوە. یەک بە یەکیان گوڵبژێر دەکەم و ناونیشانیان لەقاو دەدەم و هەڵە و خەیانەت و بەدفەڕی و سووچ و تاوانەکانیان وەها دەسەلمێنم کە نەتوانن نقەیان لێوە بێ. دیارە وەک گوتم ناوی کەسیان ناهێنم. خۆشیان دەزانن مەبەستم کێیە و چییە. ئیتر پێویست نییە

دەستیان لە بەر پان بکەمەوە. خۆیان دەنێرنە شوێنمدا و هەقی خۆمم دەدەنێ و ئابڕووی خۆیان دەکڕنەوە. ئەوە نهێنیی کاری منە. بهاتبا و خوانەکردان هەندێکیان روویان لێم گرژ کردبا و دەستیان بۆ باخەڵیان نەبردبا، ئەوا گۆشەیەکیم بە ناوێکی خوازراو لە یەکێک لە رۆژنامەکاندا کە ئێستا شوکر وەک کارگ لە ئەمریکا و ئەورووپا هەڵدەتۆقن، بڵاو دەکردەوە. ئەگەر ناوی کابرا بۆ وێنە 'نەوشیڕوان' بووبا، من بە ناوی 'نەوشێران' بڵاوم دەکردەوە. پێم وا نییە کەس ئەوەندە بێ چاوڕوو بێ شەرم داینەگرێ. بە پێی ئەزموونی خۆم کە تا ئێستا دوو سێ جارم تاقی کردووەتوە، شتێکی لێ کەوتووەتەوە و شتێکم بە نسیب بووە.
یەکەم کەس کە سەرنجمی راکێشا و تێیگەیاندم جگە لە دەوروبەرەکەی خۆم دنیایەکی دیکەش هەیە، بۆرە خزمێکی دایکم بوو. ناوی مووسا بوو. من پێم دەگوت مووسا گیان. لە سامان و پێگەی کۆمەڵایەتیدا زۆر لێک دوور بووین. من بە دایکمم دەگوت دایکە و ئەو بە دایکی خۆی دەگوت خاتوون. پێکەوە گەورە ببووین. ماڵەکەی ئێمە لەسەر رێی ئاسایشەکەدا بوو، ئەوان دوو سێ کۆڵان ئەولاتر بوون. لە یەک قوتابخانەدا دەمانخوێند. سێ پۆل لە سەرووی منەوە بوو. ئاواڵ بووین.
مووسا گیان باوکی مردبوو و دایکی کابان و گەورەی ماڵ بوو. حەسارێکی گەورەیان هەبوو پڕ لە دارهەنار و دارسێو و دارهەرمێ و دارقۆخ. هەسێڵێکی گەورەشی تێدا بوو کە بۆوەی دەبوو مەلەی تێدا بکەی. ناوکەلە هەشتپاڵووەکەی ماڵیان ژووری جۆراوجۆری تێدابوو، پڕ لە ئاوێنەی باڵانوێن و چلچرا و تا خوا حەز بکا پڕ لە نۆکەر و کارەکەر و باخەوان. ئێمە هەژار و ناهمێد بووین. باوکمم هەر لەبیر نییە. ئێمە حەوشۆکەیەکمان هەبوو. حەوزێکی خڕی تێدا بوو کە چەند ماسییەکی تێیدا دەخولانەوە و من و روقیەی خوشکم بەردەوام ئاگامان لێیان بوو نەکا پشیلەی دراوسێکان تێیان رۆبچێ.
ژوورێکی بچووک و لە بنیشی هەماراو و نادینەکەش لەوبەری حەوزەکەوە بوو و لەولاشەوە ژوورێکی گەورەتر کە تێیدا دەخەوتین و چەند هەرە (مشار) و تەشوێ و دارێکم دانابوو گوایە خەریکی مەرەنگۆزی و دارتاشیمە. دیارە دەرگا و سندووقەکانم نەک چاک نەدەکردەوە، دەشمشکاندن. ئێمە هەر لە ماڵی مووسا گیاندا دەمانتوانی گەمە بکەین. لە ماڵە نزمەکەی خۆماندا شوێنی یاریمان نەبوو. یەکەم کەسێکی بە لاڕێیدا بردم هەر ئەو مووسا گیانە بوو. زۆربەی جارانیش لە قوتابخانەوە پێکەوە دەهاتینەوە ماڵێ.
رۆژێکیان لە گەوی کۆڵانەکەدا راوەستا و چەند قسەیەکی لەگەڵ ژنێکدا کرد. من لەولاترەوە راوەستابووم و دەمدی ئەوە لەو ژنانەیە کە وێڕای زمانچەورییەکەی لەگەڵ ئەودا، لەگەڵ منیش چاوەچاویەتی.
لێیم پرسی:
ـ مووسا گیان! ئەوە کێ بوو؟
ـ خێرا! بۆ دەپرسی؟
ـ هیچ!
ـ حەزت لێیە خوشکەکەیت پێ بناسێنم؟

ئاوا بوو کە ڕۆژێکیان لە قوتابخانەوە سواری پاس بووین و چووینە قەحپەخانە و من بۆ یەکەم جار چێشکەی ژیانی دەوڵەمەندانم چێشت و بە ئاواتەوە بووم وەک مووسا گیان دەوڵەمەند ببم و خۆش رابوێرم.

هەر ئەوەندەی تۆزێک خوێندەوار بووم، دایکم کارێکی بۆ دۆزیمەوە. من بوومە میرزای بازرگانێک لە کۆمەڵەی بازرگانیی حاجیبولدەولەدا. چا و نێرگەلەم بۆ کڕیارەکان دێنا. شۆرباو گۆشتم بۆ نانەوا دەبرد و مزم وەردەگرت و دەمدایە دایکم. حا ج ی نەبی مایەپووچ دەرچوو و مرد. میرزا عەلی خانی کوڕی بەرپرسی ئیدارەی مالیە بوو. لەگەڵ خۆی بردمی و لە بەشی ئەرشیڤ کارێکیان دامێ و من بوومە کارمەند. دەهاتم و دەچووم. مووسا گیان چووە قوتابخانەی سەروەت و دیپلۆمی وەرگرت. ژیکەڵە و چاو و برۆڕەش. تەڕپۆش و جاروبارەش قیت و قنج و لووتبەرز. لەگەڵ من هەر نەگۆڕا. جارێکیان لەگەڵ میرزا عەلی خان چووینە بەندەری لەنگە بۆ ئەوەی لەماڵیاتی ماسیگرەکان بکۆڵینەوە. شەش مانگ لەوێ ماینەوە نە ماسیمان دیت و نە ماسیگر. لە بری ئەوە تا خوا حەز دەکا قاچاخچیی لێ بوو. ئەوان هیی ئەوە نەبوون ماڵیاتیان لێ بستێنی. لەبری ئەوە، بە چەند تۆپ قوماشی هەوریشم و سەعات و بازنەی زێڕ و شتی دیکەوە گەڕاینەوە. بازنەیەکی زێڕم بۆ دایکم هێناوە، کە ئەودەمی روقیە مێردی کرد بۆی کردە باربوو. لە بەندەری لەنگە کە هاتمەوە، ببوومە وشکەقالۆر. هەر ئێسک و پرووسکم لێ مابۆوە. میرزا عەلی خانیان گرت و لە زیندانیان توند کرد. دوایی بوو بە سیخوڕی ساواک و ئێستاش ئەوە لە گۆشەیەکی ئێران دەژی. ئیتر منیان دەرکرد و بوومە بەرەڵا. کە گەڕامەوە، مووسا گیان بۆخۆی ببووە پیاوێک. سەرێک بوو لە نێو سەراندا، ڕێز و حورمەتێکی هەبوو. لەگەڵ من هەروەک جاران بوو. کە زێڕ و مێڕی بە دەستمەوە دەدی، زەردەیەکی دەهاتێ. جارێکیان گوتی: تۆش سیرمەیەکت پێ بڕاوە. من وەڕووی خۆمم نەهێنا، ئەویش باسی نەکردەوە. بێکارییەکەی من ماوەیەکی خایاند.
ساڵی 1337 بوو، ئەودەمەی ساواک تازە پێی دەگرت، ڕۆژێکیان پاش نیوەڕۆ، مووسا گیان هات سەری لە دایکم دا. من و روقیە لەسەر هەسێڵەکە دانیشتبووین. خەریک بووم قاچەکانم دەشوشت و سەیری سوورە ماسییەکانم دەکرد. نەمدەویست منەتباری ئەو بم. نەکا پێی وابێ من داماوم. هەر شتێک بێ، من پیاوێکی بەغیرەتم. بیستم لە دایکم دەپرسی:
"... چ دەکا؟"
"هیچ ناکا، بێکارە. لە بەندەری لەنگە زۆری کوێرەوەری دیتووە. لێی گەڕێی تۆزێک بێتەوە سەرخۆ، کارێکی بۆ دەدۆزینەوە. خۆ لە برسان نەمردووین. هێشتا پارووە نانێک هەیە بیخۆین..." دایکم ئەو دوو گوارە زێڕەی من لە بەندەری لەنگە بۆم هێنابوو، فرۆشتبوونییەوە و ژیانمان دابین بوو.
مووسا گیان کە ویستی بڕوا، لەسەر هەسێڵەکە تۆزێک ڕاوەستا و گوتی:
"براله..."
من ناوی خۆمم نەدێنا. لەبەر زۆر شت.
"براله، بۆ چڵکی لاقت بە ئاوی سارد پاک دبێتەوە؟"
وەڵامم داوە: "تۆ بە پالمۆلیۆ قاچت دەشۆی و دواییش بە عەتری کۆتی دایدەماڵی. ئێمەی هەژار هەر ئەو ئاوە بۆگەنەمان هەیە و دەبێ شوکرانەبژێر بین..."

تاقەتی بیستنی فڕ و لاتاوی نەبوو. گوتی:
ـ گوێ بدەیە. خۆ دەزانی من چەند ڕۆژێکە بوومەتە کارمەندی بانکی نیشتمانی. چەند حەفتەیەکی دی دەچمە ئەردەبیل و دەبمە کارمەندی بانکەکەی ئەوێ."
"مووسا گیان، ئەسپەکە باشی هەڵگرتووی؟ وا زوو؟"
"یانی چی وا زوو؟ ئەوە دوو ساڵە لە وەزارەتی دارایی خزمەت دەکەم و ئێستا نێردراومەتە بانکی نیشتمانی، کارمەندی بانکی نیشتمانیی ئەردەبیل خۆ پلەیەکی بەرز نییە. دوایی پێکەوە باسی دەکەین."
وامان دانا چەند ڕۆژێکی دی بچمە ماڵەکەی.
هەر گوتی و نەیبڕییەوە کە بنیادەم لەو بگرە و بەردەیەدا کە سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە، دەبێ پشتی بە جێیەک گەرم بێ. دەسکەلایەکی هەبێ کە دەستی پێ بگرێ و لە کەوتندا پێی هەستێتەوە.
هەر هەمووان تیردانێکی پڕ لە تیریان هەیە و سێرە لە بنیادەم دەگرن بەو مەبەستەی هەرچی بزوێ بیپێکن. میرزا عەلی خان تۆی بردە بەندەری لەنگە و لەوێ مانەوە و بێکەسوکار کەوتنەوە کەس خەمێکی لێ نەخواردن. هەر گوتی و نەیبڕییەوە و من پرسیم:
"مووسا گیان، تۆ کە ئێستا پشتت قایمە و دەسگرێکیشت دۆزیوەتەوە."
"بەڵێ وایە. تۆش دەبێ بکەویتە ڕێ. دەبێ پشت و پەنایەکت هەبێ. خۆ دایکە ناتوانێ گۆچانی دەستی تۆ بێ." تێنەگەیشتم. نەمزانی دەیەوێ چ بڵێ. کاس ببووم. دەیەویست لۆمەم بکا؟ یان هەر بەڕاستی بەزەیی پێمدا دەهاتەوە؟ دەیەویست خۆی لای دایکم شیرین بکا؟ کە شەوانە پێکەوە دەبووین، ئیتر ئەو مووسایە نەبوو وا پێکەوە دەچووینە قەحپەخانە. وەک بڵێی سەرۆکی بانکە و خەریکە ئامۆژگاریی مشتەرییەکی پلەنزم دەکا. تەزبێحێکی دەنک درشتی بەدەستەوە بوو و بەبێ ئەوەی خۆی بیەوێ، لاسایی گەورەکانی دەکردەوە. تا ئەو دەم ناوی ساواکم نەبیستبوو. بیرم لەوە دەکردەوە، بە پاشماوەی ئەو شتەی لە بەندەری لەنگەوە هێنابوومەوە، دووکانێک دانێم. تەنانەت بە زەینمدا هات بچمەوە بەندەری لەنگە و لەوێ مل بنێمەوە لە کارەکەی شەش مانگ لەوەپێشم. ڕۆژێکیان تەنانەت چوومە سەردانی میرزا عەلی خانیش. سێ مانگ و نیو بوو لە زیندان کرابوو. قەڵەو ببوو. مێشێکیشی میوان نەبوو. کە منی دیت، گەش گەش بۆوە.
"خەریکی چیی؟"

"هێشتا بێکارم و دەمەوێ بچمەوە بەندەری لەنگە. هاتووم سۆراغی یەک دووانێکت لێ بکەم کە هاوکاریی تۆیان دەکرد. زەعشیر و شوبر زۆر باش بوون. لەگەڵ ئێمە هەڵیان دەکرد. میرا کەعبی¬ش کوێرەخوێندەوارییەکی هەبوو و بەو چاوە کەمحوکمانەیەوە لەگەڵمان خراپ نەبوو."
"ڕاوەستە چەند ڕۆژێکی دیکە کێشەکەی من دەبڕێتەوە. من کونی دوعاکەم دۆزیوەتەوە. هەر لەو تەویلەیە بێمە دەرێ، دیسان پێکەوەین. هێشتا ئاوەکە هەڵنەچۆڕاوە."
بە راستی بوو یان درۆ نازانم. بڕیارم دا سەفەرێکی بەندەری لەنگە بکەم. بەڵام چارەنووس ڕۆڵێکی دیکەی بۆ نووسیبووم. مووسا گیان هاتە ماڵمان بۆ ئەوەی ماڵاوایی لە دایکم بکا.
"سبەی بەیانی سەعات دە وەرە ماڵمان کارم پێتە."
سواری تاکسیی کردم و بردمیە بینایەکی چەند نهۆمی. لەبەر دەرگا ڕاوەستام و خۆی لە زەنگەکەی دا و چووە ژوورێ. نیو سەعاتێک لەوێ چاوەڕێ بووم، دوایی یەکێک هات و پرسیی:

"تۆ لەگەڵ مووسا خان بووی؟"
دەرگای کردەوە و بردمییە ژووریّ. چاومی بەست و بە ئەسانسۆر چەند نهۆمێک سەرکەوتین.
یەکێکی دیکە هات و بردمییە ژوورێک و دەرگای پێوە دا. نیو سەعاتێکی خایاند. نا، نازانم ئەو ماوەیە هێندەی عومرێک درێژ بوو. هەر لەو ژوورەدا دەرگایەکی دیکەی تێدا بوو و من هەوڵم دا بیکەمەوە. گوێم لە دەنگی پێیەک بوو. دڵم وەک باڵی چۆلەکە فڕکەی دەهات. چیی نەمابوو بیکەمە هات و هەرا. چیی جنێوی دەمزانی حەواڵەی مووسا گیان و جەد و ئابادیم کرد. شتێک لە ناخمەوە بانگی دەکردم. هەر شتێک هەبیّ، لەم ژوورەدایە. چاویان کردمەوە. دەرگا کراوە و یەکێکی چاویلکەڕەش هاتە ژووریّ. مێزێک و دوو کورسی لەویّ بوو.
پرسیی:"ناوت چییە؟ من دکتۆر بێژەنم."
جوابم نەداوە.
گوتی: دانیشە.
سەر مێزەکە کاغەزێک و سیّ قەڵەمی لیّ بوو. زەندەقم چوو. دووقڕانییەکەم کەوت. ئێرە ساواکە. لێرە "س و ج"ێیان لە بنیادەم دەویّ و دەچنە بنچ و بناوانی هەموو شتێکەوە. بیّ و نەبیّ ئەوی لە لەنگە هێناومە دەبیّ داینێم. دەسگرەکەش هەر ئەوەیە. لەوانەیە قوتار بم. لەبەرخۆمەوە دەمگوت: یانی میرزا عەلی خان ئاوای لیّ هات. ڕواڵەت و ڕوخساری کابراش قار و غەزەبی لیّ نەدەباری.
گوتی:
"من دکتۆر بێژەنم. من سەعاتێکت بەجیّ دێڵم و تۆ شەرحی ژیانی خۆت دەنووسی. بەڵام ورد ورد هیچ لە بیر مەکە. شتە گشتییەکان خۆمان دەیزانین. هاوڕێکانت کێن. لەگەڵ کیّ هاموشۆت هەیە. ناوی ناسیارەکانیشت بنووسە. ناوی دایکت و باوک و خوشکت و چ کارەی؟ ژیانت بە چی هەڵدەسووڕیّ. تەنانەت ئەو شتانەی پێت وایە گرینگ و پێویستیش نین، ورد و بیّ کەموزیاد بیاننووسە."
گوتم:"جەنابی دکتۆر، خۆ من هیچم نەکردووە. لە هیچ تاقم و حیزبێکی سیاسیدا نیم."
گوتی: " دەزانم، لەخۆت باشتر دەزانم. دەتەویّ باسی ئەو شتانەت بۆ بکەین کە خۆیشت نایانزانی؟ دەزانم هیچکارە نەبووی و هیچ گووکارییەکیشت نەکردووە. ئەی بۆوە نەهاتوویە ئێرە ئیتر پیادە نەبیت و سوار بیت؟"
ئەوەی گوت و هەستا و هێشتا دەرگاکەی پێوە نەدابوو، دووپاتەی کردەوە:
"کەوابوو، من پاش سەعاتێک دیمەوە و کاغەزەکان دەبەم."

ڕۆیشت و من دەستم دایە قەڵەم و چەند هێڵێکم بە لاپەڕەی یەکەمدا کێشا و لە دڵی خۆمدا گوتم:" چ بنووسم، چ نەنووسم؟ غیرەتم وەبەر خۆم نا و ورد ورد لەو دەمەوە کە شەش ساڵان بووم و دایکم بردمییە قوتابخانەی فەرهەنگ و من وردیلە بووم و لە کورسییەکەی پێش پێشەوە دانیشتم، نووسیم. منداڵێکی گێلۆکە نەبووم و چیی لە قوتابخانە دەخوێند فێری دەبووم. تا پۆلی یازدەم خوێند و ئیتر لە ئیمتیحان کەوتم و نەچوومە قوتابخانە و ڕۆژە بەرەڵا بەرەڵا دەخولامەوە. شەش مانگی یەکەم دایکم نەیزانی لە دەرس رادەکەم و لەگەڵ لات و لووتان دەسووڕێمەوە و دایکم کارێکی بۆ دۆزیمەوە و لە پێشدا لە کۆمەڵە بازرگانییەکەی حاجیبولدەولە لای حاجی نەبی نامیە بەر کار و دواییش لە دارایی. خوشکەکەم ناوی ڕوقەیەیە. هاوڕێکەشم مووسا گیان. لە دارایی چۆناوچۆن لەبەر دەستی میرزا

عەلی خاندا فێرە کار بووم. هەموو جۆرە کارێک. چۆن کاروباری مشتەرییەکانم وەدوا دەخست. چەندەم بەرتیل وەردەگرت و چەندەیم دەداوە بە میرزا عەلی خان و پشکی میرزا عەلی خان کە دووهێندەی من بوو. دەیگوت ئەو دەبێ نیوەی بەشەکەی خۆی بداتە بەرپرسەکەی. لە بنەوە ئاگام لێی بوو کە خۆی هەندێ جاران پارەیەکی زۆری لە مالیاتدەرەکان وەردەگرت و دەیگوت بۆ بەرپرسەکەممە و یان لانیکەم لای من وای دەنواند. هەموو جۆرە خەڵکێک دەهاتنە لای. بۆینباغ لەمل و کڵاولەسەر و مەندیل بەسەر و دێوەرە و چەرچی و بازرگانی مایەپووچ و وردە بازرگان. لە گەڕەکی "چاڵەژەهر" بە کاروبارەکانیان رادەگەیشت. بۆینباغییەکان، ئاغای چەرچییەکان بوون. سیاسەت وابوو لە پێشدا هەر کەسە و بە بیانوویەک مەحتەلمان دەکردن. دەسخەڕۆمان دەکردن. هەڵماندەسووڕاندن تا بێزار دەبوون و یەکێکیان دەکردە نێوبژیوان، چەنەیان لێ دەدا و چارەسەرمان دەکرد. مانگێکی مابوو بۆ سەفەری لەنگە، یەک "شاهی"یان نەدامێ. گوتی: دەبێ هەمووی بداتە بەرپرسەکەی. خەریکە کارێکی باشمان بۆ جێبەجێ دەکا و لەوێ پاروومان لە رۆن دەکەوێ. داهاتێکی وامان نەبوو ئاهی دڵ دامرکێنێ. بەڵام لە لەنگە بێتاممان کرد. میرزا عەلی خان هەزار فێڵی دەزانی کە هەر لە رووم نایە باسیان بکەم. جاری وابوو هەوڵم دەدا نەهێڵم زێدەڕۆیی بکا. پێکەنینی پێم دەهات و بە منداڵی دەزانیم و دەیگوت: کە گەورە بووی، ئاقڵ دەبی. خۆ بێت و هەموو ئەم شتانەم نووسیبایە، پەتەی خۆم سەرئاو دەکەوت. تا ئەوێ رۆژێ هەر پێم وابوو دەکرێ وەک چۆن فێڵ لە جەندرمان دەکەی، ئاواش کڵاو لەسەر ئەم ساواکییانە بنێی و بەرەی خۆت لە قوڕێ بێنیتە دەرێ. بە کورتی سێ لاپەڕەم پڕ کردەوە و چاوەڕوان دانیشتم. لە سەر مێزەکە هەسڵم و ئیتر چاوم کرابوونەوە و دەمتوانی بچمە لای پەنجەرەکە و سەیرێکی دەرەوە بکەم. شتێکی وام بەرچاو نەکەوت. هەر هاتم و چووم تا لە قوفڵی دەرگاکەدا دەنگی کلیل هات.

ئەمجارە پیاوێک، کە دەیگوت من دکتۆر جیهانگیرم و جانتایەکی پێ بوو، بە روخسارێکەوە کە زەردەخەنەیەکی درۆیینی تێدا بەدی دەکرا و جگەرەیەک بە لێوەوە هاتە ژوورێ. جانتایەکی زەردی چەرمینی بەدەستەوە بوو، چاویلکەی خۆرشکێنی لەچاو کردبوو، بۆیە بۆت ساغ نەدەبۆوە رواڵەتی چۆناوچۆنە. وا پێدەچوو دەیەوێ دڵی من راگرێ. من ئەو کابرایەم جوان نەناسی. دەیەویست بمخەڵەتێنێ و قسەم لێ دەرکێشێ؟ لووتبەرز بوو یان رووی گەش بوو؟ هەرچۆنێک بێ، دەیتوانی ئەکتەرێکی باش بێ. ترساندمی.

"دانیشە برا."

لە جانتاکەیدا بە شوێن شتێکدا گەڕا. دەستێک وەرەقی لێ دەرهێنا و لەسەر مێزەکەی دانا. دەیەویست وا بنوێنێ کە بە هەڵە دەریهێناون. دووقرانییەکەم کەوت. وەرەقەکان هیی من بوون. دەسبەجێ خستنیەوە نێو جانتاکەی. ئەو لاپەڕەی پرم کربۆوە، هەڵیگرت. سەیرێکی کرد. چەند چرکەیەک چاوی بڕییە لاپەڕەکەی دووەم و هەر چاویشی لە لاپەڕەی سێ نەکرد.

"هەموویت نووسیوە؟"

گوتم: "بەڵێ"، بەڵام فکرم لە شوێنێکی دی بوو. ئەوە هەر ئەو لاپەڕانە بوون کە نیشانەم کردبوون و گیرفانی شێخ غەزەنفەرم پێ بەتاڵ کردبوون و هاواری لێ هەستا. کردیە هەرا. هەڕەشەم لێ کرد. چەندت ماسی گرتووە؟ کوا پسوولەی پیتاکت؟ ریاندم بەگۆڕی بابیدا. نقەی لێوە نەهات. ئێستاش ئەوە ئەم دکتۆرە لاپەڕەکانم بەچاودا دەداتەوە.

"کەوابوو ئەو شێخ غەزەنفەرە بۆچی چووەتە پۆلیسخانە و شکایەتی لێ کردووی؟"
"کاکە گیان، ئەوانە خەریکی قاچاخچێتی بوون و من دەمگرتن و، بوختانیان بۆ بنیادەم هەڵدەبەست."
من دەمگوت و ئەو گوێی رادەگرت و راینەدەگرت و بە نووسینەکەی مندا دەچۆوە. بەڵام یادداشتی نەدەکرد. دڵم دەفڕی. دەترسام "س. ج" بەرۆکم بگرێ.
دیتم ئەو کارانەی من بەهەند وەرناگرێ. پرسیاری دەکرد و من وەڵامم دەداوە و ئەو کاغەزی نێو ج انتاکەی دەردێنان و سەروژێری دەکردن. لە پڕ قسەی پێ بڕیم و گوتی:
"ئەی ئێستا چ دەکەی؟"
"بێکارم." و بۆم باس کرد کە دایکم مافوور و کەلوپەلی ماڵەوە دەفرۆشێ و هەرچۆنێک بێ پارووە نانێک دەخۆین.
هەر گوتم:" دەمەوێ بچمەوە بەندەری لەنگە." گوێقوڵاخ بوو.
"لەوێ چ دەکەی؟"
"کاسبی دەکەم."

"دەتەوێ ببیتە قاچاخچی؟"
"نا، بەڵام قاچاخچییەکان دەگرم و دەیاندەمە دەست پۆلیس."
"جەنابی میرزاعەلی خان... گوتوویەتی ئاگامان لێت بێ، ئەگینا لێت دەقەوما."
"لە گەورەیی خۆتانە."
کوێت پێخۆشە، دەتوانی بچی. بەندەری لەنگەش جێیەکی خراپ نییە. بەڵام مەرجێک هەیە. لە هەر کوێ شتێکت دی کە لەگەڵ بەرژەوەندییە باڵاکانی نیشتمان ناتەبایە، دەبێ منی لێ ئاگادار بکەیەوە."
کەوابوو داوای سیخوڕییان لێ دەکردم. لێی تێگەیشتم. خۆم لە گێلی دا. سەیرە، ئەگەر خۆی پێ زیرەکە، من لەو زیرەکترم.
گوتم:" بەڕێز، بەرژەوەندیی باڵای نیشتمان، یانی چی؟"
بە تێروتەسەلی باسی ئەو شتانەی کرد کە هەمووومان دەیانزانین. گوتی: ئەگەر یەکێک جنێوی بە شا دا، ئەگەر کەسێک کاغەزێک شتێکی لە عەرەبستان و پاکستانەوە هێنا، بەتایبەتی ئەگەر یەکێک کتێبێکی بەدەستەوە بوو و خوێندییەوە و دای بە ئەکێکی دیکە، ئەگەر مەلایەک ویستی جگە لە قورئان و سیپارە شتێکی دیکە فێری منداڵی خەڵک بکا و، ئەگەر یەکێک لە شارەکانی دیکەوە هاتە لەنگە و ویستی پێوەندی بە خەڵکی دیکەوە بگرێ، ئەگەر دەرکەوت و خۆی بزر کردەوە. ئەگەر خوای نەکردە، دەمانچە و کێرد و قەمەی هێنا و بە گەنجەکانی فرۆشت. ئەگەر شەوانە چەند کەسێک لە بن خێوەتێک کۆ بوونەوە و قسەوباسیان کرد... هەر گوتی و نەیبڕییەوە و من نەمزانی سیخوڕی چییە و دڵنیا بوومەوە کە ئەو کارانەم پێ دەکرێ. کەواتە هەر ئەو شتە بوو کە مووساگیان ناوی نابوو دەسگرە و پشتگەرمی.
پشتم گەرم بوو. بە دایکمم نەگوت چ کارەم. لەو چوارسەد تمەنەی جەنابی دکتۆر بیژەن بە قەرز پێی دابووم، سەد تمەنیم دایە دایکم و بڕیارم دا کاڵەی لێ هەڵکێشم و بچمە لەنگە بۆ ئەوەی میرزا کەعبی بڕێنم بەگۆڕی بابیدا. ئەوە رواڵەتی مەسەلەکە بوو. دەشترسام. هەر کە لەو بینا چەند نهۆمییە هاتمە خوارێ، هەستم کرد هەموو کەس لێم بێزارە. بە پیاوخراپم دەزانن. لەبەرخۆمەوە دڵی خۆمم

دەدایەوە: "خۆ با، بەدەست ناگیردرێ." دەبێ هەڵکەی و پارێزراو بێ. چ سەگبابێک دەتوانێ شان لە شانی من بدا. ئیتر خۆمم بە ساواکییەک دەزانی. هەر کەس شان لە شانم بدا، شەرتە وای بەعەرزیدا بدەم پشووی نەیەتەوە بەر. ئەوانە هەرِوگیڤ بوون. چەند رۆژێک بیرم کردەوە ئاخۆ بچمە لەنگە یان نا. ئەرێ باشە ناکرێ هەر لێرە لە تاران سیخورِییەکە بکەم ؟ هەرچۆنێک بێ دانم بە جەرگی خۆمدا گرت و ساغ بوومەوە سەفەرێک بکەم، کە زەماوەندی خوشکە چکۆڵەکەمی بەسەردا هات. دایکم پێداگر بوو راوەستم تا ئەو کارە خێرە سەردەگرێ. تا ئەودەمە زاوام هەر نەدیتبوو. بیستبووم کە روقیە هاموشۆی کابرایەک دەکا چەند ساڵێک لە خۆی گەورەترە و باسی زەماوەندەکەیەتی. ئەو رۆژەی کورِە هاتە خوازبێنی و دایکم لە ژوورەکەی من پێشوازیی لێ کرد، لە ناکاو راچڵەکیم. وەک بڵێسەیەکی لەپرِ دەدرەوشێتەوە و دادەمرێکتەوە، خەیاڵ هەڵیگرتم کە دەڵێی ئەو برادەرەم لە جێیەک دیتووە. بەڵام هەرچی کردم و کراندم نەمدەناسییەوە. جاری وابوو هەستم دەکرد ئەوە هەر ئەو کابرایەیە وا کاڵا قاچاخەکانی نێو بەفرگرەکەی لێ کرِیوم. بەڵام یەکیان نەدەگرتەوە. دڵنیا بووم کە لەو چەند مانگی بێکارییەمدا چەند جاران تووشی بووم، بەبێ ئەوەی شانمان لە شانی یەکتر دابێ. لەپرِ گوتم، نەکا بەر لەوەی چاوم بە دکتۆر بیژەن بکەوێ، ئەوە چاوی بەسەرمەوە بووە و ئێستاش بۆ ئەوەی بچێتە بنچ و بناوانی شتەکانەوە بیەوێ بێتە نێو ماڵەکەماەوە. بەڵام ئەو ساویرەش هەر لە خۆوە رەوییەوە. پاش چاکوخۆشییەک نێوانمان خۆش کرد و بووینە برادەر. شەوانە لەگەڵ روقیەی خوشکم و بەتەنێ لە کافتریاکاندا بیرەمان دەخواردەوە و من پرێسکەی دڵی خۆمم بۆ دەکردەوە. تاقە شتێکی لێیم دەشاردەوە، چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ دکتۆر بیژەن و راسپێردراوییەکەم بوو لە لەنگە. دە پازدەرۆژێک شەو و رۆژ پێکەوە بووین و هەر جارێکی دەمەویست داوای لێبوردنی لێ بکەم کە دەمەوێ خۆم بۆ سەفەرێک ئامادە بکەم، دەیگێرِامەوە. زەماوەندەکەی روقیە وەدرەنگی کەوت. بۆ سبەینێ کە لەگەڵ گەراجی باشووردا کاتم دیاری کرد بۆ ئەوەی بار و بوخچەکەم بەرمە ئەوێ، شەوێ کە هاتمەوە دیتم نامەیەکیان لە بن دەرگاکەوە خستووەتە نێو داڵانەکەی ماڵێ. دکتۆر بیژەن داوای کردبوو سەعات دە بچمەوە ئەو بینایەی لەگەڵ مووساگیان چووبووم. هێشتا لە زەنگم نەدابوو یەکێک دەرگای لێ کردمەوە. ئەی ماڵی وێرانم، خۆ دەسگیرانەکەی روقیە بوو. بەندی دڵم پسا. لاڵ بووم. ئەو پێکەنی و من ئیتر قسەم نەکرد. بە ئەسانسۆر چوومە سەرێ و ئەمجارە بردیانمە ژوورەکەی دکتۆر بیژەن. دەرگا کرایەوە و دووبەدوو بەبێ دەسگیرانەکەی روقیە بەرەورِوویی یەکتر دانیشتین.

خوشکەکەم شووی نەکرد، بەڵام دووگیان بوو. دایکم لێی شاردمەوە و داو دەرمانیان دەرخوارد دا تا منداڵەیان پێ فرێ دا. کە لە نەخۆشخانە چوومە ژوورسەری، بە رێکەوت لە پەرستارەکانم بیست کە شتێک قەوماوە. دکتۆر بیژەن بە تێروتەسەلی بۆی روون کردمەوە کە خەتای روقیە بووە و ئەو کورِە هیچ خەتایەکی نەبووە. دیارە من بروام نەکرد، بەڵام دەسەڵات چ بوو؟ یان دەبوو خۆم بکوژم، یان ئەو هەتیوە، یان روقیەی خوشکم. غیرەتی هیچ کامەشیانم نەبوو. راسپێراوییەکەی من لەو رۆژەوە دەستی پێ کرد. بە تێروتەسەلی و ورد ورد پێم شەرح ناکرێ، ئەگینا هەر نابرێتەوە.
کورتی ببرِمەوە، کاری من ئەوە بوو خۆ بخزێنمە نێو قوتابییە چەپییەکانەوە. لە زانکۆ دەیانکردە هەرا. لە خۆوە نەدەچوونەوە سەر پۆل. تەنانەت سووکایەتییان بە یەکێک لە مامۆستاکانی بەشی

پزیشکییش کرد. نەیانهێشت بچێتەوە پۆل، چونکە چاکەی شای خاوەنشکۆی گوتبوو. گوتیان ئەوە بەو جۆرە دەیەوێ بیکەنە سەرۆکی زانکۆ. ئەرکی من ئەوە بوو بزانم کێ سەرگەورەی ئەو ئاژاوەگێڕانەیە. ئاگاداریان کردمەوە کە جگە لە من راسپێراوی دیکەش هەن و چاویان بەسەر وەزعەکەوەیە و لەوانەیە لە سۆنگەی هاندان و دنەدانی قوتابییەکان بۆ کاری تێکدەرانە، گومان لە خۆم بکرێ و پیاوانی ئیدارەی پۆلیس خۆم قۆڵبەست بکەن. گوتیان نەترسێم و غیرەت وەبەر خۆم بنێم و بەبێ پرینگانەوە خۆم ئازا بکەم. مەبەست ئەوەیە رێکخراو ـ بۆ یەکەم جار ئەو ناوەم لە دکتۆر بیژەن بیست ـ بزانن بە راستی کێ لە پشت ئەو ئاژاوەنەوەیە و پێوەندییان لەگەڵ چ دەستە و تاقم و حیزب و بەرپرسگەلێکی دەرەکی هەیە. نهێنیی کارەکە ئەوەیە، بەبێ تاقیکردنەوەی دەراو، خۆ پێدانەدەم. چونکە هیچ دوور نییە کە هاندەران خۆیان سەر بە ئاژانس بن و ئەوانیش ئەو رۆڵە بگێڕن کە پێیان ئەسپێردراوە. خۆ قەرار نییە ئیتر من سەرێک لەو ماڵە نەدەمەوە و هەر لە رێگەی دەسگیرانەکەی روقیەوە ـ کە ئیتر ناوی ببووە زاوازێڕینە ـ راپۆرتەکانم بگەیەنم و تەنیا ئەگەر پێویست بوو شەوانە بە ژمارە تەلەفۆنی .... سێ جار تەلەفۆن بکەم و پێوەندی بگرمەوە. قەت بە تەلەفۆن تەنانەت ئەگەر راپۆرتەکە زۆر بەپەلە و گرینگیش بێ، نەیگەیەنم.

کەرەستەی کارەکان لە هەموو بوارێکەوە دابین کرا. منی ماڵوێران کە ناوم لەو کاغەزانەدا "یارۆ"یە، بوومە قوتابی و لە بواری ئابووریدا دەرسم دەخوێند و ئەوەش کارێکی سووک و سانا نەبوو. خۆ من لە پێنجەم دواناوەندی پترم نەخوێندبوو و هیچ دیپلۆمێکیشم نەبوو و، بە راسپاردەی یەکێک لە مامۆستاکان کە خۆی پشکدار بوو، ئەویش لەو سۆنگەیەوە کە قوتابییەکی زیرەک و بەهۆشوگۆش و هەوڵدەر و ماندوویینەناس بوو، رێگەم درا بچمە پۆلی وانەکانی ئابووری و مێژوو و ئەدەبیات و، گفتیش بدەم دوایی ئیمتیحانی دواناوەندی بدەم و دیپلۆمەکەم وەرگرم. ئەو بەڵێنەی قەت نەچووە سەر. جا وەک قوتابییەک ناچاریان کردم کار بکەم. ناچار بووم کۆمەڵێک دەستەواژە فێر بم کە تا ئەودەم هەر نەمبیستبوون. کوڕەکان لە باسوخواسەکانیاندا هەندێ دەستەواژەیان بە سەروگوێی یەکتردا دەدا، کە من تازە دەمبیستن و، منیش کە دەمویست نۆکی نێو هەموو چێشتێک بم، دەبوایە فێریان بم. وشە و دەستەواژەی وەک ئایدۆلۆژیا و مارکسیزم و کۆمەڵگەی مرۆیی و خۆی لە خۆیدا و دەقاودەق و دیاردە و دروشم و لیبرالیزم و کۆنەپەرستی و پێشەنگ و ئەو شتانە دەکرا زوو فێریان بی. ئەوەی زۆر ئەستەم بوو، تێگەیشتن لەو بابەتانە بوو کە چەلەحانێیان لێ دەکەوتەوە. رۆژنامەکان و کاغەز و پۆستەرەکانی بانگەشە و نامیلکە سیاسییەکانم ورد ورد دەخوێندەوە، جاری وابوو کتێبەکانیانم لێک دەکردەوە و هەڵمدەدانەوە. کە ئاوڕم دایەوە خۆم خەریک بوو دەبوومە قوتابی. ئیتر وام بیر نەدەکردەوە کە من قوتابییەکی درۆیینەم.

هەر بەوەندە مایە و هەوێنەمەوە بەشداری باس و مناقشەکانیان دەبووم. بەر لە هەموو شتێک بەتایبەتی پەلاماری سوپا و دەربار و هەندێ نوێنەری پەرلەمانم دەدا. هیچ ترسم لەوە نەبوو لە قسە و وتارە ئاگرینەکانمدا ناوی شا و دەوروبەرییەکانی بێنم. پاش چەند مانگ من وەک ئەندامێکی سەردەستەی قوتابییە شۆڕشگێڕەکان لەقەڵەم درام و تاقمێک لە قوتابییەکان لایەنگر و شوێنکەوتەی من بوون. چیی گوتبایەم ئەوان دەیانکردە دروشم و دەمبیستەوە کە لە چەلەحانێ سیاسییەکانیاندا ناوی "یارۆ" دێنن، کە کابرایەکی تێگەیشتووە و باش تێگەیوە چاوگەی کێشەکە کوێیە. ئیتر وای لێ

هات سەردەستەی تاقمە سیاسییەکان خۆیانیان دەناساند. یەکێک هات و گوتی: "یارۆ" تۆ لە خوت و خۆڕایی ئەندامی حیزبەکەی ئێمە نی. ئەگەر حەز دەکەی دەتناسێنم."

یەکێکی دیکە بردمییە ئەولاوە و گوتی: "دوێنێ لە ئەنجومەن باسی تۆم کرد، هاوڕێیان حەز دەکەن بتناسن." سێیەمیان تەنیا پەسنی "یەکێتیی کرێکاران" و چوارەمی پەسنی "هێزی سێیەم"ی دەدا. ناوی هەر هەمووانم یادداشت کرد و بە زاوازێڕینەدا گەیاندمە دەستی دکتۆر بیژەن. لە هەموان گرینگتر گەنجێکی کورتەباڵا بوو بەناوی ئاهاری کە خۆی لێ نزیک دەکردمەوە و هانی دەدام بۆ ئەوەی هەموو رۆژێ دروشمی توندوتیژتر بدەم. ئیتر وای لێ هات من دەستە گوڵێکم بەئاودا دا و ئەوە بوو بە شتێکی چارەنووسساز. پاش دوو ساڵ خۆم ببوومە شۆڕشگێڕێک ئاو نەیپاڵێوێ.
مانگرتنی قوتابییەکان رۆژ بە رۆژ تەشەنەی دەکرد. مامۆستاکان یان لای قوتابییەکانیان دەگرت، یان نەدەچوونەوە سەر پۆل. سەرۆکی زانکۆ بووە گوێلەمست. بە نەرمونیانی و سیاسەت هیچ شتێک جێبەجێ نەدەبوو و زانکۆ رۆژ بە رۆژ پتر دەشێوا. تاقم و گرووپە جۆراوجۆرەکان تێک بەردەبوون. سەری قوتابییەکیان وا شکاند ناچار بوون بیرفێنن بۆ خەستەخانە. لەو وەزعەدا سەرۆکی زانکۆ پێشنیاری بە وەزارەتی زانست کرد کە پێشوازی لە وەفدێک بکا، بۆ ئەوەی ئەوان داواکانیان بخەنە روو. یەکێک لە نوێنەرانی قوتابییەکان ئاهار ی بوو کە بڵندگۆ و وتەبێژی شاندەکە بوو. وەزیر پێشوازیی لێ کردن و بەڵێنی پێ دان کۆمەڵێک کاری پێویست بکەن کە بەدڵی قوتابییەکان بێ. لە نێو پێنج قوتابیدا چوار کەسیان رازی بوون و خۆیان بە سەرکەوتوو دەزانی. تەنیا ئاهاری ناقایل بوو کە پێدەچوو دەست لە گونان درێژتر لە لای وەزیرەوە گەڕابێتەوە.
ئاهاری هاتە لای من و گوتی، وەزیر کوڕەکانی هەڵخەڵەتاندووە و زۆری پێ دەوێ تا قوتابی دیسان کەفوکوڵ بیانگرێتەوە و ناڕەزایەتی بنوێنن. دەبێ کارێکی وا بکەن ئەو بڵێسەیە دانەمرکێتەوە. سەیرم کرد گەنجە و خوازیاری ناوبانگ، بۆیە فکرێکی تازەم بە مێشکیدا هات.
وزیر ئەمری کردبوو لە ماوەی حەفتەیەکدا، ئەنجومەنی زانکۆ کۆ ببێتەوە و ویست و داخوازیی قوتابییەکان تاوتوێ بکا و بە شوێن رێگەچارەیەکەوە بێ کە هەم بۆچوونی حوکمەتی تێدا بێ و هەمیش بژیوی قوتابییەکان دابین بێ.
چاوپێکەوتنی شاندی نوێنەرایەتییەکە رۆژی چوارشەممە بوو و وا دانرا ئەنجومەن لە رۆژی شەممەوە دەست بکا بە تاوتوێکردنی و کۆمەڵێک رێگەچارە بخرێنە روو. من بڕیارم دا پێشی ئەو نێوبژیوانی و شتە بگرم. چەند کەسێک لە کوڕەکان کە لە قسەم دەرنەدەچوون، کۆم کردنەوە و خەڵەتاندمن و کارێکی وا توندوتیژم پێ ئەسپاردن، کە دەسبەجێ مەسەلەکە یەکلا بکاتەوە. بەبێ ئەوەی ئەوان بڵێن من چ نەخشەیەکم لەبن سەریدایە. خاڵی سەرەکی ئەوە بوو. ئاهاری راستی دەکرد و بنیادەم نابێ بخەڵەتێ. دەبێ داخوازیی قوتابییەکان بۆ دابینکردنی کەرەستەی خواردنگە بە نرخێکی هەرزان و خەوتنگەی زیاتر بۆ قوتابییەکانی دەرەوەی تاران و لێخۆشبوون لەو پارەیەی ساڵانە لێیان دەستاندن و دابینکردنی ئازادیی بانگەشەی سیاسی لە نێو زانکۆدا بەتایبەتی دەرکردنی چەند مامۆستایەکی زانکۆ کە لە رۆژانی مانگرتندا سووکایەتییان بە قوتابییەکان کردووە، هەر لەو یەکەم دانیشتنەی ئەنجومەنی زانکۆدا پەسند بکرێ و جێبەجێیش بکرێ. بڕیارەکان بەگشتی کران و زۆرینەی ناڕازییەکان لەسەری کۆک بوون و قوتابی بڕیاریان دا تا رۆژی یەکشەممە پێشنیار بکرێ

به ئەنجومەن و ئەگەر تا سێ شەممە پەسند نەکرێ، هەموو زانکۆ سەرلەبەر مان دەگرێ و سەرۆکی کۆلێژی یاسا کە خۆی یەکێک بوو لە داشدیارەکان، ئەو پێشنیارەی خستە روو.
جۆش و خرۆشێکی سەیر هەستا. هەموو چاوەڕوانی کاردانەوەیەکی توند بوون. بەرژەوەندی هەموو قوتابییەکان بەتایبەتی ئەو قوتابیانەی تارانی نەبوون و زۆرینەش بوون و نە جێ و شوێنی حەوانەوەیان هەبوو و نە پارەیەک بۆ بژیوی ژیان، لەو پێشنیارەدا رەچاو کرابوو. ئەو رۆژنامانەی لەگەڵ بەزمەکەدا بوون، سەروتارەکانی خۆیان بۆ رووداوەکانی زانکۆ تەرخان کردبوو. حکوومەت خۆی بۆ هەر چەشنە پێشهات و رووداوێک ئامادە کردبوو. شەوی سێ شەممە دەسگیران(ـەکەی روقیە) لە منی پرسی:" بەتەما ن چ بکەن؟" دەیەویست گۆلی خۆی بکا و هەواڵەکە بگەیەنێتە خاوەن هەوالان. بەڵام زمانی خۆم گەست، گوتم: "نازانم."
باش بیرم لێ کردەوە کە چ فێڵێک بکەم وابێ کلکی خۆم بەتەڵەوە نەبێ. ئەو شەوە رۆژنامەکانم خوێندەوە. رۆژنامە چەپەکان، قوتابییەکانیان هان دەدا مان بگرن. راستئاژۆکان پێشنیاریان دەکرد بە زەبروزەنگ بەگژ حوکمەتدا بچنەوە. لێم روون بۆوە.
تا بەیانیی سێ شەممە هیچ نەکرا. چوومە زانکۆ سەیرم کرد پۆلیس دەوراندەوری زانکۆی گرتووە. ترۆمبێلەکانی سوپا پڕ پڕ لە سەرباز هاتبوون. سەرۆکی زانکۆ بەو مەبەستەی وا بنوێنێ لە کەوشەنی بندەسەڵاتی ئەودا هیچ شتێکی خراپ ناقەومێ، لە ترۆمبێلەکەی بەر دەرگا دابەزی و چووە ئۆفیسەکەی خۆی. کۆمەڵێک لە قوتابییە میانڕۆکان کە لە هەردووبەری شەقامەکەوە راوەستابوون، ریز بوون و چەپڵەیەکیان بۆ لێ دا و هەندێکیشیان هەیدێ¬یان لێ کرد.
سەرۆکی زانکۆ پاش کورتە دانیشتنێک لەگەڵ سەرۆکی کۆلێژەکان چووە ئەنجومەن.
ئاهاری دەستی گرتم و پرسیی:
"ئەم جارە دەبێ چ بکەین؟"
گوتم: "خەمت نەبێ، ئێستا فەرمان دەکەم."
"تۆ چ کارەی فەرمان دەردەکەی؟"
گوتم: "ئەی تۆ چکارەی؟ چوویە لای وەزیر و سەرت نەوی کرد."
"هیچ وا نییە."
"برۆ هەتیو، هەمووان دەزانن دەستەوستانی. ئێستا ئەوەی من دەیڵێم دەبێ بیکەی ئەگینا حەیات دەبەم و بە هەموو قوتابییەکان دەڵێم بایی چەندی. دەچیتە سەر ئەو کورسییە و وتار دەدەی و ئەمر دەکەی کە هەتا ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ دەبێ ئەنجومەن بڕیار لەسەر داواکانی ئێمە بدات."
وردەکاریی وتارەکەم پێ گوت و ئاماژەم کرد:" بێت و یەک شتت لەبیر بچێ، خۆم دێمە سەر کورسییەکە و ئەوی دیکەی دەڵێم." شوتیم وەبن هەنگڵی دا و ئەو کەرەش فریوی خوارد.
هێشتا نەگەیشتبووە بەشەر سەرەکییەکەی وتارەکەی کە بڵێ: "ئەمە دەرگای تەلاری ئەنجومەن دادەخەین و ناهێڵین مامۆستاکان بێنە دەرێ تا داواکارییەکانمان جێبەجێ نەکرێن." کە من و مریدەکانم دەرگای تەلارەکەمان داخست و قفڵمان لێ دا و تەلەفۆنەکانمان هەڵبڕی و هەموو مامۆستا بەناوبانگەکان و سەرۆکی کۆلێژەکان و تەنانەت ئەوانەی پشتیوانییان لە قوتابییەکانیش دەکرد، بوونە دیل و بەندیی ئێمە.

ئەو خەبەرە وەک برووسکە بە هەموو شاردا گەڕا، یەکەم کەس کە لە زانکۆ رای کردە دەرێ، ئاهاری بوو. نەمزانی چووە کوێ. ببڕای ببڕ بەلای زانکۆدا نەهاتەوە. بەڵام ئەو رووداوە ئەوەندەی دیکەی لک و پۆ پێوە خرا و زۆر سەیر و سەمەرە بڵاو بۆوە، کە مامۆستا و قوتابی لەگژ یەکتر رۆچوون و تەلاری ئەنجومەن بەسەر مامۆستاکاندا کاول کراوە. چەندین کەس زامار بوون. دوو سێ سەعاتێکی نەخایاند کە زاوا زێڕینە وەک نێچیری بریندار خۆی گەیاندە من، کە تا زووە لە زانکۆ بڕۆمە دەرێ.

چوار سەعات، کامیۆنی پڕ لە سەرباز شەقامەکانی دەوری زانکۆیان گەمارۆ دا و گرمە و هاڕەی تانک، هەمووانی تۆقاند. ئێترنەیاندەهێشت کەس بچێتە نێو زانکۆوە. ئەو چەند کەسەی بەربەرەکانێیان دەکرد، گرتیانن و بردیاننە زیندان. سەعات شەش سەربازەکان خۆیان بە نێو باغی زانکۆدا کرد  و دەرگای ئەنجومەنیان شکاند و مامۆستاکانیان ئازاد کرد. هەتا ئەو دەمە، ئەوە گەورەترین شاکاری من ژیانی سیاسیی من بوو لە ساواکدا. باش بوو خوێن لە لووتی کەس نەهات و سەرباز و پاسەوان رێیان بۆ نێو زانکۆ کرایەوە و من پشکووتم.

هەر ئەو شەوە لە ترۆمبێلێکدا چاوم بە دکتۆر بێژەن کەوت، چیی نەمابوو لە ئامێزم بگرێ. خۆی لە پشت سوکان دانیشتبوو و کێشامییە نێو ترۆمبێلەکەوە و توند باسکی گوشیم.

"کوڕە بوویەتە سەلکە بزووت."

"خزمەتکارتم."

"کارێکی باشت کرد. چەند رۆژێک لە هیچ کوێ خۆت دەرمەخە. ئەگەر دەتوانی لە تاران بڕۆ دەرێ." ویستم راپۆرتی ئەو بەدفەڕانەی بدەمێ کە دیار بوو هەمووان کۆمۆنیست بوون، بەتایبەتی باسی ئاهاری... قسەی پێ بڕیم "راپۆرتەکە ئەم بەیانییە بەتێر و تەسەلی گەیوەتە دەستمان، ئاگاداری هەموو وردەکارییەکانین. کارت بەو شتانەوە نەبێ. چاوەڕێ بە تا بانگت دەکەینەوە. دەبێ رێزت لێ بگیردرێ."

دەستێکی لە پشتم دا و دایبەزاندم. منیش شاد و بەکەیف چوومەوە ماڵێ. هەندێ چەرەزات و شیرینی و شوکولاتم بۆ خوشکەکەم کڕی کە پاش زەماوەندەکەی لێم زویر ببوو. چوومەوە ماڵێ، لەگەڵ روقیە ئاشت بوومەوە، بەڵام نێوانمان قەت وەک ئەودەمی پێش شووکردنەکەی لێ نەهاتەوە. ئێمە یەکترمان زۆر خۆش دەویست. نازانم هەر لە منداڵییەوە لەسەر چی دەمبەدەمەمان هەبوو. پێموایە خەتای من بوو. من چوار ساڵ لەو گەورەتر بووم و ئێستاش خۆم بە گەورەی ماڵێ دەزانی و چونکە کاسبکاری ماڵێ بووم، چاوەڕێم دەکرد خوشکەکەم لە قسەم دەرنەچێ، هەر نەبێ لە کارەکانیدا تەگبیر و رای بە من بێ. کە بیستمەوە دووگیان بووە و منداڵەکەی لەبار بردووە، هیچ وەڕووی خۆمم نەهێنا و روقیە کە دەیزانی من لە هەموو شتێک ئاگادارم، ئیتر دەیزانی من چ پیاوێکی بێغیرەتم کە لەو هەڵەیە خۆش بووم. ئەگەر تووشی یەک بوایەین و پێک هەڵپڕژابایین و لێکیشمان دابایە، دیسان خوشک و برایەتییەکمان هەر هەبوو. نازانم پێ دەچوو سۆسەی کردبێ کە من خەریکی چیم. لە بری ئەوە دایکم پێداگر بوو ژنم بۆ بێنێ، دڵخۆشی و شیرینی و چەرەزاتەکەی منی بە خۆشفەڕی لێک داوە و پێی وابوو ئێستا ئیتر رازیم و ئەو دەتوانێ قۆڵی هەڵماڵێ و ژنم بۆ بێنێ.

کچە ژیکەڵەکەی جیرانمانی هەڵنابوو و من جاروبارە لە بەردەرگای ماڵێ یان کە بە کۆڵانێدا رادەبردم دەمدی چۆن خۆیم بۆ بادەدا و لەنجە و لارم بۆ دەکا. خۆ بێت و ئەو رووداوە تازەیە نەقەومابایە، لەوانەبوو لە بیستوپێنج ساڵیدا خێزاندار بم.

شەوێکیان نزیکی سەعات دە، ئەودەمانەی کە زیاتر لە ماڵەوە بووم و وای دانێ دەرسم دەخوێند، کابرایەک بانگی کردم، روقیە چووە بەر دەرگا و ئەو کەسەی لە تاریکاییەکەدا دەموچاوی دیار نەبوو، هەر ئەوەندەی گوت:
"جەنابی دکتۆر بیژەن بانگت دەکا."
ترسم ڕێنیشت. ئەو کارانە نهێنیکاریی ئاواشی هەیە. غروورێک هەڵیگرتم. یەکێک بە ترۆمبێل لە شار بردمییە دەرێ و بردمییە ی ەکێک لە گەڕەکانی شمیران. لەوێش دەرگای بینایەکی تازەدروستکراو کرایەوە. یەکێکی دیکە وەریگرتم و وەپێشم کەوت بۆ هۆڵێکی زۆر گەورە و خۆش.
ژوورەکە زۆر رووناک بوو. مێزێکی گەورە لەو سەری ژوورەکەوە بوو. کۆمەڵێک مۆبڵ سەرنجیان راکێشام. مێزەکە گوڵدانێکی لەسەر بوو و دوو ئەفسەری پلەبەرزیش لە دەوری دانیشتبوون و بە ئینگلیزی پێکەوە قسەیان دەکرد. دەرگایەک کراوە و یەکێکی گورجوگۆڵ وەژور کەوت و ئەفسەرەکان لەبەری هەستان. سێی دیکەشیان هاتنە گەڵ، کە پێم وایە ئەوانیش بیانی بوون... یەکەمیان هاتە لای من. تۆقەی لەگەڵ کردم و من کڕنۆشێکم بۆ کرد. گوتی: "ئەوە... یارۆیە. ئەو بەڕێزانە پیرۆزباییت لێ دەکەن و هەمووان هیوادارن هەروا خزمەتکار و شاپەرست بمێنیتەوە. دەستخۆشیت پێ دەڵێین بۆ هەوڵی نیشتمانپەروەرانەت و لەو بوارەوە دەمەویست وەک خەڵاتێک، کارێکی باشترت بدەمێ بۆ ئەوەی بکرێ زیاتر لە ئازایەتی و کۆڵنەدەرییەکەت بە قازانجی نیشتمان کەڵک وەرگرین. لەو بوارەوە جەنابی دکتۆر بیژەن قسەت لەگەڵ دەکا."
دوو ئەفسەرە پلەبەرزەکە و ئەوانی دیکەش راوەستابوون و سەریان بۆ دەلەقاند. ئینجا لەسەری رۆیشت:"ئازایەتی و بڕیاردانی تۆ بە لایەک، بەڵام تۆ دەبێ لێوەشاوەتر بی و پتر بخوێنی و بوار و قۆناغە جۆراوجۆرەکان بناسی و لەوانەیە وای بە باش بزانین ماوەیەک بۆ دەوڵەمەندکردنی زانیارییەکان سەفەری دەرەوە بکەی و پڕتر بگەڕێیتەوە نیشتمانەکەت."
دەستی هێنا دەستم بگرێ. عەرزیم کرد:"هەر ئەمرێکی بیفەرموون لەسەر چاومی دادەنیم." ئەوانی دیکە بەتایبەتی ئەو دوانەی لەگەڵی هاتبوون و قژکاڵ و بە رواڵەت بیانی بوون، تۆقەیان لەگەڵ کردم و ئەوجار دوو ئەفسەرە پلەبەرزەکە دەستومشتاقیان لەگەڵ کردم و بەڕێیان کردم. هێشتا وام لێ نەهاتبوو بە نیشانەی سەرشانیان ڕا بزانم چ پلەیەکیان هەیە. پێم وایە ئەفسەرە گورج و گۆڵە کە بەختیار بوو.
ئەو پیاوەی لە تاریکایی کۆڵانەکەوە منی هێنابووە ئەم بینایە، لە پشت دەرگا راوەستابوو. سواری ترۆمبێلەکەی کردم و گەیاندمییەوە ماڵێ.
دایکم و روقیە زراویان چووبوو و لە ماڵەوە چاوەڕوانم بوون. درۆم لەگەڵ کردن و گوتم: لە زەماوەندی برادەرێکم بووم و پێشتر بانگهێشتی کردبووم و نەیدۆزیبوومەوە. دایکە دڵسافەکەم بڕوای کرد. بەڵام روقیە گومانەکەی خەستتر بۆوە و زیاتر خۆی لێ دوور خستمەوە.
ئەوە خۆشترین سەعاتی ژیانی من بوو. بۆ نەگبەتی، ئەو دەموساتە قەت لە ژیانمدا نەبۆوە بە دوو. رووداوگەلی جۆراوجۆر و بە رێکەوت بووە هۆی ئەوەی من لەو پەیژەیەوە سەر کەوم. دیارە ملپێوەنانی خۆشم بوو. بەڵام بەخت و شانسەکەش هێنای. لە ناخی دڵمەوە لەگەڵیان نەبووم. هەرچی پتر دەچوومە بنچ و بناوانی مەسەلەکەوە، دەمدی بە گیان و دڵ لەگەڵیان نیم. ئەو دکتۆر بیژەنە، دکتۆرێکی درۆیین بوو. شام خۆش دەویست و ئەوم بە رووگەی دنیا دەزانی. وردە وردە هەستم

کرد خەڵک لێم دەکشێنەوە. دەچوومە هەر کۆڕێک، لە قاوەخانە و سەری کۆڵانێ، ئەودەمەی دووکاندار و خەڵکم دەدواند، وردە وردە کەسم بە دەورەوە نەدەما و ئەوان ساردوسڕ دەیاندواندم. دەروجیران ئیرەییان پێ دەبردم، کە لەپڕێکدا ئەو کەسەی هیچ کەس نەیدەناسی، لە دەزگەیەکی حکوومیدا کارم پەیدا کردووە و خەریکم نانی ئەوان دەبڕم. هەندێکیشیان کلکەسووتەیان بۆ دەکردم. ڕەجەب بێبەقا کە چاوێکی خێل بوو و سینیی دەگێڕا، هەر کاتێ دەیدیتم دەستی دەکرد بە ماستاوچێتی. بیستبوویەوە دەستم دەگاتە دەمی خۆم و پێی وابوو دەستم دەڕوا و چاوەڕوان بوو باڵێکی بەسەردا بکێشم. "ئاغا، ئێمە بەنان و نمەکی جەنابت پەروەردە بووین. چ خزمەتێکمان لە دەست بێ، بە گیان و دڵ ئامادەین."
مەشەدی ڕازیی ئەوسەری کۆڵانمان کە دووکانی هەبوو، هەر بە بەر دووکانەکەیدا ڕابردبایەم دەیگوت:"ئەوە کەی زەماوەندەکەی ئاغا بکەین؟ "کچەکەی چواردەساڵان بوو و بەتەما بوو بمکاتە زاوای خۆی.  هەر کەسە و بە شێوەیەک خۆی دەنواند. لە قەڵافەت و هەڵسوکەوتیانەوە دەتزانی ئیرەیی دەبەن یان تەما و هیوایەکیان پێتە.

چەند مانگان کارو پیشەی من هەڵدانەوەی پەروەندە ئەرشیڤکراوەکانی بەشی خوێندکارانی زانکۆ بوو. هەڵبەت من بەڵێنم دابوو کوێر و کەڕ و لاڵ بم. سەرم لە هیچ زانیارییەک سووڕ نەمێنێ و خوای نەخواستە هیچ شتێک بە هیچ کەس نەڵێم. مەبەست ئەوە بوو من وێڕای خوێندنەوەی پەروەندە ئەرشیڤکراوەکان فێری شێوەی کارکردن و گومانلێکراوان و لێپێچینەوە و هەڕەشە و تەماحوەبەرنان و تەمبێ و سزادان ببم. شتی وام دەدی قەت ئەقڵم نەیدەبڕی. لە رووی ڕاپۆرت و وتە و گێڕانەوەی قوتابییەکانەوە کە بەشێکیان بە گوێی خۆم بیستمن، دەمتوانی هەر کەسە و بەناوی خوازراو و ڕەمزی لە پەروەندەکاندا دەسنیشان بکەم و بیناسمەوە. زەندەقم چوو کە دڵنیا بوومەوە خەڵکی دیکەی وەک خۆم لە زانکۆدا گوێقوڵاخ بوونە و جا چەندەش بە وردی چالاکییەکانی خۆمیان کردبووە ڕاپۆرت. وەختێک دەقاودەق قسەکانی خۆمم لە زمانی کابرایەکەوە بەناوێکی خوازراو خوێندەوە، کە "ئەگەر یەک خاڵت لەبیر بچێ، خۆم دیمە سەر کورسییەکە و باقیەکەی دەڵێم." ئیتر گومانم نەما ئاهارییە شۆڕشگێڕەکە یەکێکە لە سمدارەکان و ئەو پیلانەی قەرار بوو ئەو بیخاتە ڕێ، من ڕامپەڕاندووە. من ئیتر ئاهاریم نەدیتەوە. ئەویان بەڕێی زانکۆی شیراز کرد و وا دانرا لەوێ قوتابییەکان دنە بدا و دووبەرەکی بنێتەوە. ئیترم نەمدیتەوە تا چەند ساڵ دواتر لە حیزبدا تووشی یەک بووینەوە، دیارە وەڕوویم نەدا کە چ کارەیە و بە چ ناو و ژمارەیەک لە ئاژانسدا ئەرکی خۆی ڕادەپەڕێنێ. دوو قڕانییەکەم کەوت کە دەبێ زۆر وریا بم و من تەنیا نیم و ئەوانی دیکەش چاویان بەسەرمەوەیە. زۆر جار ئاوا سەرم سووڕ دەما و کردمنە پەند و ئەزموون و پوختەتر بووم.
بەڵام ئەوەی  تۆقاندمی و زۆریشی تووڕە کردم و خەریک بوو ورەم پێ بەربدا و چیی نەمابوو وەکێوان بکەوم و واز لە هەموو شتێک بێنم، ئەوە بوو کە پەروەندەکانی گەڕەکەکەی خۆمانم خوێندەوە. کێ لە ڕیزی گومانلێکراواندا بوون. ئەقڵم لەسەریدا نەما. یەکێک سکاڵای کردبوو کە بەڵێ نانەوا هەویری ترشاوی کردووەتە نان و سیخوڕەکانی گەڕەکیش ئەوەیان وەک دژایەتیی شا لێک دابۆوە. یەکێکی دیکە کوڕەکەی ئیمتیحانی کۆنکوری دابوو و دەرنەچووبوو و لە جێیەک گوتبووی:"بچێتە هەر کوێ، ڕاسپێراوەکان دەردەچن و کەس ئاگای لە فەقیر و هەژار نییە."

سێیەم کەس لە نامەیەک دا بۆ برادەرەکەی نووسیبووی، لە گیلان تۆراخ نەکرێ، چونکە لەوێ گرانە و زیادەکەی دەچێتە گیرفانی کارمەندانی دەوڵەتەوە. راپۆرتچییەکە "کارمەندانی دەوڵەت"ی بە شا و دەربار و خزم و کەسەکەی شا لێک دابۆوە. یەکێکی دیکە داوای کردبوو لەگەڵ ئەم گەشتیارە رووسییە سەفەرێکی ئەورووپا بکا. ئەو داماوەیان بانگ کردبووە ئاژانس کە داخوا لە مۆسکۆ دەیەوێ چاوی بە کێ بکەوێ و لە کەیەوە کۆمۆنیستە و ئەو ژنە داماوە کە ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو، هەر وازی لە خێروبێری سەفەرەکەی هێنا و ئیتر لە کەربەلا و نەجەف بترازێ بۆ هیچ کوێ نەچوو.
خۆ ئەگەر ویستبایەم لەو نموونانە باس بکەم، دەبوایە سەدان لاپەڕە ڕەش بکە          مەوە و هیچ سوودێکیشم پێ نەدەگەیشت. من دەبێ خزمەتێکی باشی ئەو بێچاوڕووانە بکەم. ئەو دەمە تەزووم پێدا هات، کە سەیرم کرد لەگەڵ خەڵکێکی گومانلێکراو ناوی ر وقیەش دێ. خوشکەکەم کە ئەودەم لە فرۆشگەی فێردەوسی کاری دەکرد، فرۆشەر نەبوو، بەڵام چونکە کوێرەخوێندەوارییەکی هەبوو، کردبوویانە سەرپەرشتیاری کۆمەڵێک فرۆشەر.
تاوانەکەی یان باشتر بڵێم تۆمەتەکەی ئەوە بوو بە پێچەوانەی دایکی و خزم و کەسەکەی دیکەی، ئەو ناچێتە مزگەوت و "رەوزەخوێنی" و شازدەعەبدولعەزیم و ئیبنی بابووبە، بە پێچەوانەوە ئەویان لە سینەما و شانۆ دیتووە. بەتایبەتی لە بنکەیەکی حیزبی تووشی یەکێک لە فرۆشەرەکان ببوو.
ناوی ئەو گەنجۆیە فەرزان بوو و لە پەروەندەکەیدا ئاماژە کرابوو کە دەبێ زۆر بەتوندی چاودێری بکرێ. نەموێرا هیچ شتێک لەو بوارەوە بە خوشکەکەم بڵێم. دەمزانی کە ئەو کچە هەر بۆ دڵی خۆی دەچێ و ئیتر وەک کچە مۆدێرنەکان جلوبەرگ لەبەر دەکا و ئەوەندەی دەرەقەت دێ، دیارە بە تەرپۆش لەقەڵەم دراوە.
شەوێکیان لە ماڵێ و لە کن دایکم لە روقیەم پرسی:
"تۆم لە شەقام لەگەڵ ئاغای فەرزان دی. باشی دەناسی؟"
"بەتۆ چی؟ بۆ تۆ سیخوڕی منی؟"
دایکم بەتوانجەوە گوتی:"ئاخر براگەورەتە. لە جێی بابتە. یانی مافی ئەوەی نییە لێت بپرسێ هاموشۆت لەگەڵ کێیە؟ خوشکم بە ئەدەبەوە بەڵام کەللەڕەقانە وەڵامی داوە:
"دایە گیان بۆ من لەوم پرسیوە چکارەیە و مانگێ سێسەد تمەن لەکوێ وەردەگرێ بۆ ماڵێی خەرج دەکا؟ دەڵێ بازرگانی دەکا، ئەی بۆ ئێمە قەت کاڵایەکیمان نەدیتووە؟"
دیتم قوون بدەمە سەر دەرپێکەم باشترە. ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا.

بەڵام خۆم بڕیارم دا سۆراغی فەرزان بگرم. لە پەروەندەکاندا شتێکی سەرنجراکێشم نەدۆزییەوە. کەوتە بیرم کە لە ح یزبدا وەپێوشوێنی بکەوم. بەشکم سەرەداوێکم دەست بکەوێ. بەڵام پەروەندەی حیزبییەکان کە قە  فەزەیەکی پڕ کردبوو، لەبەر دەستی من نەبوو. بیرم لەوە کردەوە داوا لە بەرپرسەکەم بکەم رێگەم بدا بیانخوێنمەوە. بەرپرسی راستەوخۆی من دکتۆر بیژەن بوو. دیارە زۆر زوو لێم روون بۆوە ئەو ناوە، ناوی خۆی نییە. نە ناوەکەی راستە و نە دکتۆرییەکەشی. ئەو خۆشی دەویستم و تا دەیدی من زێدەڕۆیی دەکەم، ئامۆژگاریی دەکردم. کارێکی وا نەکەی گومان لە خۆشت

بکەن. ئەو بیرۆکەیەم لەگەڵ باس کرد. گوتم: "لە پەروەندەکاندا ناوی روقیەی خوشکم هاتووە و، حەز دەکەم بزانم ئەو سەرەداوە دەگاتەوە کوێ." وەڵامی دامەوە:
"خەمت نەبێ، زۆر باش لە روقیەمان کۆڵیوەتەوە. لە نێو هیچ تاقم و گرووپێکدا نییە."
گوتم: "لە فرۆشگا لەگەڵ فەرزان ناوێک یەکتریان ناسیوە و دەڵێن ئەو حیزبییە."
جوابی دامەوە: "بوو، ئیتر ناچێتەوە حیزب. یەک دوو جار لە بنکەیەک بەشدار بوو و ئیتر نەچۆوە."
"چۆنت پێ باشە با وابێ."
"چەند حەفتەیەکی دیکە راوەستە، با بزانین چ دەبێ."
پاش چەند حەفتەیەک جەنابی دکتۆر بیژەن هەواڵێکی خۆشی بۆ هێنام.
"خۆت بچۆ نێو حیزبەوە. پاش ماوەیەک، پەروەندەکانیشت دەخەینە بەردەست."
من کە قوتابی بووم و هەر بەراستی دەرسیشم دەخوێند و ئەو کتێبانەم دەخوێندەوە کە مامۆستاکان پێشنیاریان دەکرد. لە زۆربەی شتەکان تێنەدەگەیشتم، بەڵام سوور بووم فێر بم. چوونە نێو تاقمی خوێندکارانی حیزبی، کارێکی ئەستەم نەبوو. چەند حەفتەیەکی پێ چوو و پێ و قەدەمم بۆ نێو یانەی حیزب کرایەوە و خۆم بوومە جێگری سەرۆکی بنکەکە و پارووم لە رۆنی کەوت و ئیتر پاشقولدانی ئەم و ئەو وەک ئاوخواردنەوە وابوو. یەک ساڵ لە بنکەکان و کۆمیتەی ئەیالەتی و کۆمسیۆنی پشکنیندا خولامەوە و شتێکی وام دەست نەکەوت بڵێی ئۆخەی. ئەوانە شتێکی وایان نەبوو بەکار بێ. جارێکیان بۆ راپەڕاندنی ئەرکێک ناردیانمە شیراز. تووشی ئاهاری بووم کە لەوێ متمانەپێکراو و خۆشەویست بوو. وەک قەتم نەناسیبێ، هەر وەڕووی خۆم نەهێنا. لەوێ دڵنیا بوومەوە کە هێشتا لە پلەی نزمە و قۆناغی تاقیکردنەوەی نەبڕیوە بۆ ئەوەی پلەیەکی بەرزتر وەرگرێ. ئیتر لێم روون بۆوە کە لە رووداوەکەی زانکۆ و زیندانیکردنی مامۆستاکاندا من وەپێشی کەوتووم و پاشقولم داوە. لەگەڵ ئاهاری نێوانمم خۆش کرد و وام خۆ پێ ناساند کە زۆر بەکەفوکوڵم و خۆم لێ نزیک کردەوە و لێم دەرکێشا کە شیرازی ئاوێکی وا لێ نییە تێیدا مەلە بکەی و حەز دەکا بچێتەوە پایتەخت. لەوێ هەزار رێگە و کەرەستەی پێشکەوتن هەیە. بەڵام لێرە لە شیراز شەق هەڵێنیەوە، وەقوونی هەزارانی وەک ئەو دەکەوێ. بۆ ئەوەی جوان و زەریف قایلی بکەم، بەڵێنم دایە لە تاران کارێکی وای بۆ بکەم، کە لە نووسینگەی رۆژنامە یان ئەنجومەندا داوای بکەن کارێکی گرینگتری پێ بسپێرن. دەهۆکەم گرتی.
ئاهاری کە هەم قوتابی بوو و هەمیش ژمێریاری کۆمیتەی ئەیالەتی لە شیراز، لە نێو چەند دۆست و هاورێیەکی حیزبیدا ناو و پێگەیەکی باشی هەبوو و بە کەسێکی دەسپاک ناسرابوو و هیچ کام شکیشیان بۆ ئەوە نەدەچوو بایی چەندەیە.
ئەو دەمە نامەردییەکەیم لێ روون بۆوە کە لەو راپۆرتانەدا وا لە شیرازەوە ناردبوونی، خیانەتی لەو دۆستە هاوکارانەشی کردبوو.
چەند مانگ دواتر، حیزب لە سۆنگەی راستگۆیی و ئەمانەتدارییەکەی ئاهارییەوە بانگی کردەوە تاران و بەڕێوەبەریی یەکێک لە رۆژنامە نیوە حیزبییەکانی پێ سپارد و هاوکات بوو بە ئەندامی کۆمسیۆنی ماڵی. ژیانی بەو دوو مووچەی مانگانەیە دابین دەبوو کە لە حیزبی وەردەگرت. بەڵام بەشی بەرزەفڕییەکانی ئەوی نەدەکرد. ئەوەی ئێستا نووسیم و دەینووسم، لە رووی پەروەندە و نووسراوەکانی ئاژانسەوەیە.

که لە شیراز گەڕامەوە، دکتۆر بیژەن یەکەم پرسیارێکی لێی کردم، ئەوە بوو:
- "ئاهاریت پێ چۆن بوو؟"
گوتم: "دایکی شەیتانی گاوە."
پەروەندەکەی لە چەکمەجەی مێزەکە هێنا دەرێ و دای بە دەستم.
من ئیتر نەمدیتەوە هەتا لە ڕۆژنامەدا خوێندمەوە کە لە پاریسە و خەریکە دکتۆراکەی وەردەگرێ.
باشە چیی کرد کە توانیی خۆی بگەیەنێتە پاریس؟ من چەند جاران ڕێم کەوتە نووسینگەی ئاژانس لە ژنێڤ، لەو شوێنە هەرچی بەڵگەی پێوەندیدار بە ڕابردووی قوتابییەکان هەبوو، کۆ کرابوونەوە.
ئاهاری ئەوەندەی دەرکەودەرک کرد، هەتا پارووی لە ڕۆنێ کەوت. لە کۆمسیۆنی ماڵیی حیزب باس باسی تەنگژەی دارایی بوو. شارەکان نەک یارمەتییەکی ناوەندیان نەدەدا، زۆربەیان بۆ بەڕێوەبردن و چاپی کاغەزی بانگەشە هەر داواشیان دەکرد. چەندین جار باسی ئەو هەقدەستە بوو کە دەدرایە بانکەکان. سەرکردەی حیزب دژی ئەو کارانە بوون و کاتەکەیان پێ گونجاو نەبوو. دوایی پێشنیارێکی ماڵی لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا کە چەند کەسێکی کۆمیتەی ماڵی تێیدا بەشدار بوون، خرایە ڕوو کە هەموو ئەندامانی حیزب بە مەبەستی چارەسەری تەنگژەی ماڵیی حیزب، هەقی ڕۆژێکی خۆیان بخەنە سندووقەکەی حزبەوە. لە تاران دەوراندەوری حەوشەی یانە، لە هەرکام لە ژوورەکاندا سندووقێکی کارتۆنیان دانا بۆ ئەوەی هەر کەسە و چەندی لەدەست دێ، تێی بخا. ئەو یارمەتی کۆکردنەوەیە چەند ڕۆژێکی خایاند و گوتیان چەند دە هەزار تمەنێک کۆ کراوەتەوە. ڕۆژی یەکەم سەرکردەکان و سەرگەورەکان دراوی خۆیان لە سندووقەکان خست و لێشاوی خەڵکەکەیان بە سەرکەوتنێکی گەورە بۆ حیزب لەقەڵەم دا. لە لایەن کۆمسیۆنی ماڵیەوە دوو کەس کە یەکیان ئاهاری بوون، ڕاسپێردران چاویان بەسەر ئەو پارەیەوە بێ کە کۆ کرابۆوە. هەموو شەوێ دەیانکردە نێو گاسندووقەکەی حیزبەوە کە کلیلەکەی بەو کەسە بوو وا کۆمیتەی ناوەندی کردبووی بە لێپرسراوی کۆمیسیۆنی ماڵی. تا کۆتایی کە ئاخرییەکەشی ڕوون نەبۆوە کلیلی گاسندووقەکە چۆن کەوتە دەستی ئاهاری و هاودەستەکەی و چیی کۆ کرابۆوە ڕایانماڵی. ئیتر کەس لە حیزبدا چاوی پێی نەکەوتەوە.
ئەو نهێنییە لە پەروەندەکانی ئاژانسدا هەرگیز ڕوون نەبۆوە. لە پەروەندەدا ئاماژەیەک هەیە کە پاش ئەو تاڵانە، ڕێگەی پێ درا سەفەری ئەورووپا بکا. لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە کە ئاهاری خۆی گوتوویەتی، پارەی حیزبی بۆیە دزیوە پێی بچێتە ئەورووپا و دەرس بخوێنێ و دکتۆرای پێ وەرگرێ. باقی چارەنووسەکەی لە شوێنێکی دیکەدا دەگێڕمەوە چونکە دەبینم پاش شۆڕشیش ئەوە دیسان کلکی لە نەڕەی پشتی ناوەتەوە و دیسان باسی شاپەرستنی و نیشتمانپەروەری دەکاتەوە.
هەوڵی من بە گشتی لە حیزبدا زیاتر بۆ ئەوە بوو نەهێڵم ڕوقیە چارەڕەش بێ. لە حیزبدا هیچ ئاسەوارێکی فەرزانم دەست نەکەوت. گوتیان چووەتە کۆلێژی سەربازی و ئیتر توخنی سیاسەت ناکەوتەوە. وێڕای گەڕان و وەشوێنکەوتنی فەرزان، سەمەرەیەک بەناوی "شێخۆ" سەرنجی ڕاکێشام

کە دەستی سەدانی وەک مەیتەرەکەی نەسیمی عەیاری لە پشتەوەڕا بەستبوو و هەر چرکەساتێک ڕەنگێکی گرتبوو. ئەو بنیادەمە تەنانەت سەرۆکەکانی ئاژانسیشی دەستەمۆ کردبوو. جارێ مەندیل بەسەر بوو و جارێک ساکسوکی، هەم "سەرمایە"ی مارکسی بە عەرەبی لە بن عەباکەیدا پێ بوو و هەمیش قورئانێکی بچووکی چاپی چێکوسلۆڤاکیای لە باسکی دەبەست. هەم نوێژی دەکرد و هەمیش قاچاخچێتی. هەر کاتێکی دەهاتە حیزب، شەوکڵاوێکی لەسەر دەنا و عەبایەکی لەخۆی وەردەپێچا و لە گۆشەیەک کرووشمەی دەکرد. قەت نەببوو بە ئەندامی حیزب و نەشببوو. بەڵام وای دەنواند کە هەم ساتوسەودایەکی لەگەڵ سەرکردەکانی حیزب هەیە و هەمیش لەگەڵ دەسەڵاتداران. هەر بە رد ئەبە بزنییەکەیڕا کە هەم بە جلوبەرگی مەلایانەوە و هەمیش بە چاکەت و چانتۆڵ و بۆینباغەوە بە چەناگەیەوە شۆڕ ببۆوە، دەکرا بیناسیتەوە.

چونکە فەرزانی دەناسی، سەرنجی منی ڕاکێشا. دەمویست بزانم ئاخۆ پێوەندییەک لە نێوان ڕوقیە و فەرزان و ئەو شیخۆیەدا هەیە یان نا.

شەوێکیان ڕوقیە لە کن دایکم لێی پرسیم:

"تۆش بوویەتە حیزبی؟ چەند زەبر دەوەشێنی؟"

نەمدەویست سەر بکەمە سەری، بەڵام حەزم لێ بوو قسەی لە زمانی دەربکێشم. هەر لە و پرسیارەیەوە دیار بوو کە سەری بە جێیەکەوەیە. گوتم:

"حیزب چییە؟ تۆش لێم بوویەتە بەشەر و پرسیاری ماقووڵان دەکەی؟"

"زۆر لێزانی. لاسایی کەو دەکەیەوە. سەرت لە بن بەفرێ دەنێی و کەس نابینی و پێت وایە هیچ باسێک نییە."

"مەبەست؟"

"هەر ئەوە."

"فەرزان ئەو قسانەی فێر کردووی؟"

"لە خۆڕا فەرزان تێکەڵی شتەکان مەکە. ئەو چەند ڕۆژێک لەگەڵتان بوو. کە زانیی بە چەپ و ڕاستدا هەر دەبێ نۆکەری ڕووسەکان بی، وازی هێنا و ڕۆیشت."

"ئەی شێخۆ فێری کردووی؟"

"شێخۆ کێیە؟"

دەرکەوت نایناسێ و تەنانەت ناوەکەیشی نەبیستووە. بەڵام بەرگرییەکەی لە فەرزان نیشانەی ئەوە بوو کە ئەگەر سڕ و نهێنییەکی لەگەڵی نییە، لە خۆوەش نییە. دایکم کە تا ئەودەم لە گۆشەیەکەوە لە بەر سەماوەرەکە دانیشتبوو و نزای دەکرد و لۆبیای چا دەکرد و وای دەنواند ئاگای لە قسەکانمان نییە، گوتی:

"ڕوقیە دەیەوێ لەم ڕۆژانەدا ئاغای فەرزان بۆ نانی نیوەڕۆیە بانگ بکا، با ڕۆژێکی وا بێ تۆش لێرە بی."

ئەوەم قۆستەوە و بە ڕووگەشیەوە گوتم:

"هەر ڕۆژێکی دەیەوێ با بێ. بەڵام دوو سێ ڕۆژ پێشتر ئاگادارم بکەنەوە بۆ ئەوەی کاتم هەبێ."

ڕوقیە دەستەواژەی "دوو زەبر"ی گوتەوە و ئەوەش خستمییە فکرەوە. نەکا ناوبانگێکی وام بۆ بڵاو کرابێتەوە. دەقاودەق ئەو مشتومڕەم بۆ دکتۆر بیژەن گێڕایەوە. گوتی: "دەبێ پتر ئاگات لەخۆت بێ و

زیانێک به کارەکەت نەگەیەنی. جارێ له حیزبدا هیچ باسێک نییه. واز لەوێ بێنه. ئەوه بهێڵەوه بۆ ڕۆژی خۆی. هەرچۆنێک بێ ئێستا ئەندامێکی جێ متمانەی حیزبی. دەرس و دەور بکه به بیانوو و خەریکی کاری خۆت به."
گوتم: "دەمەوێ بزانم شێخۆ چکارەیه و چەنده دەستی له چارەنووسی ڕوقیەی خوشکمدایه؟"
تاوێک بیری کردەوه. نێوچاوانی تۆزێک گرژ کرد و گوتی:
"کاری ئێمه ئەوەیه له چەپییەکان بکۆڵینەوه و لەوانەی پێوەندییان به ڕووسەکانەوه هەیه. ئێمه دەبێ ئاگامان له خاوەنشکۆ و دەوروبەرییەکانی بێ. باقییەکەی پێوەندیی به ئێمەوه نییه. ئەگەر بمانەوێ خەریکی کاروباری بەردەستەکانی بەریتانیا و ئەمریکا بین، دەبێ نیوەی زیاتری خەڵکی نێو دامودەزگای حکوومەت بخەینه ژێر چاودێرییەوه. کێشەی شێخۆ ئەوەیه که ئێمه هێشتا شوێن پێی ئەومان له جێیەک نەدۆزیوەتەوه. ئەو کابرایه یەکێکه له تەرەسه دەرەجه یەکەکان، له ناڵیش دەدا و له بزماریش. تەنانەت شوێن پێی تا دەرباریش چووه. هەر جارێکی هاتووه کلکی به تەڵەوه بێ، یەکێک له قوژبنێکەوه هاتووه و دەستی گرتووه و له قوڵکەکەی دەرهێناوەتەوه. کاری ئەو هیچ پێوەندییەکی به ڕوقیەوه نییه. بەڵام بۆ ئەوەی لەکڵ بێیه دەرێ و لاڕێ نەبی، ئیجازه وەردەگرم که پەروەندەی شێخۆ بدەنه تۆ. بەڵام ئەوەش بزانه که ئەو کاره هیچ سوودێکی بۆ ئێمه نییه. پێدەچێ ناوەندێک هەبێ ڕێنوێنیی بکا. ئێمه تا ئەو جێیه وەشوێن پێی دەکەوین که پێوەندیی بەخۆمانەوه هەیه."
له کاکڵی مەسەلەکه تێگەیشتم و دڵنیا بوومەوه که فەرزان و شێخۆ به ڕێکەوت یەکتریان ناسیوه.
میوانداریيەکەی ڕوقیەش له فەرزان هیچی لێ شین نەبۆوه. فەرزان که خەریک بوو له ئیدارەی پۆلیس دەبووه ملازم، کابرایەکی پوخته و تێگەیشتوو بوو. کەڵەگەت و بەژن زراڤ و ژیر و لەسەرخۆ. زیاتر گوێی دەگرت و کەمتر قسەی دەکرد. لەوه نەدەترسا سەیری نێو چاوم بکا. بێ پێچوپەنا وەڵامی پرسیارەکانی منی دەدا ؛ هه یان ڕێک دەیگوت: نەخێر نازانم. ئەگەر پێچوپەنایەکی هەبووایه، له من زیرەکتر بوو و کلکی به تەڵەوه نەدەبوو. که باسی شێخۆم هێنایه گۆڕێ، یەکەوڕێ گوتی:
"پیاوی بەریتانییەکانه و من کارم بەو جۆره کەسانەوه نییه."
شتێکی گرینگ که دەستم کەوت هەر ئەوه بوو، که زانیارییەکانی ڕوقیه لەسەر "دوو زەبر وەشاندن"ـەکەی من له سەرچاوەیەکی دیکەوه بوو نەک لەو ڕێگەیەوه.
فەرزانه هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕوقیه ئاسایی بوو. ئاشقه و ماشقه نەبوون و دەسگیرانبازییش لەگۆڕێ نەبوو. بەئەدەب و شاد یەکتریان دەدواند و لەوەش نەدەپرینگانەوه تەوس و پلار پێکدا بدەن و قاقا بکێشن.
بەڵام پەروەندەکەی شێخۆ چاو و گوێی کردمەوه. دەرکەوت، جگه له ئاژانسەکەی ئێمەش که باری ماددی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی سیاسیی چەپییەکانی تاوتوێ دەکرد، دەزگ ایەکی دیکەش هەر له کۆنەوه هەبووه به بودجەی زەبەلاح و بەبێ کەرەستەی تەکنیکی کارەکانی خۆی ڕاپەڕاندووه و هەر بەردەوامیشه.
شێخۆ له ساڵی 1321ـەوه خەریکی کاروباری سیاسی بووه و له ڕووداوەکانی 17ی سەرماوەزدا سەرەڕای ئەوەی تەمەنی نەگەیوەته 23 ساڵانیش، ڕۆڵێکی هەر گێڕاوه، ئەگەرچی زۆریش گرینگ نەبووه.

لە کێشە و ناکۆکیی نێوان دەوڵەت و دەرباردا کە هەرکامە و دەیانەویست پێگەی س ىاسیی خۆیان بسەلمێنن، بەشدار بووە.
**خەنیمەکان** قاتی و قڕیی ساڵی جەنگیان کردە بیانوو و خەڵکیان تێک بەردا و کوشتاریان کرد و دواییش خۆیان ڕێک کەوتن. ئەگەر ئەوێ ڕۆژێ شا، لە ڕووی ئەو شتەوە کە لە "ڕوکنی دوو"دا هاتووە، قۆڵی لێ هەڵنەماڵیبا و خەنیمەکانی بێدەست نەکردبایە، ئەو پێشکەوتنە شکۆدارانەی وا ئەمڕۆ بە نەسیبی وڵات بووە، مەیسەر نەدەبوو. دەوڵەت داوای دەستئاوەڵایی لە پەرلەمان دەکرد و دەربار بە هەوڵ و تێکۆشانی کۆمەڵێک نوێنەری پەرلەمان و ڕۆژنامەنووسەکان، ئەو دەستئاوەڵاییەی پەسند نەکرد. تاقمێک لە قوتابییەکان بەرەو پەرلەمان کەوتنە ڕێ، بۆ ئەوەی لەو بوارەوە قسە لەگەڵ پەرلەمانتارەکان بکەن. شارەوانی و هێزە چەکدارەکان، خۆیان ڕێک خست و دەمکوتیان کردن.
فەرزان ئەودەم کە قوتابی بوو، شێخۆ دەناسێ کە هێشتا ردێنە بزنییەکەی نەبوو. ئەو گەنجەشیان لە نێو قوتابییەکاندا دیتبوو و کۆمەڵێک ڕاپۆرت لەبارەی ئەوەوە لە بیست لاپەڕەی ڕوکنی دووەم و ئیدارەی سیاسیدا پاتە دەبۆوە. جاری وابوو لە بازاڕ دەردەکەوتەوە. سەردەمێک لە مەشهەد لە مەرقەدی حەزرەتی ڕەزا بانگەشەی بۆ حیزب دەکرد. هەم لەگەڵ بەختیارییەکان بوو و هەمیش لەگەڵ قەشقاییەکان. ساڵی 1325 بە کۆڵێک ڕیش و پەشمەوە لە نەیشابوور دیتبوویان و چەند ساڵ دواتر لە شیراز بەو ردێنە بزنانەیەوە. لە سووتاندنی ماڵەکەی سەرۆکوەزیراندا، کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووسیان چەند ڕۆژێک دەستبەسەر کردبوو کە شێخۆ یەکێک بوو لەوان. هەر لەو چەند ڕۆژەدا پێوەندییەک لە نێوان ئەو و دەسەڵاتداراندا در وست بوو، تا دواتر وای لێ هات بوو بە یەکێک لە پیاوە کارلێهاتووەکان. حەفتەیەکی نەبرد کە سەرۆکوەزیر و دەربارییەکان ڕێک کەوتن و ئەو ئاژاوەیەی وا خەریک بوو لە دەزگای دادوەریدا دەهاتە گۆڕێ، دیزەبەدەرخۆنە کرا.
بەڵام لە زیندان شێخۆ نەک هەر پشتیوانیی پیاوانی دەسەڵاتی بۆخۆی مسۆگەر کرد، بگرە لەگەڵ دوو برا بازرگانیش دەستی تێکەڵ کرد و پشتیوانییەکی دەرەکیشی بۆ خۆی دەستەبەر کرد. ئەگەر ناوی ئەو دوو بازرگانە بێنم، ئیتر نان و ڕسقم دەچێتە سەر پشتی بای شەماڵ. چونکە هێشتا ئەوەندەیان دەست دەڕوا کە ڕوکنی دووەم و ئیدارەی سیاسیی ئەودەم سەهلە، پشتیوانەکانی ساواکیش باشاری نەکردن. هەر ئەوەندە ئاماژەیە بەسە بۆ ئەوەی برادەرانی بەڕێز بزانن کە لەم سەردەمەشدا هێشتا کەسانێک هەن، کە تەنیا بە زێڕ دەکرێ دەمیان ببەستی.
باسی شێخۆمان دەکرد، کە لە خێزانێکی دەستکورتدا لەدایک بووە و قۆناغی یەکەمی دواناوەندیشی پێ تەواو نەکرابوو. بە چوونە مەکتەب و نووسین، هەر بە نیگای پڕ لە وانە، سەد مامۆستای دەرس دادەدا.
ئاشنایەتییەکەی سەردەمی گەنجێتیی خۆی لەگەڵ خەڵکی دەربار تازە کردەوە. گۆرانیی بەئالۆوشی بۆ دەگوتن، نوکتە و قسەی خۆشی ڕووت و قووتی بۆ دەگێڕانەوە و خۆی لەبەر شیرین دەکردن. مادەی هۆشبەری وەک هێرۆیین و کۆکایینی لێ وەردەگرتن، تریاکی هەرزانی دەکڕی و لەو کۆڕانەی لە ماڵەکەی خۆیدا بۆ ڕابواردن پێکی دێنا، دەیدایە سیاسییە کرچوکاڵەکان و لەو ڕێگەیەوە پێگە و ئابڕوویەکی بۆخۆی کۆ دەکردەوە. لەمەودوا چیی دەیگێڕمەوە لە ڕووی پەروەندەکەی شێخۆوەیە، کە لە ئاژانسدا بۆی دروست کرابوو.

زۆری نەبرد بوو بە رۆژنامەنووسیش، هەم موسەددقی بوو و هەمیش دەرباری، شتێکی کە لەسەرتادا سەری لە ئاژانسیش شێواندبوو. هەر بۆیە نەدەکرا بڵێی ئەم کابرایە فلان شتەیە و بەرەنگاری ببیتەوە. لە رۆژنامەکەیدا هەم رەخنەری لە حیزب دەگرت و هەمیش ستالینی دەپەرست. هەر ئەوەندەی رۆژنامەکانی چەپ و راست دایدەگژانێ و سەرئێشەیەکیان بۆ دروست دەکرد و ئاژانس ناچار دەبوو هەنگاوێک بنێ، بۆ وێنە بیخاتە ژێر چاودێرییەوە، لە هەموو لاوە لە چەپ و راستەوە، لە بازاڕ و لایەنگرانی نەفتەوە دەبووە هەرا کە بۆچی، بۆچی گوتوویان پشتی چاوی برۆیە. ئاژانس ئاگادار بوو کە بە کۆکایین و هێرۆیین و تریاک و لەشفرۆشان، کۆڕی مێباز و هەتیوبازان خۆش دەکا، بەڵام سەرەڕای ستالین پەرستییەکەیشی کەس نەیدەوێرا پێی بڵێ چەپئاژۆ.
هەر ئەوەندەی سفرە و خوانی حیزب لە سۆنگەی تەقەکردن لە شاوە تێکەوە پێچرا، ئەویشیان گرت و پاش چەند رۆژێک ئازادیان کرد و دەستی ئاژانسیان لە خەنە گرت و ئاخریش ی کەس نەیزانی کێ و چ دەزگایەک بە سی هەزار تمەن زەمانەت، ئازادییەکەی ئەوی دەستەبەر کردووە. چەند ساڵ دواتر رووداوێک هاتە پێشێ، کە شارەوانی و دادگا قۆڵبەستیان کرد. ژنێکی بنەماڵە دەوڵەمەند و دەستڕۆیشتووەکان کە هاموشۆی ماڵەکەی ویی دەکرد، پاش ئەوەی سەرخۆشی ئارەق و کۆکایین لە ماڵەکەی شێخۆ دەبووریتەوە، چەند سەعاتێک پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵەکەی خۆی، مێردەکەی و بنەماڵەکەی شێخۆیان بە قاتڵ دانا و کردیانە هەرا و شارەوانی و دەزگای زانیاری و دادگایان ئاگادار کردەوە. ماوەیەک هەموو شتێک شێوا و ماڵەکەی پشکێنرا. لەوێدا مادەی هۆشبەر و تریاکی قاچاخیان دۆزییەوە و چەند ساڵێکیان زیندان بۆ بڕییەوە و دیارە نەک بە تاوانی پیاوکوشتن بەڵکو بە تاوانی دابینکردنی مادەی هۆشبەر و خەڵەتاندنی خەڵک و شتی دیکە... برادەرەکانی پێشووی بوونە مێشی دەوری شیرینی و ئیتر حیسابیشیان بۆ نەکرد و پشتیان تێ کرد. لەسەر ساجی عەلی دانیشت.
دەستەوئەژنۆ دانیشت. ساڵی 1339 دەستێکی نەبەدی دیسان بن باڵی گرتەوە و هەموو شتێکی بۆ سەفەرێکی فەرەنگستان بۆ ئامادە کرد و لەوێ خۆی واتەنی دوورەپەرێز کەوت و ملی نا لە خوێندنەوە و هاتەوە ئێران و جلوبەرگی دەروێشانەی لەبەر کرد. لە ئاژانس بەرنامەی کاریان دایێ و لەوێ هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نەبوو جگە لەوەی بچێتە شارەکان و لە شوێنی ژیان و گۆڕ و بەرهەمی پێشکەشکارە ناوبزرەکان بتوێژێتەوە و بەرهەمی تۆژینەوەکانیشی نەک بە ناوی راستەقینەی خۆی، بەڵکو بە ناوێکی دانراو لە رادیۆ و تەلەفزیۆزندا باس بکا و ئەوەش کارێکی ئەستەم نەبوو و دەکرا سوود لە ئاکامی لێکۆڵینەوەی ئەو زانایانە وەرگری کە لەو بوارەوە زۆر شتیان دۆزیبۆوە و بەناوبانگیش بی. دیارە لەو وتارانەدا هیچ باسی ئەوە نەدەکرا لێکۆڵەرە سەرەکییەکە کێ بووە، بەڵام بۆ شوێنەونکە، ئەویش لە پەراوێزدا ئاماژەیەک بە خاوەنی بەرهەمەکە دەکرا و دەنووسرا، مامۆستای مەزن، زانای شکۆدار و بلیمەتی سەردەم و بەو جۆرە دەستی دەکرد بە پێداهەڵدان و ماستاوچێتی و لە سواری کەری خۆیشی دانەدەبەزی. لە زانکۆوە، کە بە مندالّی ئاواڵی سەرۆکەکەی ئێستای ببوو، بانگهێشتیان دەکرد بۆ ئەوەی لە زانستەکەی خۆی بەشی قوتابییەکان بدا و لە ئاکامی بەشداربوونی لە کۆنگرە ئەدەبی و سیاسی و ئابوورییەکاندا وەک مامۆستاکان سەیری دەکرا و لەپڕدا کەس نەیزانی چۆناوچۆن رۆژگار شەقێکی لە سفرە و خوانەکەی هەڵدا و کردی بە تۆزی بانان و، ئێستا پاش شۆڕش دەچێتە هەر جێیەک دەڵێ: من لە سەردەمی شادا کوێرەوەری و تاڵیی زۆرم چێشتووە و ئەوەی لەدەستم هاتووە کردوومە و ئیتر ئێستا هیچم

لەدەست نایە. بەڵام ئەوەی کە منیش شێخۆم چۆن ناسی، بەسەرهاتێکی خۆشە. چەند مانگێک پاش لەوەی لە زیندان بەربوو، هێندە نەدار بوو بە فلْسی دەگوت فەتاح بەگ. ڕۆژێکیان لە ڕوقیە ئیتر لە بیستوچوار ساڵیدا بەشی فرۆشتنی جلوبەرگی ژنانەی فرۆشگاکەی هەڵدەسووڕاند ، ناوی شێخۆی هێنا کە لێی قەوماوە خەریکە لە برسان دەمرێ و بەبێ تاوان خراوەتە بەندیخانە و لەو لالانەو و پاڕانەوانە و، داوای لە من کرد یارمەتییەکی بدەم. پرسیم:

"شێخۆ کێیە؟"

گوتی:"منیش نایناسم. بەڵام ئاغای فەرزان دیتوویەتی و بەزەیی پێیدا هاتووەتەوە . دەیگوت:

"سەد دەرگای بۆ پارووەنانێک بە قوون کردووەتەوە و ئێستاش دەستەوداوێنی ئەو بووە..."

دیتم ئاگری بن کا نییە. فەرزان کە ئێستا ملازمی شارەوانییە، شێخۆی لە زیندان دیتووە و بەزەیی پێیدا هاتووەتەوە. شێخۆ دەستەوداوێنی ملازمی شارەوانی بووە و ئەویش هیچی لەدەست نایە...

دەیگوت: "بەشکم تۆ بتوانی فریای بکەوی و ئاهێکی بەبەردا بێتەوە..."

گوتم: "بۆ من چکارەم کە ببمە پشت و پەنای کابرایەکی تۆمەتی پیاوکوشتنی لەسەرە."

ڕوقیە گوتی: "براکەم، خۆت لە گێلی مەدە. دەڵێن دەستت زۆر دەڕوا."

من ئەودەم چەند ساڵێک بوو ببوومە ساواکی.

مەسەلەکەم بۆ دکتۆر بیژەن باس کرد و ئەویش یەک دوو ڕۆژی دەرفەت ویست و ئەوجار پێشنیاری پێ کردم پێوەندیی پێوە بکەم. ڕۆژێکیان شێخۆم لە بەردەم قاوەفرۆشییەکەی شەقامی شاڕەزا دیت کە مەکۆی کارمەندە بەرەڵاکان و کچە ژیکەڵەکانە. سەیرم کرد لەوێ بە حەژمەتەوە سەیری کووپی قاوەی مشتەرییەکان دەکا.

چووم لە نزیکییەوە ڕاوەستام و چاوم تێ بڕی. ئەو منی ناسییەوە. زەردەخەنەیەکی تاڵی هاتێ.

سەری داخست و هاتە لام و گوتی:

"جەنابی... بچووکتم."

"گەورەمانی."

دەعوەتم کردە قاوەخانەکە. کووپێک قاوەم بۆ داوا کرد. زۆربەی مشتەرییەکان هەر چاویان بە ئێمە کەوت، هەستان وەدەر کەوتن.

گوتی:" جەنابی... زۆربەی ئەوانە مشتەریی خۆم بوون، ئێستا خۆم لێ نەناس دەکەن. کوڕە هەر سڵاوێکیشم لێ ناکەن، چ بگا بە قاوەیەک."

گوتم: "خەریکی چیی؟"

"شوکرانەبژێری دەکەم و دەیچێژم. کەفارەی گوناحەکانم دەدەمەوە."

یەکترناسینەکەمان یەکەم جار لەوەندە پتر نەبوو. قەول و قەرارمان دانا چەند ڕۆژێکی دیکە هەر لەو دووکانە چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە.

جاری دووەم لەخۆڕادیتووانە قسەم لەگەڵ کرد چونکە مەسەلەکەم بۆ دکتۆر بیژەن گێڕابۆوە و بە ئەمری ئەو قەرار وابوو لە بنی زمانی دەرکێشم ئاخۆ چ داوایەکی هەیە.

داواکەی ئەو، پەتەی خستە سەر ئاو. دامابوو، ئەگینا وا بە ئاسانی لە زمانی نەدەهاتە دەر. هاتبوو من بکاتە کەرەستەیەک بۆ ڕزگارکردنی مەرزییە، ئەو کچە دەوڵەمەندەی بەبێ تاوان گیراوە و کەس بە سۆراغی نازانێ. مەرزییە یەکێک بوو لە کارتەکانی ئێمە، کە دەچووەوە سەر بکوژەکانی عەقیدەکەی

بنکەی گشتی. بە رۆژی رووناک ئەو دەمەی لەماڵەکەی دەهاتە دەرێ، لە ترۆمبێلێکەوە دوو فیشەکیان لێ دا و هەر لەوێ مرد. نامەیەکم دایە و پێم گوت سبەینێ بێتە یەکێک لەو شوێنانەی ئاژانس خەڵکی بانگ دەکاتە ئەوێ. کە لەوێ تووشی من هات، هیچ پێی سەیر نەبوو، سەری نەسووڕما. سەری لێ نەشێوا، وەک بڵێی بەرچاوی روون بووبێ و زانیبێتی هەر تووشی خۆم دەبێ. قسە لەسەر زار بوو و دیار بوو ئەگەر لە ئێمە زرینگتر نەبێ، هیچی وای لە ئێمەمانان کەمتر نییە. نزیکەی چوار سەعاتێک لێم پێچایەوە. هەڕەشە و تەماع وەبەرنان پێکەوە بوو. ئەوە یەکەم جار بوو کە رێگەم پێ درابوو قسە لە تۆمەتباران وەرگرم. دکتۆر بیژەن لە ژوورەکەیەوە بە ئامێرێک کە لە سەر مێزەکەی بوو، گوێی لە قسەکانمان بوو و جاروبارە یادداشتی دەکرد و دەیگەیاندەوە گوێچکەم و منیش سەرلەنوێ پرسیارم لێ دەکردەوە.

چەندی پتر لە رووی مەعنەوییەوە زۆرم بۆ دێنا، ئەو لەسەرخۆتر و ژیرانەتر وەڵام ی دەدایەوە. یەک دوو جار دەمویست بیدەمە دەست ئەشکەنجەگەرەکان. هەموو شتێک ئامادە بوو. دکتۆر بیژەن نەیدەهێشت، چونکە بە منی نەدەگوت، کە ئەو مشتەرییەی من هاوکاری ئاژانسی ئینتلیجێنتە، بەڵام تێی گەیاندبووم کە بۆ ئێمە باش نییە بەبێ ئەوەی بزانین پێوەندییەکانی لەگەڵ کێ و کوێن، بە ئەشکەنجەدان کۆمەڵێک قسەی پێ بکەین کە فڕیان بەسەر راستییەوە نەبێ، هەر جارێکی دکتۆر بیژەن لەسەر قسەی خۆی پێداگر دەبوو کە بۆ ئێمە باش نییە، من دەمزانی تەگبیر و رای بە پسپۆڕە بیانییەکان واتە CIA و مووساد کردووە و ئەوان رێگەیان نەداوە ئەشکەنجە بدرێ. شێخۆم بە کابرایەکی زەبر و زیرەک و بەهۆشوگۆش هاتە بەرچاو. وەڵامەکانی ئەوەندە دڵنیاییکەر بوون، وەک بڵێی پێمان دەڵێ: ئێوە دەرەقەتی من نایەن. تێشمان دەگەیەنێ کە من خزمەتکاری ئاژانسم و ئێوە چونکە خاو و تێنەگەیشتوون هەڕەشەتان لەسەرە و ناشزانن. دکتۆر بیژەن و پسپۆڕەکانیشی هەر ئەوەیان دەویست بزانن کە چ خزمەتێکی ئێمە دەکا.

هیچ ئاگای لە کوژرانی عەقید نەبوو. ئەو رۆژە هەر لە رۆژنامەکانیشدا نەیخوێندبۆوە. مەرزییەشی کە هاتبوو پشتیوانیی لێ بکا و ببێتە زامنی، هەر نەدەناسی. دایکی مەرزییە یەکێک بوو لەو میوانانەی جاروبار لە ماڵەکەی وی ئەو دەمەی کۆڕی بۆ گەرم دەکردن، بەشدار دەبوو. ئەوان لە نەزانیی خۆیان پێیان وابوو من چونکە سەردەمانێک ساتوسەودایەکم لەگەڵ دەستڕۆیشتووان هەبوو، شتێکم بۆ ئازادکرانی کچێک لەدەست دێ کە هێشتا بۆنی شیری خاوی لە دەمی دێ. بەڵام ئاخر منی داماوی مایەپووچ چیم لەدەست دەهات.

گوتم: "من هیچم لەدەست نایە، من لە بارم کەوتووە و حەوجێی نانی شەوێم. کەس گووم بە کڵاوی ناپێوێ. دوایی برە پارەیەکیان دامێ و گوتیان ئامادە بۆم خەرج بکەن و زۆر دەرکاو دەرکم کرد و دەستوداوێنی زۆر کەس بووم."

"چەندەت پارە وەرگرت؟"

"جوان لەبیرم نییە، دوو سێ جار برە پارەیەکیان دامێ."

"هەر جارەی چەند؟"

"هەرجارە و دووسەد تا سێسەد تمەن. چووزانم. لە دەرد و مەرگی خۆمم داون. لەوانەیە لەسەر یەک هەزار تمەنێک بێ. بەڵام هەزار تمەن بۆ ئەوان چییە! بە رای من و ئێوە لەوانەیە شتێک بێ. بۆ ئەوان بایی سەد دینار و سێ شاییە. ئامادەن هەزاران تمەن خەرج بکەن بۆ ئەوەی کچەکەیان ئازاد بێ."

بەردەوام باسی ئەوەی کرد کە بنەماڵەی کچە دەوڵەمەندن و ئامادەن بە هەر نرخێک بێ ئازادییەکەی بکڕنەوە. لە پێشدا زۆرم بەە ەند وەرنەگرت. بەڵام تۆزێک ختووکەم هاتێ. چما دەکرا بەبێ ئیجازەی دکتۆر بیژەن و ئەوانی سەرێ مەرزییە ئازاد بکرێ؟

پرسیم:" تا ئێستا چوویەتە لای کێ؟"

"هیچ کەس."

"چۆن هیچ کەس؟"

"تۆ مەبەستت ئاغای فەرزانە. پرێسکەی دڵمم بۆ ئەو کردوەتەوە."

"فەرزان لە کوێ دەناسی؟"

"ناسیارییەکی وام نییە. لە زیندانی پایوەر پاسەوان بوو و جاروبار بە ئێمەی بەندی رادەگەیشت و خۆی لێ نزیک دەکردینەوە. ئیتر وابوو غیرەتم وەبەر خۆم نا و قسەم لەگەڵ کرد. دەیویست پارەم بداتێ، بەڵام لێم وەرنەگرت. گوتم بنەماڵەکەم بۆم دێنن. بەڵام ئەگەر دەیەوێ دەستم بگرێ، با بەتۆم بناسێنێ."

"تۆ چۆن دەتزانی ملازم فەرزان من دەناسێ؟"

"سەیرم کرد ئاگای لە ورد و درشتی ژیانمە. لەوەی کە روقیەیان لە کافتریاکان و سینەما لەگەڵ فەرزان دیتووە و پێی وایە ئەوانە رەنگە بەو زووانە پێکەوە زەماوەند بکەن و دایکیشم ئاگای لەو پێوەندییەیە. پێی سەیر بوو من ئاگام لەو پێوەندییە نییە... هەر گوتی و نەیبڕییەوە و سەرم سوورمابوو کە چۆن ئاگای لە نهێنییەکانی ژیانی بنەماڵەکەی من هەیە. قسە و باسەکەم گۆڕی. باسێکی تازەم هێنا گۆڕێ. دەمترساند.

"ئەگەر قسەکانت لەگەڵ زانیارییەکانی ئێمە یەک نەگرێتەوە، دەراو بۆ ئەزیەتکردنی خۆت خۆش دەکەی."

"لە خۆڕا هەڕەشە دەکەی. دەکرێ ئەشکەنجەم بدەن. بەڵام ناتوانن بمکوژن."

رووم نەدایێ. وەشوێن کاری خۆم کەوتم. کەوتمە شوێن بنەماڵەی مەرزیە. کامەیان دەچوونە کۆڕی خۆشڕابواردنەکەی؟ دایک و باوکی پێکەوە یان بەتەنیا؟ ئەهلی کێشان و دووکەڵیش بوون؟ چەندە دەوڵەمەندن؟ چەند خانوویان بەکرێ داوە؟ مڵکەکانیان لەکوێن؟ معاملەیان لە بازاڕە یان لە دەرەوەی وڵات؟ چووەتە ماڵیشیان؟ کێ دەستوداوێنت بووە کە مەرزییە ئازاد بکەی؟ لەگەڵ دایکی قسەت کردووە؟ لە کوێ؟ لە نیاوەران چاوت پێیان کەوتووە یان لە شەقامی ئەمیرییە؟ باشە ئەو دەمەی لە نیاوەران لە باغەکەیان بووی، چۆن مەرزییەت نەدیتووە؟ کلکی بە تەڵەوە نەدەبوو. وەڵامەکانی یان بەڵێ بوون یان نازانم. زیاتر باسی سەروەت و سامانەکەی ماڵی مەرزیەی دەکرد. جارێکیان من دەهری بووم. تاقەتم نەما و لێم پرسی: "چۆن ناتوانم ناچارت بکەم قسە بکەی؟"

پێکەنینێکی تاڵی هاتێ: "کەی گوتم ئێوە ناتوانن ئەشکەنجەم بدەن؟ من تاقەت دێنم. من شتێکی وام نییە بیدرکێنم. بۆ من تاوانێکم کردووە تا دانی پێدا بنێم؟ هاتووم گیانی کچۆڵەیەکی بێ تاوانتان لێ بکڕمەوە. بەڵێ هاتووم بیکڕمەوە. ئیتر لەوە زیاتر کە تووشی ئەو لێپێچینەوەی کردووم، لەدەست نایە. بە ئەشکەنجەدانی من حەیاتان دەچێ."

"دەتەوێ لای کێ ئابڕوومان بەری؟"

"گونرەشی سەرووی گونرەشان زۆرن."

تاوێک راوەستام، ویستم بچمە دەرێ و لەگەڵ دکتۆر بیژەن قسە بکەم. کە لەسەر مێزەکەم هەستام، گوتی:
"لەبیرت نەچێ. بنماڵەکەی مەرزییە دەوڵەمەندن. دەتوانن زۆری سەرووی ئێوەش بکڕن."
لەگەڵ دکتۆر بیژەن قسەم کرد. گوتی: "بزانە مزگێنیی چەندە دەدات."
بەر لەوەی سەوداکە سەر بگرێ، لە ماڵێ تووشی روقیە و فەرزان بووم. وەڕووی خۆمم نەهێنا کە خەریکن دەبنە دەسگیران. لەگەڵ دایکم دانیشتم. گوتی: "ئەوەندەی من بزانم، فەرزان پێداگرە. بەڵام روقیە مل نادا." لەوەتەی لە "زاوا" سارد بێهیوا بووە، ئیتر لە هەموو پیاوێک بێزارە. قسەی وا دەکا لە هیچ کچێکی عازەبم نەبیستبوون. دەڵێ: من قەت مێرد ناکەم. ملازم حەزی لێیە. برادەرێتی و دەڵێ: حەزی لێ ناکەم. کوڕم: شەیتان چووەتە کڵێشەی ئەو کچەتیوەوە. خۆیشی نازانێ. ئێستا ئەوە ماوەیەکە هیچ خەریکی خۆیشی نابێ. هەتا پار، خۆی جوان دەکرد و ئارایشتی دەکرد. بەڵام لە ئەوەڵی نەورۆزەوە جۆرێکی دیکە جلوبەرگ لەبەر دەکا. جاری وایە لەچکێکی رەش لەسەری دەکا. حەزی لە سووراو و سپیاو نییە. لەپڕ ملی ناوە لە نوێژکردن و قورئانخوێندن. شەوانە کە درەنگ دێتەوە دەڵێ، دەچێتە مزگەوت و گوێ لە مەوعیزە دەگرێ. من نازانم چیی چووەتە کەڵەشیەوە."
پرسیاری فەرزانم کرد، گوتی: "سەری ئێرە دەدا. کەسێکی دەم قایمە. شەرمن دیارە. زۆربڵە نییە. بە ئا، یان نەخێر وەڵام دەداتەوە. زۆری ئاگا لە خۆیەتی. قەت شەقڵی شەلوارەکەی ناشکێ. بەردەوام سەرقاڵە و بێکار نییە."
نەک هەر دایکم شتێکی لەبارەیەوە نەدەزانی کە بیڵێ، بەدواداچوونەکانی منیش شتێکیان لێ شین نەبۆوە. دڵنیا نەبووم کە زانیارییەکانی شێخۆ لەبارەی خوازبێنی یان زەماوەندەکەی ئەوانەوە راستە یان درۆیە.
دایکم باسی مزگەوت و گوێگرتن لە مەوعیزەی دەکرد و شێخۆ باسی سینەما و کافتریا. کامەیان راست بوون؟ ئاخۆ روقیە شوێنەونکەی دەکرد و ژیانێکی شاراوەی هەبوو کە نەیدەویست ئاشکرای بکا؟
ئیتر هەوڵم دا روقیەم بەتەنێ وەگیر بکەوێ و وەک برایەک بیدوێنم، بەڵام لێمان بوو بە قڕە. هەر سەرەداوی قسەمان کردەوە، بەتەوس و توانج پێی گوتم:
"بۆ چما ئەتۆ باسی کارەکانی خۆتم بۆ دەکەی هەتا من پرێسکەی دڵمت بۆ بکەمەوە؟"
"چەند جارانم پێ گوتووی کە لە بازاڕێ خەریکی ئاڵووێرم. لەم هۆدەیە شتێک دەکڕم و دەیبەم بە دووکانداریکی دەفرۆشم. بەڵام تۆ بە دایکت دەڵێی دەچیتە مزگەوت و میحراب، کەچی خەڵک لە کافتریا و سینەما دیتوویانی."
"زۆر زیرەکی براکەم. کڵاو لەسەر هەمووان دەنێی، لەسەر منیش."
"کڵاوی چی؟"
"خەڵک زۆر شتت لەسەر دەڵێن."
"وەکوو؟"
"چووزانم براله، لەخۆیان بپرسە. لە خەڵکی گەڕەک، لە حاجی عەلاف و قولی خان و دووکاندار و چەرچی."
کە بیرم کردەوە لەوانەیە ئەو قسانە سەر بکێشنە جێی هەستیار، گوتم:

"من نامەوێ بێمە نێو ژیانی تۆوە. خۆت کچێکی گەورەی و پێویستت بە مشوورخۆر و گەورە نییە. دەمەویست بزانم بەتەمای مێرد بە فەرزان بکەی؟ ئاخر من براگەورەتم. دایکمان خۆ هیچی نییە. من دەبێ قۆڵت بۆ هەڵماڵم. خۆ ناکرێ بە رووت و قووتی بچیتە ماڵی مێرد؟"
قسەکەی پێ بڕیم:"ئەوە کێ گوتی من بەتەمای مێردکردنم؟"
"ئەی ئەو هاموشۆیە لەگەڵ ملازم فەرزان بۆچییە؟"
"یانی من بۆم نییە لەگەڵ پیاوێکی بەبیر و باوەڕ دۆستایەتیم هەبێ؟"
پیاوی بەبیر و باوەڕ. لە ئاژانس زۆرم لەو قسانە بیستبوو. داماوانە هەر لەسەر ئەو ئیمانەیان خۆیان بە کوشت دەدەن.
قسەکەیم پێ بڕی. روقیە ئەوەندە بزانە من براتم و هەر کات کارێکت پێم بوو، وەرە لای خۆم. من خۆشم دەوێی. زۆریشم خۆش دەوێی. دایکمان دەمرێ و من و تۆ دەمێنینەوە. دەبێ ئاگامان لە یەکتر بێ."
"منیش تۆم خۆش دەوێ. برامی. بەڵام دانوومان پێکەوە ناکوڵێ. ئەگەر راست دەکەی، مەرزیە ئازاد بکەن."
ئەوەی گوت و لە ژوورەکە چووە دەرێ.
کارەبا لێی دام و ئیفلیج بووم. سارد بوومەوە. مووچڕکەم پێدا هات. وا راچڵەکیم کە لانیکەم چەند چرکەیەک هەموو گیانم وشک بوو. خوێنم راوەستا. چ بکەم؟ چ نەکەم؟ ئەو کچەتیوە سەری بەکوێوەیە؟ هەودایەکە، کە سەرەداوەکەی لە مەرزیە و بکوژانی عەقیدەکەی سوپاوە دەگاتەوە فەرزان و روقیە. من خوشکەکەم نەبێ هەموو کەسێکی دیکەم پێ قۆڵبەست دەکرا و دەمتوانی بە ئەشکەنجە قسەی پێ بدرکێنم. بەڵام ئەی چ بکەم؟ لە پاش دواندنی شێخۆوە هەر بیرم لەوە دەکردەوە کە چەند هەزار تمەنێکی لێ بستێنم و زەماوەندەکەی روقیە وەڕێ بخەم و چەند رۆژێکیش بە کەیفی دڵی خۆم بژیم و ئاهێکم بەبەردا بێتەوە. هاوکارەکانی دیکەم لەو کاتانەدا یان پەنێکیان دەدا، یان ئەوەی تووشی گوناحێک دەبوون، ئەرکێکی دەرەوەی ماڵییان دەخرایە سەر شانێ و بەکەیف و چەلەنگ و سەرخۆش دەهاتنەوە، وەک ئەوەی ڕۆ بایان دیتبێ نە بۆران.
بەڵام چ لە روقیە بکەم؟ خەریکە لاڕێ دەبێ. چما دەکرێ وا سووک و ئاسان لەکۆڵ مەرزیە ئازاد بکەی؟ چما دەکرێ لای دکتۆر بیژەن ناوی روقیە بێنی؟ ئەگەر یەکێک سۆسەی ئەوە بکا کە روقیە لەگەڵ تاقمی پێشەنگ یان فیداییەکان و گیانلەسەردەستان کە هەر هەموویان باسی راپەڕینی چەکدارانە دەکەن و یەک یەک و دوو دوو لە بنکە نهێنییەکانیاندا ئاشکرا دەبن، یان لەگەڵ مارکسیستەکان ساتوسەودایەکی هەیە، هەموو نەخشەکانی هەڵدەوەشێنەوە و ژیانی خۆیشی لە مەترسیدایە. دەبێ بەرەی خۆت لەو گێژاوەی بێنیتە دەرێ. دەبێ وەشوێن فەرزان بکەوی و بەدوایدا بچی.
ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ دکتۆر بیژەن باس کرد. هەر ناوی روقیەم نەهێنا. گوتی، ئەو ئەفسەرێکی پایەبەرزی شارەوانییە و لە زیندانەوە شێخۆ دەناسێ و پێشنیاری پێ کردووە پێوەندی بە منەوە بکا. دەبێ بزانین خۆی چیی لە دەست دێ. دکتۆر بیژەن پێشنیاری کرد سەیرێکی پەروەندەی ئەفسەرەکان بکەم. پێی وا نییە تا ئێستا لە هیچ کوێ ناوی ئەوی بیستبێ. دکتۆر بیژەن وای دەرخست کەیفێکی بە شێخۆ دێ.

"هیچ لێت کۆڵیوەتەوە بزانی ماڵی مەرزییە چەندە دەوڵەمەندن؟ لەوانەیە لەخۆوە مەرزیەمان گرتبێ. تا ئێستا هیچ بەڵگەیەکمان لەسەری دەست نەکەوتووە. نابێ پەلە بکەین. هێشتا شووخاڵ و شوێنی چەند برینێک بە سەر مستییەوە دیارە. ئەمر دەکەم بینێرنە خەستەخانە. کێ گوتبووی ئاوا لێی بدرێ؟ خۆت بە پەروەندەکەی را بگە. لەوانەیە بتوانین بەری بدەین."
لە لێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوت کە ئەو رۆژەی تەقە لە عەقید کراوە، مەرزیە رێک بەو کۆڵانەدا تێپەڕیوە و کە گوێی لە تەقەکە بووە، لە لاقانی وەراندووە و خەڵک دیتوویانە را دەکا و، ناونیشانی کچۆڵەیەکی مامناوەندی ئارایشتکردووی پێڵاوسووریان داوە بە مەئموورەکان و ئەویشیان بە هاودەستی تەقەکەرەکان زانیوە.
هەر ئەوێ رۆژێ کە هێشتا نەچووەتەوە ماڵەکەی و ویستوویەتی بچێتە زانکۆ، گرتوویانە. لە لێپێچینەوەکەدا تەواو پێداگر بووە کە ئاگای لە هیچ شتێک نییە. کاربەدەستانی ئاژانس پاش لێکۆڵینەوە لە هەڵسوکەوت و وەزعی سیاسیی ئەو لە زانکۆدا لێیان روون بۆتەوە کە لە مانگرتنی قوتابییەکانی پزیشکیدا بەشدار بووە و ئەویان بە یەکێک لە بەرهەڵستکاران زانیوە.

## 2

راپۆرتێکی ئاهاری لە پەروەندەکەیدا بوو، کە قسەکانی ئەوی لەگەڵ هاوکارەکانی تێدا باس کرابوو. ئاهاری بە لێبڕاوی نەیگوتبوو هەڵوێستی سیاسیی ئەو چییە، هەر ئەوەندەی گوتبوو کە دەبێ چاویان بەسەرییەوە بێ.

لە رووی پەروەندەکەیەوە، بۆم دەرکەوت کەسێکی ترسنۆک و گرینۆک و نازدار و ناسکە و باوەڕم وابوو کە دەکرێ ئاگات لە کچۆڵەی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند بێ و رووی شێخۆ لە عەرز نەدەی. چونکە دەتوانێ لەو دانوستنانەدا دەڵاڵێکی باش بێ. بەڵام کێ هەیە ئەو زەنگوڵە لە ملی پشیلەکە بکا؟ هەروەها دەبێ چۆن برۆی؟ بەبێ یارمەتیی دکتۆر بیژەن هیچ جێبەجێ نابێ. دەبێ بەتایبەتی دکتۆر بیژەن بدوێنم، بەڵام چۆناوچۆن؟

پەروەندەکەم هەڵگرت و بردمە لای دکتۆر بیژەن، بەڵام ئەو سەری قاڵ بوو و من هەلەکەم قۆستەوە و گوتم:

"من پەروەندەکەی مەرزیەم دیت، هیچی وای تێدا نییە. دەڵێی چی ئەمشەو پاش کاروباری ئیداری پێکەوە لە شوێنێک دانیشین و بەکاروباری تازەکارەکاندا بچینەوە؟"

شەوێ لە میوانخانەکەی "کۆشک" یەکترمان دیتەوە. شێوێکی باشمان خوارد و چەند گڵاسێکمان هەڵدا. ئەو بوو کە سەری قسەی کردەوە.

"جاری وایە کاربەدەستان، لە ترسی مار خۆیان دەخەنە باوەشی حەزیاوە. لە خۆوە خەڵک دەگرن و شانەکەش لە سەری ئێمەدا دەشکێ. ژانەسەرەکەی بۆ ئێمەیە."

دووقڕانییەکەم کەوت. گوتم:

"جا بەرێکەوت منیش ئەمڕۆ دەمەویست هەر لەسەر ئەم مەسەلەیە قسەت لەگەڵ بکەم. ئەو پەروەندەیەی مەرزیەی کچی حاجی مرادی هەزارەیی شتێکی ئەوتۆی تێدا نییە. ئەو داماوەیان زۆر زۆرئەشکەنجە داوە و تا ئێستاش هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە دەستی لە کوشتنی عەقیدەکەی بنکەدا هەبووبی. ئینجا ئەوە سەروسەک وتی ئەو شێخۆیەشمان لێ پەیدا بووە و دەڵێ: حاجی یەکێکە لە دەستڕۆیشتووان. من پێم وایە شێخۆ سیخوڕێکی بیانییەکانە و ئەگەر سەد دینارێکیشی لە گیرفانی دەربێنین، بەتایبەتی کە ئێستا زۆر خراپ پێوە بوو، زەرەرێکی نییە."

دکتۆر بیژەن کە تووتکەسەگی وەک خۆی نەبوو، دەسبەجێ زانیی من دەمەوێ بڵێم چی. گوتی:

"با جۆرێک بێ داوێنی ئێمە نەگرێتەوە."

گوتم: "جا بە ئێمە چی. من قەول و قەرارەکەی لەگەڵ شێخۆ دادەنێم."

دکتۆر بیژەن، کۆنیاکەکەی هەڵدا. دەستێکی بە چەناگەیدا هێنا و گوتی:

"درەنگ بووە. هەستە با برۆین. بەڵام لەبیرت بێ کە زۆر کەس کیسەیان بۆ هەڵدووریوە. هەر شێخۆ نییە کە دەیەوێ ببێتە شتێک."

من شێخۆم خستە تەڵەوە. شەوێکیان نیوەشەوێ بانگم کردە هەر ئەو هوتێلەی کۆشک. گزیکەری وەک خۆی نەبوو. ئیتر عەبا و مەندیلی پێوە نەبوو، تەنیا ردێنە بزنانەکەی لەوانەبوو ئاشکرای بکا.

هێشتا دانەنیشتبوو، بێ پێچوپەنا لێم پرسی:

"ئەگەر مەرزیە ئازاد بکرێ، چیت دەست دەکەوێ؟"

"من خولامی تۆم، تۆ گەورەیی بفەرموو، لەسەر چاومی دادەنێم."

گوتم: "سەیر کە، من چاوەڕوانییەکم هەیە. بەڵام ئاگادار بە کە دەبێ دەمی خەڵکی دیکە شیرین بکەم. من حەرامخۆر نیم. بەڵام بەزەییم بە مەرزییەدا دێ، ئەگەرچی تاوانی کردووە و سوێند بە تاجەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ هەندێ شت دەزانێ و نەیدرکاندووە، هەر بۆیە ئازادکردنەکەی زۆر ئاسان نییە. کەسانێک هەن چاوێکیان لەسەر ئێمە کردووەتە چوار چاو. بەڵام با ئەوەندە بێ، کە شتێک بە بڕیاردەرەکان ببڕدرێ."

شێخۆ بەبێ رووبینی گوتی: "چەندە؟"

"چەندت لە قەوەدایە و چەندەیان پێ دەکرێ؟"

چەند جار بۆ ئەو مشتومڕانە دانیشتین و ئاخری شێخۆ پەنجاهەزار تمەن دراوی پێنج تمەنیی هێنا و لەوە تەنیا نۆهەزار و پێنج سەد تمەنی بەمن بڕدرا. باقییەکەیم نەغد لە مستی دکتۆر بیژەن کرد.

ئیتر پێکەوە دەوڵەمەند بووین. سوێندی خوارد کە ئەویش لە منی پتر پێ نەبڕدراوە و باقییەکەی بۆ ئەم و ئەوە.

مەرزیەیان هەر ئەوێ شەوێ ئازاد کرد و ئەو نەیدەزانی هەور و مانگ و خۆر و گەردوون و با دەستیان داوەتە دەستی یەکتر بۆ ئەوەی ئێمەمانان پارووە نانێک بخۆین و لەخوابێخەبەرانە بیخۆین.

بەڵام ئەوەش هەر وا بە ئاسانی و بەبێ دڵەڕاوکێ تەواو نەبوو، سوپاییەکان کردیانە هەرا و فەرتەنە کە بە رۆژی رووناک عەقیدێکیان لە راستەی شەقام کوشتووە و ئاژانس لە خۆوە گومانلێکراوان ئازاد دەکا. ئەو دەنگۆیە وەک برووسکە لە هەموو ئاژانسدا زار بە زار گەڕا. بە چرپە بە یەکتریان دەگوت: کاری وا بی سمێڵ چەورکردن نەکراوە. من ترسم رێنیشت. بەڵام دکتۆر بیژەن دارێک نەبوو بەو بایانە بێتە لەرزین. بەبێ ئەوەی وەڕووی خۆی بێنێ، لە چەند رۆژێکدا چەند ژن و پیاوی دەوروبەری ئەو شوێنەی گرت کە عەقیدەکەی لێ کوژرابوو. بێتاوان یان تاوانبار. گرینگ نەبوو. چەند کەسی ئازاد کرد و چەند کەسێکی دیکەی تا ماوەیەکی زۆر لە زیندان راگرت. دواتر بە منی گوت: "ئەوانەی لەو ساتوسەودایەدا بەشدار بوون، داوای پشکی زیاتریان دەکرد و من ملم رانەکێشا. بێت و بۆم دانواندبان، بەشەکەی تۆ نیوە دەکرا. بۆچی؟ شانەکە لەسەری ئێمەدا بشکێ و حەلواکەی کەسانی دیکە بیخۆن. کار گەیشتە سەرۆکی ئاژانسیش. بەڵام خۆیان دیزەبەدەرخۆنەیان کرد."

نۆهەزار و پێنج سەد تمەنەکە بۆ زەماوەندەکەی من خەرج کرا. من هیچ خێر و خۆشییەکم لەو زەماوەندە نەدی. دایکم بۆی دۆزیمەوە. من دڵم بۆ جێیەکی دیکە دەکورکاند. کچێکی نەتەنزیان بۆ هێنام، نەیدەزانی دەوری چ پادشایەکە. ئەو داماوە هەر لە ئەوەڵەوە نقوستان بوو. هەر یەکەم ساڵ دوو منداڵی بۆ خستمەوە. ئیتر تینی تێدا نەما. ئێستا ئەوە بیست و چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە. دوو سێ ساڵ بەجێ و بان کەوت. داپیرەیان جاروبارە منداڵەکانی دەبردەوە لای خۆی و جاروباریش دایکم سەرانسۆی دەکردن. ئێستا هەر کامە و بۆخۆی بووەتە شتێک و من بە سەگێکیش دانانێن. یەکێکیان لە ئەمریکا ژمێریارێکی سوێندخواردووە و ئەوی دیکە بووەتە ژنی دەڵاڵێکی قاچاخی چەک و خوا دەزانێ لە کوێیە و لە کوێ نییە. ژیانیان بەکاری ئەم راپۆرتە نایە. نازانم کێ تێی گەیاندبوون کە من بوومەتە ساواکی و بیستم پێم دەڵێن سمدار*. هاشم جاروبارە ئەحواڵێکم دەپرسێ و دوای چەند ساڵێک سەرێکم لێ هەڵدێنێ. ناوی باوە گەورەی قبووڵ کرد و ئێستا هەر مەرگی نەبینم، نە من ئاگام لەوە و نە ئەویش ئاگای لە من. خوشک و براکەش دەمێکە پێوەندییان پچڕاوە.

* شتيَكي وةك جاش لة كورديدا. وةك بنيادةمفرؤش.

کوژرانی عەقیدەکەی سوپا دیزەبەدەرخۆنە کرا. هەموو لەبیریان کرد. ئەو چەند کەسەی گومانیان لەسەر بوو، گیران و ئیتر هاتنە سەر ئەوەی چەندی بکری پتر بخزێینە نێو ریزی قوتابی و رووناکبیرانەوە. چەند جاران دکتۆر بیژەن لە منی پرسی، کە شێخۆ مەبەستی چ بووە کە گوتبووی، ئێوە هەرەشەیەکتان لەسەرە کە بە زەینی خۆشتاندا نەهاتووە. ئەو مەترسییە چییە؟

لەو دەمەدا کە من دوو ساڵ و شتێک بوو لە ساواکدا بووم، جارێکی دیکە وایان لێ کردمەوە گرینگی بە رووناکبیران و زانکۆییەکان بدەمەوە. خۆخزاندنە نێو حیزبم وەپێش خست. شتێکی ئەوتۆ نەبوو. لەوێ هەموو شتێک وەک قوزی بزنێ بەدەرەوە بوو. لە فکری راپەڕین و ئاژاوە و بشێوینانەوەدا نەبوون. جاروبارێ ئەوەندەیان کەمتەرخەمی دەکرد، کە منداڵێکیش دەیزانی وەک تووتی قسەی مامۆستاکەی ئەزەل دەڵێنەوە. مەسەلەکەی روقیە ئەوەندەی نیگەران کردبووم، کە ئیتر نەدەکرا لە حیزبدا بخولێیەوە و قسەی پووچ و بێمانا گەورە بکەیەوە. روقیەش کە جارێکیان گوتبووی متمانەیەکی ئەوتۆی بە حیزب نییە. پێشنیاریان پێ کردم جارێکی دیکە بکەومەوە گیانی قوتابییەکان و لەو مەترسییە بکۆڵمەوە کە پیاوێکی لەکڵ دەرهاتووی وەک شێخۆ بە گوێچکەمانیدا چرپاندبوو. بە ئاواتەوە بووم شوێن پێی روقیەش لەو تخووبەدا بدۆزمەوە.

پاش ئەو مامەڵەیەی بۆ ئازادکرانی مەرزییە لەگەڵ شێخۆ کردم، ئیتر روومان لە یەکتر کرابۆوە و رووقایم ببوو و جاروبارە تەلەفۆنی بۆ ماڵەوەمان دەکرد و لێی دەپرسیم. رۆژێکیان تەلەفۆنی کرد و هاتە سەردانم.

ئیتر نە عابای لەبەر بوو و نە مەندیلیشی لەسەر. ببووە سەرڕووتێکی تەڕپۆش. درێژایی ردێنەکەی بن چەناگەیشی بەرچاو نەدەکەوت.

ئەودەم من لە نیاوەران خانووێکم هەبوو. بینایەکی چەند هۆدەیی لەگەڵ باخچەیەکی سی هەزار مەتری و حەمام و چێشتخانە و تەلەفۆن و تەلەفزیۆن و ئەو شتانە. لە نهۆمی سەرەوەڕا دەمتوانی گوڵ و باخچەکەی پیش بیناکە و هەسێڵە هێلکەییەکەی و شەقامی پێش باخەکە ببینم. هەر کە هات و قەفەزی بچکۆلانەکەی تەنیشت مێزەکەی دی، کە پڕ بوو لە مەشرووبات، گوتی:

ـ "ئەی ناتەوێ گەرووی ئێمەش تەڕ بکەیتەوە؟"

گوتم: "یا شێخ، ئەتۆش؟" ئیتر پێکەنیم. گوتی:

"گاڵتەمان پێ مەکە. هاتووم رێگەت پێشان بدەم."

چەند تەوس و پلارێکم پێی دادا. تەڕ نەبوو. ئەویش چەندی بۆ دەلوا، خۆی لە من زیرەکتر و زاناتر نیشان دەدا و وای دەنواند ئەو زۆر شت دەزانێ کە ئاژانس هەر ئاگاشی لێیان نییە.

"دەی باشە، هاتووی رێم نیشان بدەی. کوێر دەبێتە چاوساغی کوێرێکی دی. چ رێیەک؟"

"هیچ دەزانی دنیا بە دەست کێوەیە؟"

"لە تۆ باشتر دەزانم."

"پێت وایە. دەزانی ئاغاکەت چ کارێکی بە کێنێدی بووە؟"

"جا بە من چی؟"

چارەنووسی من و تۆ و هەمووتان بەدەستی ئەوانەوەیە."

"دەی جا."

جا با بێ پێچوپەنا قسە بکەین. ئەوەندە خۆت بە دکتۆر بیژەن و ئەم و ئەوەوە هەڵمەواسە."

گوتم: "نازانم تۆ چکارەی کە دەزانی من خۆم بە دکتۆر بیژەنەوە هەڵواسیوە. دکتۆر بیژەن ئێستا بە نۆکەریش ناگرم."

"ئەوەندە بە شەقڵەوە قسەم بۆ مەکە."

"کەوابوو لە پێشدا گلاسێکم بۆ تێ بکە با پێت بڵێم."

هەستام و لە کۆمێدە شووشەدارەکە گلاسێکم هێنا و کۆنیاکێکم بۆ تێکرد و گوتم:

"ها بە ژەهری کە."

"بە خۆشیی دۆستان و، ئیتر هەڵی دا."

"ئاگاداری بەختیار دەبێ بڕوا؟"

"چی؟ ئەوەت لە قوتووی کام عەتار هێنا دەرێ؟"

"کارت بەوە نەبێ. من کۆنیاکی تۆم خواردەوە و ئیتر نەمەکگیرت بووم. ئاگات لە خۆت بێ. لەسەر خۆ بڕۆ، پشیلە قۆچت لێ نەدا. کاری خۆت بکە، بە تۆ چی کێ سوارە و کێ پیادە."

مەسەلەکەی تێ گەیاندم:"بە کورتی مەبەستی ئەوە بوو، ئاغاکانی من و تۆ نایانەوێ جارێ بەم زووانە شا بڕوا و کار بکەوێتە دەست خێڵ و عەشیرەتان."

سێ حەفتەی نەبرد کە حەزرەتی خاوەنشکۆ، بەختیاری بانگ کردە ئۆفیسەکەی خۆی و، کە لەوێ هاتە دەرێ ئیتر ئەو سەرۆکی ئاژانس نەبوو. ئیتر لەو دەمەوە بەختیار خۆی بە عالەمی ئاشکرا پەروەندەی هەبوو.

سەرۆکایەتیی ئاژانس درا بە کابرایەکی مەدەنی. پاکسازی دەستی پێ کرد. دووبەرەکی و ناتەبایی نێوان بەشێکی زۆر لە هەوادارەکانی بەختیار لە نێو ئاژانس و ئیدارەکانی دیکەدا بەرچاو بوو. لایەنێک زوڕنا و دەهۆڵی بۆ بەختیار هەڵگرتبوو و لایەکەی دیکەش رەشبین بوون و لە راپۆرتەکانیاندا بە لایەنگریی حەزرەتی خاوەنشکۆ قسەیان دەکرد. ئەوە تێگەیشتنی من بوو لە پەروەندەکان.

لە ژنێڤ پاش ئەوەی لێکۆڵینەوە لە هاموشۆی کۆلۆنێل لەگەڵ قوتابیەکان و کۆمۆنیستەکان و عەرەبە فەلەستینییەکان و ئەفسەرە راکردووەکان کرا، ئیتر ئەو دووبەرەکییە زۆر بەرچاوتر ببوو. خوا پشت و پەنای حەزرەتی خاوەنشکۆ بوو، ئەگینا لە ساڵەکانی پاش 1342ـدا هەر ئەو بەڵایەی بەسەر دەهات، کە ئێستا بەرۆکی هەموومانی گرتووەتەوە.

سەرچاوەی هەواڵ و زانیاریی من لە شتەکانی پشت پەردە، هەمیشە شێخۆ بوو. نۆ مانگ بوو نە لە قاوەفرۆشیی ئیسلامبول دەمدی و نە لە شەقام و بازاڕیش. پێ دەچوو لە تارانیش نەبێ. خۆش ئەوە بوو کە ئێمەی ساواکی ئاگامان لە هیچ شوێنێ نەبوو، جگە لە برۆزی و بەدفە رپی قوتابی و بەچکە کۆمۆنیستان و پێمان وابوو هەرچی رۆژنامەکانی شەرق و غەرب دەینووسن ئەوە بەڵگەی حاشاهەڵنەگرە و، لە پشتگوێشمانەوە کاری وا دەکرا تەواو سەری لێ دەشێواندین. ئەگەر خۆی تەلەفۆنی بۆ نەکردبایەم، هەر نەمدەدۆزییەوە. حکوومەتی ریفۆرمخواز لە 1342ـدا لێ کەوت و جڵەوی دەسەڵات بەتەواوەتی کەوتە دەست حەزرەتی خاوەنشکۆ. دوژمن (لە شێخۆم بیست) دەیانگوت، ئەمریکییەکان تەنیا وەختێک ئامادەن یارمەتیی ئابووری بە ئێران بدەن، کە ئێران بە تاوتوێکراوی و شێوازی گونجاو دەست بە ریفۆرم بکات.

ئەو زانیارییە تایبەتییەکانە، زەینی کەسێکی وەک مینیان دەشێواند. ئەو ئەرکەی خرابووە سەر شانی من، دۆزینەوەی چالاکییە نهێنی و ئاشکراکانی رووناکبیران بوو. دوو سێ ساڵان لەوەم کۆڵییەوە. چەند کەس لەو رووناکبیر و نووسەر و شاعیرانەم لە زیندان توند کرد، کە بە توێکڵەوە بوختانیان بە شا دەکرد و لای کۆمۆنیزمی رووسی و چینییان دەگرت. ئیتر دوای ئەوە هیچ نەبوو.

جاروبار لە دوورەدیمەنەوە خەڵکێکی بوودەڵە دەردەکەوتن، جموجۆڵێکیان دەکرد و نە دەمان. کە لێی ورد دەبوومەوە، لە تراویلکەیەک بەولاوە نەبوو.

هاوینی ئەو ساڵەی بەختیار لێ خرا، زۆربەی ئەو ساواکییانەی لە ئەورووپا ئەرکی سەرشانی خۆیان رادەپەڕاند، بانگ کرانەوە تاران بۆ ئەوەی دارودەستەکەی ئەو پاکسازی و هاوێر بکەن. کۆمەڵێک لە قوتابییەکانی نیشتەجێی ئەورووپاشیان بانگ کردەوە ئێران و بە پاسی گەورە بە ئێراندا گێڕایانن، بۆ پێشکەوتنی پڕ باق و بریقی ئێران ببینن و کەفوکوڵ بیانگرێ و هان بدرێن بانگەشە بۆ هەوڵی شێلگیرانەی حەزرەتی خاوەنشکۆ بکەن کە چۆن ئێرانی ئاوەدان کردووەتەوە. دیارە ئاژانس هەوڵی دا هەندێک لەوانە لە پێناو تەناهیی وڵاتدا بکاتە ئەندام. یەکێک لەو کەسانەی سەرپەرشتیاری و رێنوێنیی ئەوانی لە ئەستۆ بوو، من بووم. بردماننە ئابادان و ئیسفەهان و شیراز و مازەندەران و نیشانمان دان کە لە سێبەری شاهەنشادا و لەو چەند ساڵەدا کە ئەوان لێرە نەبوون ئەو هەمووە پێشکەوتنە هەبووە.

دوو گەنجیان لەگەڵ بوو بە ناوی دەماوەندی و خان عەلی، کە نازانم بۆچی روخساریان لەبەر چاوم ئاشنا بوو. خۆم لێ نزیک کردنەوە، لە کاتی نانی نیوەڕۆ و ئێوارەدا لە تەنیشتیان دادەنیشتم و قسەم لە بن زمانیان دەردەکێشا.

هەردووکیان کرچوکاڵ و هاو بوون. دەماوەندییەکە چەنەوەڕ و چاوقایم بوو و هەر لەخۆوە قاقای دەکێشا و هەر گوێی لە من بوایە کە تەوسێک بە رژیمی شاهەنشاییدا دەدەم، لێم راست دەبۆوە و حازر نەبوو بچووکترین رەخنەش قبووڵ بکا.

یەکی گوپنەی چاوبرۆجوانی تەرپۆش بوو و من زوو زانیم کوڕی یەکێک لە کۆلۆنێلەکانە، کە لەسەر حیسابی دەربار نێردراوەتە ئەورووپا. ئەوی دیکەیان، واتە خان عەلییەکە کوڕی کابرایەکی دارتاشی مازەندەرانی بوو و، وەختێک ئیدارەی مڵکەکانی پادشایەتیی دیتبوویان کوڕێکی بەتوانایە و هەوڵ دەدا، ئەرێی حەزرەتی خاوەنشکۆیان بۆ وەرگرتبوو و لەسەر خەرج و حیسابی خۆیان ناردبوویانە دەرێ، دیارە گفتیان لێ ئەستاندبوو کە پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی و وەرگرتنی دیپلۆمەکەی، دە ساڵ لە نێو دوڵەتدا ئەرکێکی حکوومی بگرێتە ئەستۆی و ئەوەندەی بشکرێ لە ئیدارەی مڵکەکاندا. ئەو دوو گەنجە کێبڕکێیان بوو و هەر کامە و هەوڵی دەدا بیسەلمێنێ لەوی دیکەیان سەرترە. دەماوەندی لە زۆربڵ ێی و خۆلەهەموو شتێک هەڵقوتاندندا و خان عەلی لە گرانوسەنگینی و بیرکردنەوە و ژیریدا. جارێکیان هەردووکیان لەسەر کامێرا، یان "مانیتۆفن"ـێک چیی نەمابوو لە سەروگوێی یەکتر بدەن و ئەگەر هاوڕێکیانیان نێوبژیوانییان نەکردبان، خوا دەزانێ چ دەقەوما. یەکێک بە ناوی ئازمایش هەواڵی لێکدان و شەڕەکەیانی بۆ هێنام. ئەوەیان هەتیوەیەکی بێ چاوڕوو بوو کە خۆی لە کاروباری هەموو کەسێک هەڵدەقو رتاند. کە لێم کۆڵییەوە دەرکەوت لە شەرق قوتابی بووە و لەسەر شاپەرستی هاتووەتە غەرب و گرینگیی پێ دراوە. خزم و کەسەکەی مەلا بوون و دەستیان دەڕۆیشت و بە نێوبژیوانیی ئەوان لەگەڵ قوتابییە نیشتمانپەروەرەکان و بەرهەڵستکارانی کۆنفدراسیۆن بانگهێشتی ئێران کرابۆوە.

هەقایەتی تێکهەڵدانی دەماوەندی و خان عەلی بەو جۆرە بوو کە بەپێی فەرمانی حەزرەتی خاوەنشکۆ، دەبوایە هەر کام لە بانگهێشتکراوەکان دیارییەکیان بدرێتێ، ئەویش بەپێی حەز پێداویستییەکەیان و، کوڕەکان شتێکی وایان بدرێتێ لە کاروباری رووناکبیری و کولتووریدا یارمەتیدەریان بێ وەک: رادیۆ و کامێرا و مانیتۆفن و جلوبەرگی ناوچەی خۆیان و کەرەستەی خۆجوانکردن و بازنە و بازیبەند و تابلۆی هونەری و بەرماڵ و شتی وا.

لە هوتێلەکەی ئیسفەهان دوو کەس دوو کەس لە ژوورێکدا دەبن و دەماوەندی و خان عەلییش لە ژوورێکدا. رۆژێکیان خان عەلی گەڕاوە و سەیری کرد ئەوە کامێرایەکی کۆداک و مانیتۆفن گرۆندیکێکیان لەسەر مێزە بچووکەکەی تەنیشت قەرەوێڵەکەیان داناون. دەماوەندی چونکە بیستبوویەوە لە گەڕانەوەدا هەر کامەو دیارییەکیان دەدەنێ، چەند دەقەیەک زووتر خۆی گەیاندەوە ژوورەکەی و هەر چاوی بە کامێراکە کەوت، هەڵیگرت و مانیتۆفنەکەی خۆی لەجێی دانا. پێی وابوو کامێراکە گرانترە و بۆ وێنەگرتن لە ماشووقەکەی بەکەلکترە. بەڵام هێشتا نەچووبۆوە سەر تەختی خەوەکەی، کە خان عەلی بە قەڵافەتی چوارشانە و پانتۆڵە فشوفۆڵەکەیەوە لە بەردەرگاوە راوەستاوە سەیری دەکا.

"تا زووە لە جێی خۆی دانێوە، ئەگینا دەم و لمۆزت دەشکێنم."

"تۆ گووخۆری کوێی؟"

لێیان بوو بە شەڕ. میوان و مسافر گوێیان لە دەنگ و هەرایان بوو و ئازمایش منی ئاگادار کردەوە و من هێشتا نەگەیشتبوومە ژوورەکەیان، بیستم دەماوەندی هاوار دەکا:

"بڕۆ هەتیو، هەمووان دەتناسن. تۆ برادەری گیانی گیانیی ئاهاریی و کەس نیە نەزانێ چکارەیە."

من تاوێک راوەستام بۆ ئەوەی باشتر گوێم لە شەڕەقسەکەیان بێ. بەڵام تێکهەڵدان و ئەو جنێوانەی دەماوەندی بە کوڕە دارتاشەکەی دەدان، دەرفەتی بۆ نەهێشتمەوە و لێیان وەژوور کەتم و گوتم:

"برادەرینە، ئێوە خوێندەوار و ئەورووپادیتەن. شەرم ناکەن؟"

لێکم جوێ کردنەوە و ئاشتم کردنەوە و رازیم کردن بەوەی مانیتۆفنەکەیان، کە پێیان وابوو هەرزانترە بە کامێرایەک بۆ بگۆڕمەوە.

بەڵام کێبڕکێیەکەیان لەسەر ئەم شتانە نەبوو.

وەک گوتم دەماوەندی سوێرقسە بوو و بە نەقڵ و نوکتەی خۆش و گاڵتەکانی خۆی هەوڵی دەدا کچان راکێشێ. کەچی خان عەلی گورجوگۆڵ بوو و دەیتوانی وەک مەیموونی لۆتییەکان دەرپەڕێ و کاروباری کچان راپەڕێنێ. هەردووکیان کامێراکەیان بۆ ئەوە دەویست دڵی کچانی پێ قایل بکەن. دیارە کوڕەی کۆلۆنێل بە سەرکوڵمەی سور و چاو و برۆی رەشەوە شانسی زیاتر بوو لە کوڕە دارتاشە بێدەنگ و خاکەڕاکە و رێوشوێنی دڵڕفاندنیشی هەر لە بنەماڵەوە بە میرات بۆ مابۆوە.

من سەیرم کرد هەردووکیان دەکرێ لە نێو قوتابییەکاندا بۆ ئێمە پارووەکی چەور بن، بەتایبەتی لەو قۆناغەدا کە لاوان زۆر بەکەفوکوڵەوە کەوتبوونە جموجۆڵ و پێیان وابوو بە خۆپێشاندانی چەند هەزار کەسیی مامۆستایان لەبەردەم پەرلەمان و ناڕەزایەتی دەربڕین لە هەمبەر گزیکاری لە هەڵبژاردنەکاندا و مانگرتنی کرێکاران لە کارخانەکانی دوورین و هەریرچنینی ئیسفەهاندا دەتوانن بناغەی دەوڵەتی پاشایەتی بلەرزێنن. خراپ لە خەو هەستابوون. ئاژانس مشووری هەمووانی خوارد. لە کۆلێژ کۆمەڵێک هەرچیوپەرچی کە دیار نەبوو کێ دەست لە پشتیان دەدا، کردیانە هەرا کە بۆچی دەرماڵەی خوێندنەکەیان کەم کراوەتەوە. بە حیساب مانیان گرت. حەزرەتی خاوەنشکۆ ئەمری فەرموو کە کۆلێژەکە داخەن. خەریک بوو دەبووە پشێوی، قوتابییانی زانکۆ کردیانە هەرا و ئاژاوە . کۆماندۆکانمان تێبەردان لەتوپەتمان کردن. بەزەییمان بەکەسدا نەهاتەوە. ئیتر کەس فەرقی بە مامۆستا و قوتابی نەدەکرد. دەڵێن هەندێ لە کۆماندۆ ناحاڵییەکان کتێبخانە و تاقیگەکانیان هەموو بەسەریەکدا دا. چەند قوتابییەکیان لە نهۆمی دووەم و سێیەمەوە هەڵدایە خوارێ. یەک دووانێک لە کوڕەکان بریندار بوون و دوایی مردن. زۆر کەس شڕ و شپرز بوون و سێسەد کەس گیران، زۆربەیان کەوتنە بەردەستی من. سەیرم دەکرد بزانم کامەیان دەناسم. دەمەویست سەردەستەی هەڵخەڵەتاوان بدۆزمەوە و بینێرمە سەربازخانە. دە بیست کەسێکم لە خوێندن بێبەش کرد. بەڵام هەراکە نەبڕایەوە. سێ رۆژ دواتر قوتابیی قوتابخانەکانیش کەوتنە گەڵیان. لە شەقامەکان کۆ دەبوونەوە و سووکایەتیان بە حەزرەتی خاوەنشکۆ دەکرد. شارەوانی هاتە نێو هەراکەوە، ئەوجار "بەرەی نیشتمانی" هاتە دەنگ. چەند سەرکردەیەکی ئەوانیشمان گرت. ئەوانی دی خۆیان شاردەوە یان کەوتنە گووخواردن. هەر لە سۆنگەی ئەو رووداوانەوە قوتابییەکانی ئەورووپاش چالاکییەکانی خۆیان چڕ دەکردەوە و، زۆر پێویست بوو مۆرەی دیکە دامەزرێنین بۆ ئەوەی بچنە نێو رێکخراوی ئازاد و کەرتی تایبەتەوە و خۆیان بە "خەباتکەر" لەقەڵەم بدەن. من زۆر سەرقاڵ بووم. لاقێکم لە کۆمسیۆنی سەرکوتی قوتابییەکان بوو و لاقێکم لە نووسینگەکەی خۆم کە پەروەندەی قوتابییەکانی ئەورووپا بخوێنمەوە و ئاگام لە کاروباری دەماوەندی و خان عەلی بێ. لەگەڵ هەردووکیان نێوانمم خۆش کرد. متمانەیان پێ کردم و لێم دڵنیا بوون بۆ ئەوەی سرتوخرت و قسەوباسی ئەوانی دیکەم، ئەگەر پێیان وابوو دژی نیشتمانپەروەری و شانوشکۆی قوتابییانە، بۆ بگێڕنەوە. لەو سێ حەفتەیەدا کە لەگەڵیان لە ئیسفەهان و گیلان و مازەندەران و خۆراسان مامەوە، توانیم باری دەروونیی میوانەکان و حەز و ئارەزوو و

چاوەڕوانی و ناڕەزایەتییەکانیان بناسم و بە کورتی بە پێشکەشکردنی دوو مانیتۆفۆن بە هەر کامەیان توانیم بیانکەمە سیخوڕێکی بێ ئەزموون.

هەر گەڕامەوە تاران، ویستم مەسەلەکە بۆ دکتۆر بیژەن بگێڕمەوە و داواشم ئەوە بوو ئەو دوو نێ چیرە دوو سێ حەفتەیەک زیاتر لە تاران و ئێران ڕاگرم بۆ ئەوەی باشتر بتوانم لە نێو قوتابییەکاندا کە ڵکیان لێ وەرگرم. بەختەوەرانە یان بڵێم بۆ بەدبەختی، دکتۆر بیژەن چووبووە پشوو ، من یش وێرام بچمە لای بەڕێز جیهانگیر. لەچاو یەکەم جار کە ژیاننامەکەمی لێ وەرگرتم و بە درۆ پێدەکەن ی و ئەدا و ئەتواری پۆلیسانەی دەردێنا، ئەمجارە بە نەرمونیانییەوە میوانداریی کردم و لە لای خۆیەوە دایینیشاندم. دەمویست ڕاپۆرتێکی لەبارەی سەفەر و بەڕێکردنی قوتابییەکان لە ئەورووپاوە بۆ ئێران بدەمێ. قسەکەی پێ بڕیم.

"لەو بوارەوە بە تێروتەسەلی زانیاریمان پێ گەیشتووە. گوتیشیان تۆ لەگەڵ دوو قوتابی بوویەتە هاوڕێ."

"جا ئەگەر ڕێگەم بدەی، دەمەوێ باسی ئەو دوو برادەرەت بۆ بکەم. پێم وایە ئەو دوانە بەکارمان دێن. دەبێ لە بری مۆرەی نهێنی کاریان پێ بکەین. هەردووکیان مایەی ئەو کارەیان تێدایە."

"فکرێکی زۆر باشە. بەڕێز، تۆ نازانی لە ئەورووپا چ هەرایەکیان ناوەتەوە و دیارە ئێمە مۆرەی نهێنیمان لە ئەورووپا هەیە. ئەوان هێشتا سەرکەوتنێکیان دەستەبەر نەکردووە. خانە ڕۆشنبیرییەکانیش تا ئێستا هەر بەکاری خۆیان دێ نەک ئێمە. زۆر زۆر فکرێکی باشە. ئێمە لە هەموو شوێنێک پێویستمان بە مۆرەیە. پیاوانی ئێمە لە هەموو کوێرەدێیەکیش دەبێ لەسەر هەست بن. لە ئەورووپاش لە هەر شارێکی سێ قوتابیی لێ بێ، دەبێ یەکێکیان پیاوی خۆمان بێ. لەبیرتان بێ کە جڵەوی پاشایەتی بەدەستی ئێمەوەیە. ئەگەر بە جۆشوخرۆشەوە ئەرکەکانمان ڕانەپەڕێنین و دەمامکی ڕوخساری نەزانان و خەڵەتاو و خیانەتکاران لانەدەین، زیانمان بە خۆمان و بنەماڵەمان و هەموو شتێکی خۆمان گەیاندووە."

تا خوا حەز دەکا لەو قسە قۆڕانەی کرد کە من وەک گۆرانییەکەی "خانمە خانم..." لەبەرم بوون.

لە بارەی حەزرەتی خاوەنشکۆ و نیشتمان و گەورەیی و ئایین و .. لە پڕ لای دا و مەبەستیشی ئەوە بوو دەراوی زاری من تاقی بکاتەوە.

"حەز دەکەی تۆ بنێرمە ئەورووپا و ئەو ئەرکە ڕاپەڕێنی؟"

گوتم: "قوربان من ئێستا سەرم ئاشە و قوونم ماشە..."

"برا، ڕۆیشتنی خوشکەکەت لە ماڵەوە کێشە نییە. لە هیچ کوێ شوێن پێیمان نەدۆزیوەتەوە. ئاشق بووە و وەشوێن کار و ژیانی خۆی کەوتووە."

گوتم:"عەرزم کردی من لە انکۆ خەریکی لێکۆڵینەوەم. خۆشم خەریکم یاسا دەخوێنم."

"دەزانم. کەی کارت تەواو دەبێ؟"

"هیوادارم تا ساڵێکی دی ئیمتیحانەکەم بدەم و دەربچم."

"زۆر باشە."

ڕازی بوو کە دوو حەفتەی دیکەش میوانداری لەو دوو قوتابییە بکەم.

"باشە خەرجەکەی ئەوان جێبەجێ دەکەم. باش پێیان ڕابگە."

"عەرزت بکەم ئەوان هەر ئێستا ئامادەی خزمەتن. خەرجێکیشی نییە. وا باشە پاش ئەو دوو حەفتەیە کە دەگەڕێنەوە فەرەنسا بیاندەیە دەست ئاژانس. دڵنیام تەواو پێوە بوون."

"دڵنیا بە."

لە لای ئەوەوە یەکەوڕێ چوومە شار. لە رستورانتی "چاقالێ" مێزێکی چەند کەسیم پاوان کرد و دەماوەندی و خان عەلی و دوو کچە قوتابی کە ئەوان حەزیان لێیان بوو، بۆ نانی ئێوارە بانگهێشتم کردن و داوام لێ کردن لەگەڵ بانگهێشتکراوەکانی دیکە نەگەڕێنەوە ئەورووپا و دوو حەفتە میوانی سەرۆکوەزیران بن، بۆ ئەوەی تەلاری فیردەوسی و مۆزەخانەکانی ئێرانی کەونارا و خەڵکناسی و کۆلێژی کشتوکاڵی کەرەج ببینن و دواییش بە خێر و خۆشی بچنەوە کۆلێژەکانی خۆیان. پاش هەڵدانی یەک دوو پیاڵە شەراب، دەماوەندی زمانی پژا و چەنەی گەرم داهات و کەفوکوڵ هەڵیگرت و گوتی، هەموو کۆنفدراسیۆنییەکان بێگانەپەرستن و پارە لە رووسەکان وەردەگرن و هەر نازانن نیشتمانپەرستی چییە و دەبێ لە سێدارە بدرێن. بە کچ و کوڕەوە. هیی ئەوەیە جووقەواری کۆمۆنیزم لەسەر ئەو زەوییە ببڕیتەوە و.. من هەوڵم دا هێورتری بکەمەوە و پێشنیارم دەکرد، باشە ئێوە بۆچی بۆخۆتان "رێکخراو" دروست ناکەن:

"بۆ ئێوە لەوان کەمترن؟ زمانخۆش و ژیر و کونجکۆڵ."

یەکێک لە کچەکان گوتی: "بۆ رێکخراوی قوتابیانمان کەمە یەک دوانێکی دیکەشیان لێ زیاد بکەین؟"

خان عەلی گوتی: "ئێمە هەر دەزانین قسان بکەین. خۆ هیچمان لەدەست نایە."

دەماوەندی هەڵیدایە:

"لە دەست جەنابت بەڵێ، بەڵام من لە دەمیان دەدەمەوە."

خان عەلی وەڵامی داوە: "بتبینم بزانم چۆنی."

من گوتم: "کاکە گیان، تۆش ئەوەندە بێهیوا مەبە. هەر کەسە و شتێکی لەدەست دێ. دەستێک بەتەنێ دەنگی نایە." یەکێک لە کچەکانی لای خان عەلیی گرت:"

"نا، کاکە، ئەویش ئەوەندە دەستەوستان نییە. خۆ ئەگەر تووش بێ، مەلەوانێکی لێهاتووە. ئەگەر یەکێک بە راستی رێکخراوێکی قوتابیان بکاتەوە، خان عەلی زۆر شتی لەدەست دێ. ئاوای سەیر مەکەن، سەلکەبزووتێکە."

بوو بە بەزم و سوعبەت و قسەی خۆش و کچەکەی دیکە تەوسێکی پێدا دا و گوتی:

"خاتوون، دیارە تۆ باش دەزانی."

شەوەکەمان بەخۆشی تێپەڕاند و من دوو تاکسیم بۆ گرتن و هەر چواریانم گەیاندەوە هۆتێلەکانیان. پێشم وایە ئەو تۆوەی چاندم دوایی هەموو ئێرانییەکان لێیان هەڵگرتەوە.

هەموو ساڵێ ئەو دوو کەسە بە مەبەستی دیدار لەگەڵ بنەماڵەکانیان لە پشووی هاوینێدا دەهاتنەوە بۆ تاران کە لە راستیدا بۆ ئەوە دەهاتنەوە بێنە لای من و منیش پاش خوێندنەوەی راپۆرتی کارەکانیان، لەکڵ دەمهێنانە دەرێ، چونکە هێشتا خاو بوون.

دیارە هیچ ناوێکی ئاژانسمان نەهێنا و من خۆمم وەک کارمەندی وەزارەتی ناوخۆ و سەرۆکوەزیران دەناساند، کە لە نووسینگەی سەرۆکی حکوومەتدا بە کاروباری قوتابیان رادەگەم. پەروەردە و فێرکاریی ئەوان تەواو بە من ئەسپێردراوە. هەر من مافی ئەوەم هەبوو راپۆرتی کارەکانیان بخوێنمەوە، تەنانەت دکتۆر بیژەنیش ئاگای لێیان نەبوو..

تەنیا ئەگەر پێویست بوایە دەمتوانی پێوەندی بە دکتۆر جەهانگیرەوە بکەم، کە دواتر لێم روون بۆوە خۆ ئەویش وەک هاوکارەکەی نەک هەر دکتۆر نییە، بگرە دەرسیشی نەخوێندووە و، بە ئەمری سوپاییەکان ئەو پۆستەی داگیر کردووە. ئەوەش بۆیە دەنووسم کە وەختێک ناسیمن، ئیتر ترسم لێیان نەما. من خۆمم لەوان بەرزتر دەدی و ئیتر بەپێویستم نەدەزانی وەک جاری جاران خاکەڕا بم. دیارە راست بێ یان درۆ، من دەرسم خوێندبوو. کتێبم دەخوێندەوە. دەستەواژەی فەلسەفی و سیاسییم دەزانی و تێیان دەگەیشتم. فێری زمانی ئینگلیزی ببووم و دەمتوانی بەرەی خۆمی پێ لە ئاوێ دەرکێشم و جاری وابوو بەسەرمدا دەهات دکتۆرایەکیش وەرگرم، وەک دکتۆرای ئەوانەی چوونەتە پاریس. یەکێک نامەکەی بۆ دەنووسیم و منیش پارەیەکم دەدایە و تەواو. بۆ بەدبەختی، باری خۆمم گران کرد و ژیانی

بێسەروبەرەی خوشکەکەشم وای بەستبوومەوە، کە نەیهێشت بگەمە ئەو ئامانجە بەرزەم. تۆزە فەرەنسییەکیشم کاوێژ دەکردەوە.

دکتۆرە فشە جەهانگیرەکەش زۆر زوو زانیی کە من لەو زیرەکترم و ئیتر لووتبەرزییەکەی نەمابوو.

دوو ساڵی رەبەق دابەستنی ئەو دوو فەرخە ئاغایە لە ئەستۆی من بوو. بۆ سێیەمین جار لە جۆزەردانی 1342ـدا ئەو دەمەی بانگهێشتم کردبوونەوە تاران، ئەو هەرایەی تاران هاتە پێش، کە خوێنیشی تێدا رژا.

ئەو هەرایە پێشینەی هەبوو. رۆژی دووەمی جێژن، فەقێکانی مەدرەسەی عیلمییەی قوم دەیانەویست راپەڕن و لە "ریفۆرمی زەوی و زار" ناڕازی بوون. ئە مجارەیان کۆماندۆکان و ئەو جل مەدەنیانەی لە بن فەرمانی کۆلۆنێل و فەرماندەی لەشکردا بوون کە ئەودەم سەرۆکی ساواکی تاران بوو، مشووریان خواردن و بێبەزەییانەتر لەوی زانکۆ سەرکوتیان کردن.

دوو مانگ بە رواڵەت وڵات هێمن بوو و هیچ لەگۆڕێ نەبوو. جڵەوی کەشتییەکە بەدەست ئاژانسەوە بوو و هەر کەس دەنگی لێوە دەهات، دایاندەپەڵۆست. تا رۆژی تاسووعا و عاشوورا کە هەزاران کەس لە رێوڕەسمە ئایینیەکەدا بەشدار بوون و وردە وردە تازیەبارییەکە بوو بە راپەڕین. من خۆم گوێم لێ بوو کە کۆمەڵێک خەڵک هەرایان دەکرد: "مەرگ و نەمان بۆ شا. داوای ئازادیی هەڵبژاردنیان دەکرد و جنێویان بە ئینگلیز و ئەمریکا دەدا.

ساواک وڕ و کاس ببوو و نەیدەزانی ئەو راپەڕینە سەرچاوەکەی لە کوێوەیە. لە کوێوە هەستاوە. کاربەدەستە پایەبەرزەکانی ساواک کە خەبات دژی کۆمۆنیزم و چەپگەراییان خستبووە سەری هەموو بەرنامەکانیانەوە، ئەو راپەڕینانەیان دەخستە ئەستۆی ڕووسەکان.

هەندێکیشیان بەختیاریان بە خەتابار دەزانی. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە راپەڕیوەکان جنێویان بە ئینگلیز و ئەمریکا دەدا و دروشمی دژەکۆمۆنیستی نەدەبیسرا. لە وەرامینەوە کۆمەڵێک کفنپۆش خۆیان بە شاریدا کرد و خەریک بوو کارەکە خراپ دەکەوت، کە فەرمان درا بیاندەنە بەر دەسرێژ و دەمکوتیان بکەن. فەرمانی تەقەکردنەکە حەزرەتی خاوەنشکۆ خۆی دای. مەبەستی ئەوە بوو خەڵکەکە بترسێنن و سەردەستەی ئاژاوەگێڕەکان دابڕن و بیانگرن. ئەو نیازپاکییەی شا، لە لایەن سەرلەشکری فەرماندەی هێزە هاوبەشەکانی سوپا و شارەوانی و ساواکییە چەکدارەکان کرا بە خوێنڕشتن و کوشتاری کۆمەڵێک خەڵکی بێ گوناح.

دیارە خەڵکێکی زۆر کوژران. بەڵام ئاژاوەگێڕان کردیانە هەرا کە بەڵێ، زیاتر لە پێنج هەزار کەس کوژراون. سەرۆکی باقی لقەکانیش پاش چەند سەعات گفتوگۆ هاتنە سەر ئەوەی سەرلەشکر خەتابارە و فەرمانەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆی خراپ جێبەجێ کردووە و نابێ بهێڵێ کارەکەی بگاتە ئەو ئاستە. هەر ئەو رۆژە میدیا بیانییەکان، کە هەر هەموویان داردەستی کۆمۆنیست و ئینگلیزەکانن، دەنگۆیان بڵاو کردەوە کە بەڵێ حکوومەتی شا هیچ پێگەیەکی لە نێو خەڵکیدا نییە. رۆژنامەیەکی چەپئاژۆی فەرەنسی نووسیی، کە حکوومەتی شا بە 225 ملیۆن دۆلار بووجەی سوپا و چالاکیی ئاژانسی پاراستن، هێشتاش نەیتوانیوە خەڵکەکەی خۆی جڵەو بکات. چەند هەواڵدەرییەک هێنایان لکوپۆیان بەو هەواڵە بچووکەوە نا و تیفتیفەیان دا و نووسییان:"جەماوەر وەک لێشاوێک شەقامەکانی شاری تارانیان داگرت. سوپاییەکان بە ئەمری سەرلەشکر، لە راستەی شەقام خەڵکە کفنپۆشەکەی وەرامینیان دایە بەر دەسرێژ. ئالۆزییەکە خەریک بوو سەری دەکێشایە قوم و شیراز و شارەکانی دیکەش. هەر ئەو شەوە لیوای سەرلەشکر هەموو کاربەدەستەکانی ئاژانسی نێو تارانی کۆ کردەوە. سێسەد کەسێک، زیاتر یان کەمتر دەبووین. قسەی بۆ کردین و گوتی: ئێستا سەد هەزار کەس نێردرانە دۆزەخ. هیچ گرینگە؟ ئێمە وڵاتمان لە مەترسیی کۆمۆنیستەکان و مارکسیستە ئیسلامییەکان رزگار کرد و ئەگەر جارێکی دیکەش وا بکەنەوە دیسان ئاوایان لێ دەکەینەوە. سەگباب دەتگوت کتێب دەخوێنێتەوە.

لەوکۆبوونەوەیەدا هیچ کەس نەیوێرا نقەی لێوە بێ. کە هاتینە دەرێ، بیستم چەند کەسێک لە سەرکردەکان دەیانبۆڵاند و دەیانگوت، ئەمرەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ هەر بڵاوەپێکردنی خەڵکەکە بووە، ئەویش بەو مەبەستەی پێشەنگەکانی فیتنەکە بدۆزرێنەوە، نەک خوێنڕشتن. سرتوخرتەکەی لە نێو ئێمەدا بەردەوام بوو، تەنانەت دکتۆر بیژەنی کۆیلە و بەردەستی سەرلەشکریش سەری دەلەقاند.

من وای تێگەیشتم کە هەمووان لە گیانی خۆیان دەترسن و پێیان وانەبوو خەڵکە ناڕازییەکەی ئەوەندە خۆی ڕاگرێ. لێرە و لەوێ دەبیسرا کە ئەم خوێنمژە بە مەبەستی خۆشیرنکردن و وەرگرتنی دەرەجە و پۆستی سەرۆکایەتیی ئاژانس هیچ لاری و ترسی لەوە نییە تەنانەت ویست و ئارزووەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆش پێشێل بکا. حەزرەتی خاوەنشکۆ دەیەویست ئێران بکاتە وڵاتێکی ناکۆمۆنیستیی بەرەو دنیای ئازا، نەک ئاژاوە و فیتنە. دوژمنە سەرسەختەکانی تۆمەتباریان دەکرد کە بە ئانقەست ئاگرەکەی خۆش کردووە. مشتومڕەکان وایان لێ هاتبوو کە ئیتر کەس دەرفەتی بیرکردنەوە و مشوورخواردنی نەبوو. دەکرا بڵێی کێچ کەوتووەتە کەوڵی هەمووان. لەوە تۆقیبوون ئەو ژمارەی ئەو جەماوەرە سەرکەش و یاخییە چەند هێندەی لێ بێ. جا ئەودەم چییان بەسەر دەهات. ئاخۆ ئەوە بوو ئەو مەترسییەی وا شێخۆ دەیگوت هەڕەشەی لە هەموومان دەکرد؟

سەرکردەکانی ئاژانس بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەو مقۆمقۆیانە، بڕیاریان دا توندوتیژتر بجووڵێنەوە. بوو بە بگرە و بەردە. خەڵکێکی زۆریان گرت. بۆ قسەلێدەرکێشانیان کە لکیان لە هیتەری کارەبایی و داری کارەبایی و خودەش وەرگرت.

باشییەکەی ڕەشبگیرەکە لەوەدا بوو کە دیسان سەرچاوەیەکی داهاتمان کەوتەوە بەردەستی.

ژمارەیەکی زۆر لە سەرکردەکانیان گرت. لە دووسەد سێسەد کەس بەلانی کەمەوە دە، بیست کەسێکیان دەو لەمەند بوون و دەکرا جەڕەبابەیان بدەی و پارووە نانێکت دەست بکەوێ. من لەو هەنگەمەیەدا هیچم دەست نەکەوت. بەزەییم بە سێ کەسدا هاتەوە و بەرم دان و ئەوەی دەستم کەوت، توانیم ترۆمبێلێکی نوێی پێ بکڕم. هەڵبەت بەبێ چەورکردنی سمێڵی دکتۆر بیژەن و دکتۆر جیهانگیر ئەو کارە نەدەکرا.

ئەو خوێنمژییەی سەرلەشکر خەریک بوو هەموو هەوڵە بەپارێز و دادپەروەرییەکانی جەنابی شای ــ کە چەند ساڵێک بوو دەستی پێ کردبوون ــ پووچەڵ دەکردەوە. ئەوە نییە شا بۆ هاندانی خەڵک دوو حیزبی نیشتمانپەروەران"ملیون" و حیزبی خەڵکیی دامەزراندبوو بۆ ئەوەی پەرلەمانتاران و خەڵکیش هان بدرێن بەشداری کاروبارەکان بن و ڕەخنە بگرن و ڕێگەی ریفۆرم و چاکسازی بخەنە ڕوو؟ جەنابیان لە ساڵی 1329ـدا ئەو ملک و ماڵەی لە باوکییەوە بە میرات بۆی مابۆوە، دابەشی کرد و چیها وەرزێر و جووتیار بوونە خاوەنی زەوی و دەوڵەمەند بوون. هەر ئەوانەی کە لە گوندەکانی دەوروبەری وەرامینەوە ڕوویان کردە تاران، ئەوانە بوون کە زەوی و زاریان پێ نەبڕابوو. دیارە دوژمنە قەستەسەرەکان، واتە کۆمۆنیستەکان دەنگۆیان دەخستەوە کە بەڵێ، ملکەکان دەفرۆشن بۆ ئەوەی دۆلاری پێ بکڕن و بینێرنە دەرێ. ئاخر دەکرێ دەروازەکانی تاران دابخەی، بەڵام خۆ زاری نەزانانت پێ داناخرێ. تەنانەت بۆ ئەوەی جەنابیان بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵک بۆ لای ئەو ریفۆرمانەی هەمیشە لەبەرچاوی مبارەکیان بوو، ڕاکێشن و دەست بدەنە ئەو ریفۆرمەی پێی وابوو کلیلی هەموو کێشەکانی وڵاتە، حکوومەتێکی نەرمونیانی هێنایە سەر کار کە تێیدا تەنانەت یەک دوو کۆمۆنیستی پێشووشی تێدابوو. هەر ئەو دەوڵەتە بوو کە ڕایگەیاند:

ئەگەر لە تمەنێکی دەوڵەمەندان دوو قرانی بە هەژاران نەدرێ، دنیا دەشێوێ. فەرموویان:

"خوایە سواڵکەر قەت پێ نەگا. چونکە بێت و دەوڵەمەند بێ، ئاگای لە خواش نامێنێ. یەکێک لە وەزیرەکانی هەر ئەو کابینەیە کە ئێستا بەر ڕەحمەتی خوا کەوتووە، فەرمووی: "ئەگەر ریفۆرمی ئاشتیخوازانە نەکرێ، شۆڕشێکی خوێناویی لێ دەکەوێتەوە. هەر بەراستی حەزرەتی خاوەنشکۆ دەیەویست شۆڕشێکی سپی لەسەرەوەڕا دەست پێ بکا.

دیار نەبوو ئیتر ئەو فیتنەگێڕانە چییان لە گیانی حەزرەتی خاوەنشکۆ دەوێ؟ دەی خۆ لە شەڕیشدا حەلوا نابەشنەوە. ئەوی ماسی بگرێ قولەپێی تەڕ دەبێ. خەڵکێک گیران و خەڵێک دوور خرانەوە و بۆ من ئەوە سەرنجڕاکێش بوو کە لەو ڕێپێوانەدا تاک و تەرا ژنی لەچک بەسەر بینران و من کە هەموو ڕۆژێ لەگەڵ ئەو دوو قوتابییەی لە ئەورووپاوە هاتبوونەوە چاوم بەسەر ئەو سەربزێوانەوە بوو، لە هەموو شوێنێک چاوم بەدووی ڕوقیەدا دەگێڕا و پێم وابوو ئێستا کەوتووەتە گەڵ ئەوان.

ئەو فیتنە و ئاژاوە چەند ڕۆژییە، جوان کاری کردە سەر دەروونی هەر دوو گەنجەکە و هەردووکیان ساغ بوونەوە بە گیان و دڵ یارمەتیدەری کاربەدەستانی حکوومی و شاپەرستەکان بن، بەبێ ئەوەی ناوی ساواک بێتە گۆڕێ، لەو کاتەدا کە من خۆم خەریک بوو تۆزە گومانێکم لێ دەنیشت.

کارەکە خەریکە ناسک دەبێتەوە. ئاخر باسی ڕاپەڕینی خەڵک نەبوو. وەختێک دەمدی ئەو دوو گەنجە تەنیا ڕواڵەتی مەسەلەکە دەبینن و دەبیستن کە خەڵکەکە داوای هەڵبژاردنی ئازاد دەکەن و لە قووڵایی مەسەلەکە تێناگەن و لە دنیای خەیاڵدا شمشێر لە کالان دەردەکێشن بۆ ئەوەی سەر بشکێنن و مل بپەڕێنن و لە سێدار بدەن، نەیاندەزانی چ بەڵایەک لە بن ئەو دروشمەوە خەوتووە. ئەوەی ئەوان لە ئاوێنەدا دەیاندی، من لە کەرپووچدا دەمدی. ئەوان هەر لە سەرێکی حاڵی بوون. جاری وابوو بیرم لەوە دەکردەوە کە ڕێگەیەک بدۆزمەوە و خۆم بگەیەنمە گۆشەیەکی ئەورووپا و خۆم لەو گێژاوە ڕزگار بکەم. ئەوە ببووە فکر و خەیاڵی من. خۆ بڕیارم دا فێری زمانێکی بیانی بم و ڕاکێشانی ئەو دەماوەندی و خان عەلیە کە ئاهارییشیان هاتبووە سەر، بکەمە بیانوویەک و تێی قووچێنم.

بەڵام سەیری هەر لایەکم دەکرد ڕوخساری ڕوقیەم لەبەر چاو بوو. ئیتر ئەو تەنیا خوشکم نەبوو، بەڵکو خۆشم دەویست. باشە کێ دەڵێ یەکێک لەو لەچک بەسەرانە ڕوقیە نەبووە. ڕوقیە دەیتوانی بووبێتە دوژمن، یەکێک لەوانەی هاواریان دەکرد "مەرگ بۆ شا" و داوای "هەڵبژاردنی ئازاد"یان دەکرد. ئاخۆ دەکرێ ڕۆژێک شتەکان پێچەوانە ببنەوە و ڕوقیە بکرێتە کاربەدەستێکی پۆلیس و منی سەربە ئاژانس بکەومە بەردەستی وی؟ ئەو خەیاڵ و ساویرانە لەکۆڵم نەدەبوونەوە. شەوانە خەونم دەدی و لە بن دۆڵپادا ڕادەپەڕیم و ڕوقیەم دەدی لەچکی لەسەر کردووە و بە قەڵافەتێکی تووڕە و سامناکەوە تفەنگێکی بەدەستەوەیە و بە داسێک دەیەوێ سەرم ببڕێ.

ڕۆژانە بەشوێن ڕوقیەدا بە نێو کوژراو و زیندانییەکاندا دەسووڕامەوە. کوژراوەکانیان لە خەندەقێکی دەرەوەی شاریدا و دوور لە چاوی خەڵک وەبن گڵ دا. بیستمەوە دوو ژنیش کوژراون. بەڵام نەدەکرا تەرمەکەیان بدۆزیتەوە. چەند ژن و کچی لاویش لە نێو گیراوەکاندا هەبوون. تکام لە لێپێچەرەکان کرد لە لێکۆڵینەوە و لێپێچینەوەکانیاندا سۆراغی ڕوقیەش بگرن. لە هیچ شوێنێک سەروسۆراغی نەبوو. هیوام بڕا و دڵەکوتە دایگرتم. هەستم کرد خەریکە بڕستم لێ دەبڕێ. هەر قوتابییەکانم ناردەوە فەرەنسا، چەند ڕۆژێکم ئیجازە وەرگرت و یەکەوڕێ چوومەوە ماڵی دایکم و لەوێ پشوویەکم دا.

ئیتر چاوم بە منداڵەکان نەکەوتەوە. ئەوان لای باپیرەیان بوون و من نەمدەوێرا و دایکیشم بە ئانقە سڕ یان هەر ئەقڵی پێی نەدەشکا و تاقەتی نەبوو ناوی ڕوقیەی خوشکم بێنێ. لە قوژبنی حەوشەکەوە و لەسەر هەسێڵەکە ئەژنۆی لەباوەش دەگرت و بیری دەکردەوە. لەسەر نوێژێ نزای دەکرد و جاری واش بوو لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد و من گوێم لێ ی بوو دەیگوت:"خوایە خۆت ئەو دوو منداڵەم بپارێزی. خودایە کچەکەم بەتۆ دەسپێرم، خودایە ئەگەر قەرارە بێ کچ بکەومەوە، لە پێشدا من بەرەوە..."

بەزەییم پێیدا هاتەوە. لێی چوومە پێش و پرسیم:"هیچ خەبەرێکت لە ڕوقیە هەیە؟"

گوتی: "نا، ئەوەندە نەبێ ماوەیەک لەوە پێش یەکێک هات و ئەم قورئانەی بۆ هێنام. لە پشتەوەی دەستوخەتی ڕوقیەم ناسییەوە کە پێشکەشی کردبوو بە من."

کونجکۆڵییەکەم هیچی لێ شین نەبۆوە. کێ، لە کوێ و چ ڕۆژێک؟ چ مانگ و سەعاتێک، کێ بوو، پیاو بوو یان ژن؟ هەر هەمووی بێ وەڵام مانەوە.

دایکم ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو و وای دەنواند کە هەرای گوندییانە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر چارەنووسی خوشکەکەم نابێ. بەڵام من بە پێچەوانەوە دڵنیا بووم کە ڕوقیە و لەچک بەسەرەکانی دیکە هەمووان پێرێکن و قو رئان بەدیاریناردن بۆ دایکم هێمایەکە، خوشکەکەم ویستوویەتی بە منی بدا بۆ ئەوەی باشتر مشووری خۆم بخۆم و تا زووە لەو گێژاوی مەرگە خۆم رزگار بکەم. بەتایبەتی ئەو ڕووداوانەی تا ئێستاش ئاژانس نەیدەتوانی پێشبینیان بکا و دەقەومان و هەمووانی مات و سڕ کردبوو.

تاقە کەسێکی لە هەمبەر ڕووداوەکاندا قورس و قایم وەستابوو و هیچ خۆی تێک نەدەدا، جەنابی شا بوو. فکر و زکری ئەو هەر ژیان و خۆشبژیویی خەڵکەکەی بوو. پێی وابوو ڕیفۆرمی زەوی و زار قورسترین و ئەستەمترین کارە. هەر ئەو دێهاتییانەی لە شاری کردوویانەتە هەرا و فەرتەنە دەبێ قایل بکرێن. شێلگیرانە فەرمانی دا، دەسبەجێ زەوی و زار بەسەر جوتیاراندا دابەش بکرێ. لە بری شارستانییە ناڕازییەکان و کرێکاران کە لە ژێر کاریگەریی کۆمۆنیست و مەلاکاندا دەیانکردە فیتنە و فەرتەنە، دەبێ جوتیارە ڕەسەنەکان بکەیە پشتیوانی خۆت. دەبێ بیانکەیە خاوەن زەوی. وام و پارەیان بدەیەی بۆ ئەوەی لە ماوەی پازدە ساڵدا قەرزەکەیان بدەنەوە. فەرموویان لە گوندەکان دامەزراوەی هەرەوەزییان دامەزراند و خۆی تاپۆکانی بەسەر گوندەکانی وڵاتدا دابەش کرد. بۆ ئاسانکاریی زیاتر، 6 مادەی شۆڕشی سپییان نووسییەوە و جێبەجێیان کردن. رایگەیاند، بێکاری نایاساییە. هەموو دارستانەکانی وڵات بوونە ملّکی گشتی. کرێکار لە داهاتی کارخانەکاندا پشکدار کران. "سپای دانش" واتە گەلەکۆمەکی بۆ زانین، پێک هات بۆ ئەوەی یاساکانی پەروەردەی زۆرەملی جێبەجێ بکرێ و زۆر شتی دیکەش. دواتر شتی دیکەش لەم شتانە زیاد کرا. نیازپاکیی حەزرەتی خاوەنشکۆ لەکەس شاراوە نییە. بەڵام ئەگەر هەموو ئەو ئەمر و ڕیفۆرمانە جێبەجێ نەکران، دیارە خەتای کۆمۆنیستەکان و ملّکدارە گەورەکان و مەلاکان بوو، کە لە هەموو جێیەک ملیان با دەدا و بەبێ ئەوەی خۆیان بزانن، وەک ملّە شارپەگەکەیان دەقرتاند.

زۆربەی ملّکدارەکان بە ویستی خۆیان، ملّکەکانیان بە دێهاتییەکان فرۆشت و پارەیان لە بانکەکان وەرگرت و لەبری ئەوەی لە پیشەسازییە تازەکاندا سەرمایەگوزاری بکەن، پارەکەیان ناردە بانکەکانی دەرەوە. چەند کەسێک لەو ملّکدارە گەورانە دواتر بوونە یەکێک لە ملیۆنەرە بەناوبانگەکانی ئێران. ئەوانە، ئەو کەسانە بوون کە توانییان سەرمایە بیانییەکان و پسپۆڕەکان بێنن و بە یارمەتیی سوپاییەکان دەستدرێژی بکەنە سەر سامانی خەڵک و مەلا زەمیندارەکانیش لەو پیلانەدا دەستیان لەسەر دەست دانەنا و هەوڵیان دا یاسا داپەروەرانەکان پووچەڵ بکەنەوە. چەند کەسێک لە زانایانی ئایین لە شازدەعەبدولعەزیم کۆ بوونەوە و نازناوی "ئیمامیان" لە ئیمام خومەینی نا.

ژمارەیەک گەنجی ناوبانگخواز، "کۆنگرەی مەزنی خەڵک"ـیان پێک هێنا و ریفۆرمی زەوی و زاریان بە ئامرازی پەرەپێدانی متمانەبەخۆیی نیشتمانی و گەشە و پێشکەوتن لەقەڵەم دا و، لە بن پەردەی پشتیوانیکردن لە جەنابی شادا، ویستیان خۆیان جڵەوی کاروبارەکان بەدەستەوە بگرن. بۆ پێت وایە "منافقین" و شەڕاشۆیەکان وازیان دێنا؟

چەند مانگان پاش ڕووداوەکانی جۆزەردان، قوتابییەکانی زانکۆی تاران ڕاپەڕین و ئەگەر چەند کەسێکیان نەگیرابایەن، لەوانەبوو کارەکە گەورە بێتەوە، بەڵام دەکرا ئەو هەرایانە بخەیە ئەستۆی کۆمۆنیستەکان و سووکیان بکەی. بەڵام لە جۆزەردانی ساڵی دواتردا چەند "حوجەتولئیسلام"ـێک لە شارە جیا جیاکاندا کردیانە هەرا و گیرانی ئەوان، وای کرد مەلاکانی دیکەش هەرای ناڕەزایەتییان بەرز بێتەوە.

ئیتر نەدەکرا بڵێی مەلاکانیش کۆمۆنیست و گوێلەمستی ڕووسەکانن. دەستەواژەی "مارکسیستی ئیسلامی"ـیان لەودەمەوە خستە سەر زمانان.

دوو سێ مانگێک بوو، دوو کەس کە لەمێژ بوو ڕایان کردبووە رووسیا و ئێستا گەڕابوونەوە نیشتمان، دیسان کرانە بیانوویەک ئەو هەرا و ژانەسەرانە بخەنەوە ئەستۆی کۆمۆنیستەکان. هەر دوو کیانیان کوشت. یەکیانیان گوللەباران کرد و ئەوی دیکەش وەک لە دکتۆر جیهانگیرم بیستەوە لە زینداندا نەخۆش کەوت و پێی مرد. یانی لە سۆنگەی ئەشکەنجەوە گیانی فیدا کرد. ئەو رووداوانە لە روانگەی ئاژانسەوە هیچ مەترسییەکیان نەبوو. سەرێکی دەچۆوە سەر ڕووسیا. هەر سی ئای ئەی و هاوکارە ئیسرایلییەکان باشاریان دەکردن. بەڵام ئەو شەپۆلەی لە یاسای پارێزراوبوونی سەربازە ئەمریکییەکان کەوتەوە، ئیتر نەدەکرا بدرێتە پاڵ ڕووسەکان. پینەیەک بوو بە شانی ئەوانەوە نەدەنووسا. بەپێی ئەو یاسایە سەرباز و دەرەجەدار و ئەفسەرە پایەبەرزەکانی ئەمریکا لە هەموو شتێک پارێزراو بوون (کەس بۆی نەبوو لێیان بپێچێتەوە) و ئەگەر تاوانێکیشیان کردبایە، ئەوا بەرپرسانی دادوەری و شارەوانی و ئیداری و یاسایی ئێران بۆیان نەبوو لێیان بپێچنەوە. بەرهەڵستکاران ناویان نا یاسای "کاپیتۆلاسیۆن". مەلا پلە یەکەکان و یەک لەوان ئایەتوڵا خامنەیی و شەریعەتمەداری لە رۆژی لەدایکبوونی حەزرەتی زەهرادا ڕاگەیەنراویان بڵاو کردەوە و ئەو ڕاگەیەنراوانە وەک هەورەتریشقە بە نێو خەڵکدا گەڕان. بازاڕی تاران رۆژێک داخرا. دووکانەکانیان داخست و کاسبکار رۆژێک دەستیان لە کار هەڵگرت. بەتایبەتی ئەو راپۆرتانەی دەماوەندی و خان عەلی و ئاهاری لەسەر کۆنفدارسیۆن کە دژی سیاسەتی دنیاخۆریی ئەمریکا و دەوڵەتەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ بوو، دەیانناردەوە، ئەوەندە توند بوون کە وەک خان عەلی دەیگوت، ئەوانیش نەیاندەتوانی بەرەنگاریان ببنەوە. ئاهاری کە لە کۆبوونەوەیەکی قوتابییاندا ویستبووی بەرگریی لێ بکا، دابوویانە بەر شەق و تێیانهەڵدابوو. دڵەڕاوکێی گشتی گەیشتە ئاستێک، کە چەند کەس لە نوێنەرە خۆفرۆشەکانیش لە پەرلەمان ناڕەزایەتییان دەربڕی و داوای روونکردنەوەیان لە دەوڵەت کرد.

سەرۆکوەزیرە گەنجە لووسکەڵە و تیفتیفەدراوە بێ ئەزموونەکە، کە پاش کۆنگرە ببووە سەرۆکوەزیران، هەڕەشەی لە پیرەپیاوە بەپرتەوبۆڵەکان کرد و بۆ ئەوەی چاوترسێنیان بکا، ئایەتوڵا خومەینیی دەرکرد و ناردییە تورکیا و تۆمەتەکەشی "هاندانی خەڵک دژی بەرژەوەندییەکانی نیشتمان و تەناهی و سەربەخۆیی و یەکپارچەیی وڵات" بوو.

ئەو هەواڵە لە رۆژنامە دەوڵەتییەکاندا بڵاو بۆوە. پاش دە رکرانی ناوبراو لە رێکەوتی 21ی خەزەڵوەری 1343ـدا، چەند سەرکردەیەکی سەربازی و کۆمەڵێک مەلا لە زیندان توند کران. کاربەدەستانی ئاژانس سەیر کەوتبوونە جموجۆڵ و هەستیان دەکرد خەریکە جڵەوی کاریان لەچنگ دەردەچێ. بشێوییەکە خەریک بوو شارەکانی دیکەشی دەگرتەوە. هەموو هێزە چەکدارەکان لە زۆربەی شارەکاندا خرانە سەر هەست [*]. هەر ئەو رۆژەی خەڵک بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی یاسای پارێزبەندیی سیاسیی سەربازانی ئەمریکی و دەربڕینی ناڕەزایەتی لە دەرکردنی ئایەتوڵا کۆ ببوونەوە، هەر ئەو رۆژە سەرۆکە چاونەترس و دەموڕاوێژ خۆشەکەی ئاژانس هەموو کاربەدەستانی خۆی لە تەلارە گەورەکەدا کۆ کردەوە و ناڕاستەوخۆ و لە پەناوە کارمەندەکانی خۆی هاندا بەربەرەکانێ بکەن. گۆیا ترسی ئەوەی هەبووە: جڵەوی کاروبارەکانی خەڵک بکەوێتە دەست سوپا.

لەو کۆبوونەوەیەدا دەیەویست پێشی بگرێ. دکتۆر جیهانگیر و دکتۆر بیژەن لە شانی راست و چەپم دانیشتبوون و هەردووکیان سەریان داخستبوو و جاروبارە بە دزییەوە سەیرێکی یەکتریان دەکرد. لە ریزەکەی پێش ئێمەوە سەرلەشکر دانیشتبوو. قیت و رەپ و سەربەرز. وەک بڵێی رووداوەکانی پێشبینی کردبێ و دەیەویست بە هەمووان بڵێ، کە ئەگەر بیکەنە سەرۆکی ئاژانس، دەتوانێ پێشی هەموو ئاژاوە و نائەمنییەک بگرێ. دکتۆر جیهانگیری بە منی گوت: "خوا نەکا جڵەوی کارەکە بکەوێتە دەست ئەو حەکەدارە، ئەگینا کەوڵمان دەکا." دەمویست قسەی لێ دەربکێشم. پرسیم: "چۆن؟" "دوایی پێت دەڵێم. ئاگات لە خۆت بێ. ئەم رۆژانە کەس رووت نەکەی."

---

[*] لەسەرهەستبوون لەبري "ئامادەباش"ي دانراوة. ضونكة ئةوةي لةسةر هةستة، بة ضركة ئامادةي كاردانةوةية. من ئةوةم بةلاوة كوردانةترة و لة "ئامادةباشي" داتاشراوي زرۆةكوردیم بةلاوة كوردیانةتر و جوانترة.

"چ جوابێکم داباوە؟ پرسیم

" چ بووە؟"

"زۆر خاوی. تا ئێستا سەروکارمان لەگەڵ چەند بەچکە کۆمۆنیستی گوێلەمست بوو، بەڵام ئەمجارە مەلا زیرەک و دنیادیتەکان خەریکن بەڕەمان لەبن پێی دەردەکێشن. گوێ بدەیە، بزانە دەڵێ چی. فێر بە. بە کارمان دێ."

پاش تەواوبوونی کۆبوونەوەکە، زۆر خۆمانە بن باڵیم گرت.

"چ باسە؟"

"بۆ راپۆرتی قوتابییەکان بە وردی ناخوێنییەوە؟ ئیتر ئێستا ئەوە رووسەکان نین کە بەڕەمان لەبن پێی دەردەکێشن. پێدەچێ ئینگلیز و فەرەنسا و ئاڵمانیش هاودەنگ بووبێن. ئەوان کەیفیان بەو یاسایە نەهاتووە. ئەی چ باس لە ڕوقیە؟"

"هیچ. تۆ چیت بیستووە؟"

"لەو رۆژانەدا چەند ژنێکیان گرتووە. چەند کچێکی هاوتەمەنی روقیەشیان لەگەڵە. بچۆ سەیری تۆماری لێپێچینەوەکەیان بکە. بەشکم هەواڵێکت دەست بکەوێ."

ناوی ژنە چارشێوبەسەرەکانم لێ پسی. نەیدەزانی یان نەیدەویست وەڵام بداتەوە. پێ ئەشدەچوو بیەوێ کڵاوم لەسەر بنێ.

گوتی: "هەموویان ناوەکانیان ئاوایە: سەکینە، ڕوقیە، زەینەب، توبا. خۆ ناسنامەکاینان بەدەست ئێمەوە نییە، لەوانەیە ئەوەی دوایی ناوەکەی ڕاست بێ."

پێی نەگوتم بۆچی وا دڵ لەدوایە. ئەستەم نەبوو پیاوێکی کەمئەزموونی وەک من لێی روون بێتەوە چ هەرایەکە. راستە، بەڵام من هێشتا هەستم نەدەکرد خۆم مەترسییەکم لەسەرە. وەپێوشوێنی مەسەلەی روقیە کەوتم.

چوومە سۆراغی لەچک بەسەرە گیراوەکان. یەکەوڕێ خۆم گەیاندە بەرپرسی لێپێچینەوەکەیان. هەر هەموویان چارەنووسی روقیەیان دەزانی. وای لێ تێگەیشتم، کە دکتۆرەکانی هاوکارم جا یان بۆ هاودەردی یان بە خەیاڵی ئەوەی تووشی بەڵایەکم بکەن، پێیان گوتبوون روقیەی خوشکم بزرە. پەروەندەکانیان دامێ. لەو کاغەزانەوە بەجوانی بۆت دەردەکەوت کە ژنان و کچانی تازەکار و ناشی چەند سەعات و رۆژان قسەیان درکاندووە. دیار بوو کە بە تێهەڵدان و ئەشکەنجە و جنێو و جەزرەبە وەقسەیان هێنابوون. بەڵام ئەو ژنانە لە ئیمانەکەیان زیاتر هیچیان پێ نەبوو. پێوەندییان بەکەسەوە نەکردبوو. بە هاندانی مەلاکانی گەڕە ک بەشداری ئەو خۆپێشاندانە ببوون. "ئاغا فەرموویانە برۆن، سەوابی هەیە." لەوە زیاتر هیچیان نەبوو دانی پێدا بنێن. ناوی مەلاکانی گەڕەکیشیان نەدەزانی. زیاتر لە 25 کچ و ژنی لەچک بەسەر و چارشێوبەسەریان گرتبوو. بیست کەسێکیان پاشی دوو رۆژان بەردابوو و وایان دانابوو چوار پێنج کەسەکەی دیکە (هەڵبەت پاش ئەوەی بە پێی توانایان پارەیەکیان لێ وەرگرن" ئینجا بەریان بدەن. چەند رۆژان بەیانی تا شەوێ خەریکی خوێندنەوەی کاغەزەکانی ئەوان بووم. هیچم دەست نەکەوت. زۆر بە وردی ئەو شتانەم کە لە ماڵەکەی توبایانەوە هێنابوون، پشکنی. وێنەی کۆڕێکی شینگێڕی بۆ ئیمامەکانم دەست کەوت کە تێیدا چەند ژنێکی چارشێوبەسەر و چەند پیرەپیاو دیار بوون. تەنیا شینگێڕەکە دیار بوو و ئەوانی دیکە هەموو پشتیان لە کامێراکە بوو. تەنیا چارشێوە رەشەکانیان. بەو حاڵەشەوە پێم وابوو دەبێ یەکێک لەوانە روقیە بووبێ. دیارە لە خەیاڵێک بەولاوە نەبوو. بەڵام منی نوقمبوو بە شوێن چڵەگیایەکەوە دەگەڕام دەستی پێ بگرم و لە گێژاوە خنکێنەرەکان خۆمی پێ رزگار بکەم. ئەگەر شوێن پێیەکی روقیەم دەست بکەوتایە، هەر ئەودەم قۆڵم لێ هەڵدەماڵی و خۆمم لەو بەڵایە رزگار دەکرد کە لەوانەبوو هەموومان تێدا بەرێ. لەو هەمووە پرسیار و گەڕان و پشکنین و پەروەندەخوێندنەوەیە، بەڵگەیەکم دەست نەکەوت خۆمی پێ بگرمەوە.

چەند مانگانی بەسەردا هات. هەر لە گێژاوێکدا بووم و نیگەران. وا هەڵکەوت بۆ سەرانسۆیەکی سێ ئازیزەکەم:
"ئاهاری و خان عەلی و دەماوەندی بچمە ئەورووپا. ملم نەدا هێشتا ئەوەندەم کۆ نەکردبۆوە کە بتوانم ماوەیەک لە ئەورووپا خۆم راگرم. دەمزانی دکتۆر جیهانگیر بەردەوام سەردانی بانکی دەکرد و سەرمایەکەی خۆی دەکردە دۆلار فرانک. جەنابی "وەکیل باشی بیلمز" * ئێستا هاموشۆی بانکی دەکرد و حیسابی هەبوو و لاسایی گەورانی دەکردەوە.
بەڵام من هیچم نەبوو. هەمبوو و نەمبوو ترۆمبێلێکی شەق و شڕ و خانوویەکی چوار ژووری و دنیایەک قەرزباریی بانک.
تازە نێردرابوومە باخی نیاوەران. خەرجی مانگانەی دوو منداڵەکەشمم کەوتبووە سەر شان. ئیتر هیچم نەبوو بیکەمە دۆلار. خۆ بێت و پێم گەیشتبایەتە فەرەنگ، خۆ نەدەهاتمەوە. هاوکات فکری سەفەری ئەورووپاش بەری نەدەدام. پاش راپەڕینەکەی جۆزەردان و چڕبوونەوەی چالاکیی قوتابیەکان پێشنیار بە منیش کرا کە بۆ تاوتوێکردنی کاروباری ئەوان بچمە ئەڵمان. بەڵام من قبووڵم نەکرد و گوتم، وا باشترە ئەڵمانی زانێک بنێردرێتە ئەو ناوەندی تێکدەرییەی قوتابییەکان. نەمدەزانی خەنیمە ئاشکرا و نادیارەکانم دەیانەوێ هەڵمدێرن یان ئەوەی کە سەرکەوتنم لەو کارانەدا کە پێیان دەسپاردم، لە سۆنگەی خزمەتی راستگۆیانەمەوە، هەر لە قۆڵبەستکردنی مامۆستایان لە زانکۆوە بگرە تا دەگاتە بوون بە ئامرازی دزیی ئەوانی دیکە و رووگەشبوونم لە لای مودیرە یاخییەکە و دەستەمۆکردنی دوو قوتابی کە ئێستا ببوونە دوو بەردەستی لەکڵ دەرهاتووی ئاژانس لە نێو قوتابییەکانی ئەورووپادا، هەموو ئەو شتانە وای لە سەرکردەکان کردبوو بۆ ئەرک و لێپرسراوێتیی قورستر بێنە لای من.
خۆ ئەگەر ئەو روقیە رشکنەی خوشکم نەبوایە من ئێستا بۆخۆم پیاوێک بووم و دەمتوانی لە لەندەن یان لۆس ئانجلێس کەشم و نەشمێکم هەبێ. هاوارە لە من. خۆشەویستی چیی بەسەر هێناوم و بۆ کوێم دەبا.. بە لاقێکی شەل و قەڵەمێکی شکاو، دەبێ هەر چاوم لە درزی دەرگا بێ، کە یەکێک وەڵامی نووسراوی پڕ لە هەڕەشەم بداتەوە و ئاو و دۆیەکم بۆ بێنێ کە سەکەت نەبم.
پاش رووداوەکانی جۆزەردان و هات و هەرای "عولەما"، هەموو رۆژێ سەلکەبزووتەکان سەریان هەڵدەدایەوە و لە هەر تاقمێکەوە کە هەرا هەڵدەستا، ئاژانس دەیزانی چ هەڵەیەکی کردووە و لە راوەدوونانی کۆمۆنیستەکاندا زێدەڕۆیی کردووە و دوژمنە راستەقینەکەی خۆی کە لە قووڵایی کۆمەڵگەی ئێراندا بووە، بە کەم گرتووە. شۆفیر تاکسییەکانیش مان دەگرن و ئیتر لە زیندان و ئەشکەنجە ناترسن. سوپاییەکانیش بە مەبەستی حەیابردنی ئاژانس، غیرەت وەبەرخۆیان دەنێن کە بە ئاشکرا لە دادگای سەربازیدا بەرگری لەو بەرهەڵستکارانە بکەن، کە بەخۆیان دەڵێن شۆڕشگێڕ. لە هەمووی خراتپر، کوژرانی سەرۆکوەزیرانە تاسولووسەکە بوو، کە چەند رۆژێک بەر لەوەی ئاهاری و خان عەلی و دەماوەندی خۆیان بگەیەننە پلەی یەکەمی پەیژەی سەرکەوتن و لەسەر مەسەلەی کاپیتۆلاسیۆن، یەکەم رۆژی رێبەندانی 1343 فیشەکێکی لێ درابوو. ئەو فیشەکە لە دڵی ئاژانس درا. ئەوان، ئەویان گەیاندە ئەو پۆستە و ئەوەش سزای ئەوە بوو کە بەگژ پیر و پاتاڵەکانی پەرلەماندا هاتبۆوە.
دادگا سەربازییەکان بۆ شوێنەونکە، بەدوای یەکدا بە تۆمەتی بەشداربوون لە پیلانی کوشتنی سەرۆکوەزیر و رێکخستنی راپەڕینی چەکدارانە و سیخوڕی بۆ بێگانەکان زیندانی تاهەتایی و سێدارەیان بۆ چەند ئەفسەرێک دەبڕییەوە.
دکتۆر جیهانگیر خۆی بەر لەوەی ئەو کابرا تەڕپۆشە ببێتە سەرۆکوەزیر، بە منی گوت: "خەتای ئێمەیە." ئەو بەگزادەیە، تاقمێکی رێک خستبوو کە دەیەویست کڵاو لەسەر حەزرەتی خاوەنشکۆ بنێ و جڵەوی کاروبارەکان بەدەستەوە بگرێ. ئاژانس بەر لەوەی ئێمەی سوپایی خۆ تێهەڵقورتێنین، هەر لەودەمەوە کە قوتابی بوو لە ئەورووپا بۆ ئەو کارەی پاڵاوتبوو. بەڵێ، خەتای ئێمەیە، خۆ گێرە بە هەموو گایەک ناکرێ...."

*تەوسيَ◌كة بة دكتؤريدا دةدا. وةك بل◌َي◌َي ئةو كةرةشم لي◌َ بووةتة بنيادةم

باقیی قسەکەی نەکرد. دەیەویست بڵێ، بەختیار ڕۆیشت و خۆی نەگرت. ئەگەر ئەو مابایە، ئەم ڕۆژانەمان نەدەدی.

لەوەتەی حەزرەتی خاوەنشکۆ بەختیاری لێ خستبوو، لێرە و لەوێ دەمبیستەوە کە زۆربەی سەرکردەکانی ساواکیان لە شارەکان و لە ئەورووپا و ئەمریکا لە سەر کار لادەدا یان پلەیان کەم دەکردنەوە. بەڵام ئەو شوێنگۆڕکێیە بەلای هاوکارەکانی منەوە ئاسایی بوو. بڵێی و نەڵێی هەموو وەزارەتخانەیەک خۆبەخۆیی و خزم خزمێنەی تێدایە. دەی بۆچی لە ئاژانسدا نەبێ؟ وردە وردە دەبیسرایەوە کە ئەم لێخستن و دانانانە، لایەنێکی سیاسییشی هەیە و لە پشت پەردەوە شتێک هەیە کە بنیادەمێکی وەک من بەو چەند ساڵە پێشینە خزمەتەوە و ئەویش لەو ئاستەی خوارەوەدا نەیدەتوانی تێی بگات. لێرەو لەوێ کەسانێکی وەک جیهانگیر کە لەگەڵ بەختیاردا لە سوپاوە هاتبوون و هەر بەراستییش گوێلەمستی ئەو بوون، بە ئاماژە دەیانگوت، کە تەنیا ئەوانەی لەکڵ دەرهاتوون لێیان ڕوون بوو چ ئاگرێک لە بن خۆڵەمێشەکەدایە. بەتایبەتی کە من وێڕای خوێندنەوەی پەروەندەی قوتابییەکانی ئەورووپا "با ئەوەش بڵێم وردە وردە لەکاروباری قوتابیاندا دەبوومە پسپۆڕ"، دەمبیستەوە و دەمخوێندەوە کە تیمسار بەختیار لە ئەورووپا و ئاسیا دەستی لەسەر دەست دانەناوە و دژی بەرژەوەندییەکانی وڵات خەریکی پیلان و دەهۆیە. تەنانەت مقۆمقۆ و مشتومڕ کەوتبووە نێو ئەو قوتابییانەشەوە کە ئاژانس دایناببوون. هاوینی ساڵی 1344، مانگێکم ئیجازە وەرگرت و چوومە سوویسرا.

لەپێشدا چوومە ژنێڤ و خۆمم بە "مەملووک" ناساند، کە لە بانک و ژووری بازرگانی و کۆمپایاکانی بازرگانیدا چاوی بەسەر حیسابی دارایی حەزرەتی خاوەنشکۆوە بوو و لەو کانتۆنەشدا سەرۆکی ساواک بوو. ئەو          م لە سۆنگەی سەرپەرشتیاریی ئەو سێ گەنجەوە کە تووشی ساواک کرابوون، دەناسی. دەسبەجێ زانیم تاوێکردن و پێڕاگەیشتن بە کاروباری کۆنفدراسیۆن کە لە هەموو جێیەکەوە دەگەیشتەوە نوێنەرە گەڕۆکەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ لە هەموو ئەورووپادا، دەخرێتە بەردەستی ئەو. هێشتا نەگەیشتبوومێ، دەستی کرد بە گلەیی و گازندە.

"کاکە، ئەو سوورەگوڵانەی تۆ کە بەردەوام لێرە دەخولێنەوە. خۆ بێت و لەوانەمان ویستبایە، سەدی دیکەشمان لەبەردەست بوون. ئەو هەمووە خەرج و موخاریجە تۆ خستووتتە ئەستۆی ئێمە. ئاخر خۆ دەبوو دەرسێکیش بخوێنن. یەکێکیان، ئەو ئاهارییە ئەوە شەش ساڵە لێرە بەرەڵا بەرەڵا دەخولێتەوە. هەڵبەت با ئەوە بڵێم کە ئەمەیان خۆم ڕامکێشا. بەڵام ئەو دوانەی دیکە، دەستپەروەردەکانی تۆ لەوی دی باشتر نین. دیارە خزمەت دەکەن و ئێمە زانیاریی زۆرمان لەسەر ڕەوتە نێوخۆییەکانی کۆنفدراسیۆن و ناکۆکییە ناخۆییەکانی نێوان حیزبییەکان و بەرەی نیشتمانی و چەپەکانی دیکە هەیە، کە ئەم فەرخە بەگانە بۆیان کۆ کردووینەوە. بەڵام ئەو زانیارییانە ئەوانیش نەبوایەن، خەڵکی دیکە دەیانهێنان..."

تا دڵ دەخوازێ، خراپەی خان عەلی و دەماوەندیی گوت. ئاوێکی پاکی بە دەستمدا کرد. نەمزانی دەیویست هەڵمخلیسکێنێ، یان هەر بەراستی لە تەوەزەلی و کاری سەرسەرییانەی ئەوان پڕ و تووڕە بوو. من بڕیارم دا بچمە بنج و بناوانی شتەکە و سووری بکەمەوە. بەڵێنم دا دەسبەجێ پێیان ڕابگەم و بێت و بۆم ڕوون بێتەوە تەمبەڵ و کەمتەرخەم بوونە، تەمبێیان بکەم.

بەپێچەوانەوە، زۆری بە کەسێکدا هەڵگوت بەناوی ئازمایش، کە زیرەکە و خۆی بە ئاو و ئاگردا دەکا و لەهیچ ناپرینگێتەوە.

پرسیم:"ئازمایش کێیە؟" جا وەبیرم هاتەوە کە ئەو دەمی قوتابییەکان بانگهێشت کرابوونەوە ئێران، لە تاران دیتبووم.

گوتم: "هەر ئەو کەسە نییە کە لە شەرقەوە ڕای کردووە و هاتووەتە ڕۆژاوا؟"

خۆی بوو.

چەند ڕۆژێک لە ژنێڤ بووم و لەوێوە چوومە پاریس و لە هوتێل "پریزیدان" بانگی خان عەلیم کرد.

ئیتر زانیبووی بووەتە ساواکی و خەریکە خزمەتی پتەوکردنی رژیمی پادشایەتی دەکا. زۆریش بەتین و گوڕ بوو. وەک حیزبییەکی تۆخ خۆی دەناساند و بەردەوام لایەنگری پلاتفۆرم بوو. بەڵام ئەوەندەش نا کە لایەنگرانی بەرەی نیشتمانی و تاقمەکانی دیکە لە خۆی زویر بکا. ئەو زانیارییانەی لە بارەی کۆنفدراسیۆنییەکانەوە پێی دام، سەرنجڕاکێش بوون. یەک لەوان ئەوەی کە رۆژ بە رۆژ ژمارەی کچەکان زیاتر دەبن و ئەوانە لە سۆنگەی هۆگربوونیانەوە بە قوتابییە هاوتەمەنەکانی خۆیان و لە ئاکامی ئەو ئازادییەی پاش دوورکەوتنەوە لە بنەماڵەیان وەدەستیان هێناوە، زۆر بە ئاسانی رادەکێشرێن، هەم لە بواری سیاسی و هەمیش لەبەر بارودۆخی ژیانیان. زۆر وا هەبووە کچ و کوڕێک پێکەوە دەچنەوە ماڵەوە و پێکەوە دەخەون. چەند کچێک لەوانە ئێستا ئەندامی چالاکی کۆنفدراسیۆنن و خۆشیان خەریکە دەبنە بەرپرس.

سەرنجڕاکێشترین خاڵ لە راپۆرتەکەیدا باسی کچێکی کردبوو بەناوی مەلەکە، کە شەش مانگ بوو لە نێو قوتابییەکاندا دەرکەوتووە و دەڵێن لە فەلەستینەوە هاتووە. دەسبەجێ کەوتمە بیر روقیە. نەکا هەر لە ئێران نەبێ و لە فەلەستین بژی. چوومە بنچ و بناوانی مەسەلەکەوە. چووزانی؟ وێنەیەکیم پێشان بدە. لە رەنگی روخسار و چاوی کچە فەلەستینییەکەم پرسی. چما لە فەلەستین چ باسە؟ چەپەکانی ئێران لە فەلەستین چ دەکەن؟

چیم بیستبوو و چیم بۆ دەرکەوتبوو لە بارەی ئەوەی کە هەموو ناڕازییەکان پەنا دەبەنە بەر فەلەستین و لە بارودۆخێکی زۆر سەخت و ئەستەمدا سەربازییەکەیان دەکەن و فێری شەڕی ناوخۆیی و دەستەوئێخە دەبن و بە راهاتوویی و گورجوگۆڵ دەچنە وڵاتانی عەرەب و ئیسلامی هەمووم یاداشت کرد. بە رای خان عەلی، خۆ ئەگەر راست بێ کە یەکێک لە گەنجانی قەشقایی وازی لە دەرسەکەی هێناوە و چووەتەوە مەمەسەنی بۆ ئ ەوەی جەنگی پارتیزانی هەڵاییسێنێ، بێ و نەبێ کاری ئەو کچە فەلەستینییەیە. دیارە قسەکانی خان عەلی زێدەبێژییشیان تێدا بوو. من زیاترم لێ کۆڵییەوە و گەیشتمە ئەوەی کە کچە فەلستینییەکە دایکی ئێرانییەو باوکیشی پیاوێکی فەلەستینییە کە بۆ خوێندنی پزیشکی هاتووەتە ئەورووپا و لە هیچ شارەزاییەکی لە جەنگ و شتی پارتیزانی نییە. بەڵام ئەو فەلەستی نیە زەینی شێواندم. لەوەندە زیاتر ئەو باسەم لەگەڵ خان عەلی نەکردەوە. تەنیا بە زمانی بەرپرسێک لەگەڵ بەردەستەکەی رامسپارد کە تا دوو حەفتەی دیکە راپۆرتێکی تێروتەسەل لەسەر خوێندنەکەی خۆی لە بواری فیزیادا ئامادە بکا. تۆزێک راچڵەکی. بەڵام لەبزی فەرماندەرانی من دەرفەتی ئەوەی نەداێ قسەی لێ بکا.

"من دەچمە سەفەر و تا دوو حەفتەی دیکە کە دێمەوە، دەبێ بە وردی پێم بڵێی لەو چوار ساڵەدا کە یەکترمان ناسیوە، دیپلۆمت لە چی و چی گرتووە. ئەم راپۆرتە بۆ کەڵکوەرگرتن لە تۆ لە ئێراندا زۆر زۆر پێویستە."

ئەوەم گوت و رۆیشتم و نەمگوت کە دەچمە میونیخ، بۆ ئەوەی مەسەلەکە، لەگەڵ هاوڕێ لەمێژینەکەی وی باس بکەم.

ئەو دەماوەندییە، تووتکەسەگێکی رووهەڵماڵراو بوو، لە وێنەی نەبوو. چاوقایم و بێ حەیا و بێشەرم. وەک هەنگ لەم چڵەوە دەفڕییە لقێکی دیکە. لە هەموو جێیەک چزووی خۆی دەوەشاند و شیلەی دەمژی. لەو چوارساڵەدا، لەو دەمەوە کە بەردەوام مووچەی لە ئاژانس وەردەگرت، تاقەتی ئەوەی نەبوو لە شارێک بگیرسێتەوە. لەپێشدا لە پاریس بوو و دەیەویست یاسا بخوێنێ. لە سی ساڵ لەوەپێشەوە هەموو ئەوانەی بەرزەفڕ و خۆپەرست بوون حەزیان دەکرد بچنە نێو دەزگای دادوەرییەوە و پێیان وابوو بە خوێندنی ماف خۆیان دەگەیەننە دەزگای داد و لەوێشەوە دەچنە وەزارەتی دەرەوە و ئیتر دەراویان بۆ خۆش دەبێ کە پلە و پایەی بەرز وەرگرن. بەڵام پاریس رەوگیری کرد و خۆی گەیاندە لیۆن. لەوێ ملی دایە خوێندنی ئەدەبیاتی فەرەنسا. سەیری کرد فەرەنسییەکەی وا نییە بتوانێ دیپلۆمێکی پێ وەرگرێ. بۆ ئاژانس فەرقێکی وای نەبوو، هەر جێیەک قوتابیی ئێرانیی لێ بوایە، بۆ کەسانی وەک دەماوەندی و خان عەلی مەئموورییەت بوو. چووە کراتزی نەمسا، بۆ ئەوەی مانگە پشووەکەی ساڵانەی خۆی تێپەڕێنێ. بەو چاو و برۆ رەشەوە و بەو سەر و کاکۆڵە لوولەیەوە دڵڕفێن بوو و توانیی کچێک راو بکا و دووگیانی بکا. لەسەر پێداگریی باوکی کە لە

شاپەرستیدا بەناوبانگ بوو، لەگەڵ کچە زەماوەندی کرد و ئیتر گیرسایەوە و لەگەڵ ژنەکەی هاتە میۆنیخ بۆ ئەوەی لەوێ لە قوتابخانەیەکی تایبەتدا کە بە ئاسانی دیپلۆمەکەی دەدا بواری بیناسازی بخوێنێ و بە نازناوی ئەندازیارەوە بێتەوە ئێران. ژنەکەی تەڵاق دا و منداڵەکەی دا بە دایکەکە و خۆی لەو وڵاتە مایەوە.

ویستم تۆزێکی لێ توند بکەم. سەیرم کرد، شیرم نایبڕێ. لە پێشدا هەر پێم سەیر بوو. سەیرم کرد ئەو هەتیوەی لەسەر مانیتۆفۆنێک مل بەر ملی هاوکارەکەی دەنێ و من لە کۆڵانێکەوە هێنابووم، خەریکە بەگژمدا دێ. بە بابی دەخوڕی کە یەکێکە لە نزیکەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆ و کێی پێخۆش بێ، لەدەستی دێ ملی بشکێنێ.

زۆری نەبرد کە تێگەیشتم ئیتر سەری بە شوێنی دیکەوەیە و هەڕە و گوڕەشەی من بە پوولێکی ڕەش ناکڕێ. هەر بەپێویستی نەزانی ڕاپۆرتی کارەکانی خۆیم بداتێ. دەیگوت و بە زمانی بێ زمانی تێی دەگەیاندم کە خەڵکێکی لەسەرووی منەوە چاویان بەسەریەوەیە و ئەو هیچ بە پێویستی نازانێ شتە نهێنییەکان بخاتە بەردەستی من کە لە پشووم.

مەسەلەکەم بۆ مەملووک گێڕاوە. دیتم ئەویش بەخۆی هەڵدەڵێ. ئەو ڕێگەیە نەیدەگەیاندمە ئامانج. تەلەفۆنم بۆ دکتۆر جیهانگیر کرد و وەک لێکۆڵەری وەزارەتی ڕۆشنبیری خۆمم ناساند و لە نووسینگەی باڵیۆزی گەڕۆکی پادشایەتی کە بە کاروباری قوتابییان ڕادەگا، لێم ڕوون بۆوە کە هەندێکیان کەین و بەینەیەکیان لەگەڵ تیمسار بەختیاردا هەیە کە ئەودەم لە ژنێڤ دەژیا و ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلم لە چالاکییەکانی ئەو ئامادە کرد، کە پێم وایە بۆ کاروباری ئایندەم زۆر باش و بەسوود بوو.

گەڕامەوە تاران و بەبێ ئەوەی هیچ شتێک بە دکتۆر جیهانگیر و دکتۆر بیژەن بڵێم، خۆم گەیاندە جێگری سەرۆکی گشتیی ئاژانس و ڕاپۆرتێکی تێر و تەسەلم لە بارەی تاقمی لایەنگری بەختیار بەتایبەتی لە نێو قوتابییەکاندا ئامادە کرد و ڕوونم کردەوە کە چۆن بانگەشە سیاسییەکان خەریکن وردەوردە دەبنە خەباتی چەکدارانە لە ئەورووپا و، ئەوەی لەبارەی هەوڵی تەقاندنەوەی کۆنسولگەریی میونیخ لە زمانی خان عەلی و ئاهارییەوە وەدەستم کەوت، تۆزێک ترش و خوێم کرد و وام نیشان دا کە من نەمهێشتووە ئەو بۆمبەی خەریک بوو خانەی ڕۆشنبیریی پاریس هەڵتەکێنێ، بتەقێتەوە. جەنابی جێگر بەدەم قسەکردنەوە لەگەڵ من، پەروەندەکەی هەڵدەداوە و لە منی دەپرسی کە خوێندنەکەم گەیوەتە کوێ و هانی دەدام دکتۆراکەم وەرگرم. کورتی ببڕمەوە خۆمم لەلا شیرین کرد و ئیتر پێگە و ئیعتباری من لەوێ لە پێگە و پلە و زانیاری و مشوور و کۆڵنەدانی ئەو نوێنەرە سوپاییانە پتر چووە سەرێ. یەکەم ئەنجامی کاری من ئەوە بوو کە مەملووک کەوتە بەر ڕق و قین و ئیتر نەگەڕاوە ئێران و بە کۆڵێک پارەی پاشەکەوتەوە پێچایەوە و چووە ئەمریکا و، جا چونکە شێوازی کارکردنەکەی فێر بووم و ئەویش دەزانێ بە چ فێڵ و دەهۆیەک لە عەرزم داوە، لەو کەسانەیە کە دەبێ دەمی شیرین بکا و وامان داناوە مانگانە بڕەپارەیەک بخاتە سەر حیسابەکەی من لە بانکی سوویسرا و خواهەڵناگرێ دەبێ بڵێم تا ئێستا زۆر ڕاستگۆیانە ئەو ئەرکەی ڕاپەڕاندووە.

یەکێک لەو ئیمتیازاتانەی پاش چاوپێکەوتنم لەگەڵ جەنابی جێگر وەرمگرت ئەوە بوو کە ڕێگەم درا پەروەندەیەکی زۆر زۆر نهێنیی سەرۆکی گشتی بخرێتە بەردەستی من. مافی ئەوەم هەبوو بە ئیجازەی جێگری ئاژانس هەموو پەروەندەیەک تاوتوێ بکەم و پاش ئەوەی جێگر ڕازی بکەم، بڕیار بدەم و دەست پێ بکەم. تەنانەت پەروەندەی خۆم و ڕوقیەشم خرایە بەردەست. بۆ بەدبەختی دەبێ بڵێم، لە پەروەندەکەی خوشکمدا جگە لەوەی خۆم پێم دابوون هیچ شتێکی سەرنجڕاکێشی تێدا نەبوو. ئەو دەمەی ڕێگەیان دام بە پەروەندەی ئەفسەرەکاندا بچمەوە، تازە حەوت ساڵ و شتێک بوو هاتبوومە نێو ئاژانسەوە. ئاوا ڕێگەیان بە هەموو کەسێک نەدەدا. من ئەودەم 32 ساڵان بووم، بەڵام شاکاری من لە زانکۆ و ڕاپۆرتەکەم لەبارەی چالاکییەکانی بەختیار وای لێ کردم، هەندێ ڕقیان لێم بێتەوە و ئیرەییم پێ بەرن و هاوکات بەرپرسانی ئاژانسیش متمانەم پێ بکەن. لە سەردەمی سەرۆکایەتیی بەختیاردا، ئاژانس ناوەندی دەسەڵاتی

هەموو وڵات بوو، یانی دەکرێ بڵێین حوکمی ئاژانس لە بڕیاری حەزرەتی خاوەنشکۆش بە بڕشتتر بوو. هەموو ئیدارە و وەزارەتخانە و کۆمپانیاکانی بازرگانی و بانکەکان لەبەر دەستی ئەودا بوون. هەر ئەوەندە بەس بوو یەکێکی وەک من بە حاستەم بڵێ فلانە سەربەرێوەبەر بەرهەڵستکارە، زۆری نەدەبرد رسق و نانی کابرایان سواری بای شەماڵ دەکرد. کەسی وەک من زۆر بوون، یانی ئاژانس ــ یان باشتر بڵێم وەک شێخۆ کە دەیگوت هەواڵی لەو چەشنەی لە رادیۆ بیانییەکانەوە بیستووە ــ پەنجاهەزار ئەندامی هەبوو. بەڵام ئەوە درۆ بوو. حەزرەتی خاوەنشکۆ خۆی رۆژێکیان فەرمووی، کە ئاژانس دووهەزار ئەندامی هەیە، جەنابی سەرۆکوەزیر باسی هەزار و پێنجسەد ئەندامی کرد. مەبەستی کارمەندە فەرمییەکانی ئاژانس بوو. بەڵام ژمارەی سیخوڕەکان دیارە زۆر زۆر لەوە زیاتر بوو. من خۆم کە لە لەندەن بووم، بەلانیکەمەوە سێسەد بەردەستم لە نێو قوتابییەکان و ئەو مامۆستایانەدا هەبوو کە بۆ خوێندن هاتبوونە ئەورووپا و ئەوانەی لە بانکەکان و کۆمپانیای فرۆکەوانی و هێڵی گەشتیاریی ئێران و تەلەفزیۆنی ئێران و کۆمپانیاکاندا کاریان دەکرد و ئەو بەرەڵایانەی بە خۆیان دەگوت بازرگان. بێ جگە لەوە، هەر دەزگەی باڵیۆزی گەڕۆک لە ژنێڤ بە لایەنی کەمەوە هەزار قوڵەچۆماغی هەبوو.

لە پەروەندەی ئەفسەرەکاندا خوێندمەوە کە لاڕێبووەکان و کۆمۆنیستەکان دەنگۆیان وا دادەخست کە سەرۆکی ئاژانس بۆخۆی خانوویەکی یەک ملیۆن دۆلاریی دروست کردووە و لە ماوەی چەند ساڵێکدا پارەیەکی زۆر و زەوەندی کۆ کردەوە و لە سەرانسەری ئێراندا ملکی کڕیووە و لە ژنێڤ و کالیفۆرنیا خانووی هەیە. لەو بارەیەوە، لە کۆڕێکی تایبەتیدا قسەم لەگەڵ دکتۆر جیهانگیری کرد. گوتی:

"ئەو قسانە هەموو درۆ و بوختانی دوژمنانی ئێرانن. وای دانێ راستیش بێ، هەقی خۆیەتی. دەبێ وڵاتێکی پانوبەرینی وەک ئێران بەرێوە ببات. ئێمە هەر کامە و پشکێکمان لەو وڵاتەدا هەیە. ئەرکی سەرۆکەکەمان لە هەموومان قورسترە. هەر لاقی خوار دابنێ، سەرەنگرێ دەبێ. کەوابوو دەبێ هەق و مزیشی زیاتر بێ."

وەبیرم هاتەوە رۆژێک لە کن ملازم فەرزان کە ببووە سەرۆکی کە لانتەری، لەگەڵ روقیە قسەمان لێک هەڵبەزییەوە. یانی روقیە و فەرزان کەوتنە چەلەحانێ. باسی حکوومەتە تازەکە بوو کە دەیەویست دەست بە چاکسازی بکا و پێش بە گەندەڵی و بەرتیلخواردن بگرێ و لە جێیەک گوتبووی، دەوڵەمەندەکان دەبێ لە تەمەنێکی خۆیان دوو قڕانی بدەنە هەژاران، ئەگینا وڵات بەرێوە ناچێ. ئەم سەرۆکوەزیرە لە سەرەتاکانی ساڵی 1341ـدا هاتە سەر کار و زۆری نەخایاند، پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە کە زۆربەی نوێنەرەکانی ملکدارە گەورەکان بوون. بۆ ئەوەی پێش بە چاکسازییەکانی وڵات نەگرن. دەی دیارە ئەو ئاغایانە دژی حکوومەتە تازەکە بوون و وایان بڵاو دەکردەوە کە ئەمریکییەکان (بۆ ئەم کارە) زۆر بۆ حەزرەتی خاوەنشکۆ دێنن و پشتیوانیی لێ دەکەن.

وەزیرێکی ئەم کابینەیە هەنگاوێکی پتر هەڵێناوە و گوتی:"ئەگەر سەرنەکەوین و نەتوانین چاکسازییەکانمان بە ئاشتەوایی بکەین، لە ئایندەدا وڵات سەرلەبەر دەتەقێتەوە."

هەر ئەو قسانە بوون کە دواتر "شۆڕشی سپی"ـیان لێ کەوتەوە.

روقیە گاڵتەی بە چاکسازی دەکرد و دەیگوت: "باش ئەو خەڵکە بەکەر دەزانن. ئاخر تا ئێستا ئەو ئاغایانە خێرێکیان بە خەڵک گەیشتووە تا لەمەودوا پێی بگا؟"

فەرزان زیاتر پارێزی دەکرد. وای تێگەیشتم کە ئەو زۆر هیوای بە سەرۆکەکەی ئاژانس هەبوو و لەسەر ئەو باوەڕە دا بوو کە ئەگەر هەموو کاروبارەکان بدرێنە دەست وی، دڵنیایە چاکسازییەکە سەردەگرێ.

من لە هەر کوێ توانیبام ئەم مشتومڕانەم بەتینتر دەکرد. مەبەستم دیارە ئەوە نەبوو سیخوڕی بەسەر ماڵی خۆمانەوە بکەم. باوەڕم وابوو دەبێ بزانین ئەو خەڵکە دەراوی زاریان چۆنە و چۆن بیر دەکەنەوە و، فەرزان کە ئیتر کەم و زۆر دەیزانی من چ کارەم، خۆی لە قسەکردن نەدەبوارد و قسەی خۆی نەدەخواردەوە. بەتایبەتی ئەو شەوەی کە

دایکم قسەیەکی لە زاری دەرپەڕی زۆرم بەلاوە گرینگ بوو. گوتی: "ئەو جەنابی فەرزانە پیاوێکی زۆر باشە. عەیبێکی هەیە بەختیاری زۆر خۆش دەوێ و لەخۆڕا ئەوەندەی پێ هەڵدەڵێ و باسوخواسی سیاسەت دێنێتە ماڵی ئێمە."

پرسیم: "یانی چۆن دایە؟"

گوتی: "زۆری کەیف بە حەزرەتی خاوەنشکۆ نایە. حەز دەکا هەموو شتێک بەدەست بەختیارەوە بێ."

فکر هەڵیگرتم. لە پەروەندەی ئەفسەران و لێپێچینەوە و لێکۆڵینەوە لەوانیش، باسی کۆماری دەکرا.

جا هەر بەراستی ئەودەم بەختیار لە رۆژنامەکانیشدا تەواو ببووە دەنگێکی دیار و لە هەموو جێیەک باس باسی ئەو بوو و وێنەی ئەو بڵاو دەکرایەوە کە چووەتە ئەمریکا و چاوی بە کێنێدی کەوتووە و لێرە و لەوێ هەر باسی سەرۆکی ئاژانس هاتبایەتە گۆڕێ، باسی چاکسازیی زەوی و زاریش دەکرا. لە ئاکامی ئەو راپۆرتەدا چەند ئەفسەرێکی پایەبەرز و سەربەرێوەبەر لە وەزارەتخانەکان و لە سوپادا لا دران. دوو جێگری وەزارەتخانە و چەند باڵیۆزێک لە ئەورووپا و ئەمریکا گردەنشین کران. لە بری ئەوان ئەفسەری جێ متمانەی حەزرەتی خاوەنشکۆ دانران. مەرجێک ئەوە بوو کە هەموو بەرپرسانی سوپا لە سەرۆکی فەرماندەیی گشتییەوە تا دەگاتە فەرماندە پلەبەرزەکانی شارەکان و سەرۆکی شارەوانییەکان لە هەموو وڵاتدا هەر کام دوو ساڵ لە شا گەنجتر بن.

تەنانەت فەرزانیش دەستی لە کارەکەی خۆی هەڵگرت، چونکە تۆمەتیان لێ دابوو کە هاوکاریی بەختیار دەکا. ماوەیەکی زۆر نەمدیت بێتە ماڵمان و هاوڕێیەتی روقیە بکا. تا رۆژێکیان بیستمەوە دەیەوێ بچێتە فەرەنگ. کەس بێڕێزیی بە تەیموور بەختیار نەکرد. دەیانگوت پێوەندی و ساتوسەودای ئەو لەگەڵ هۆزی بەختیاری لەوانەیە سەرئێشە دروست بکا. لە پەروەندەکەدا دیتم کە بەختیار چووەتە ئەمریکا و دیسان چاوی بە کێنێدی کەوتووە. کۆمەڵێک راپۆرتی تێروتەسەل لەو بارەیەوە لە ئاژانسەکەی ئەمریکاوە هاتووە. باڵیۆزی ئێران راسپێرابوو چاوی بەسەر وردەکاریی هەوڵەکانی بەختیار و هاموشۆکانی لەگەڵ مەئموورەکانی سی ئای ئەیەوە هەبێ. لە پەروەندەکەدا شتێکی ئەوتۆم دەست نەکەوت، شوێنەونکەیان دەکرد. شتێکی کە بەکار بێ، لە راپۆرتەکاندا نەبوو. زۆر لە ئەمریکا نەمایەوە. زۆری نەبرد، لە ماڵەکەی خۆی لە فلۆریسان دیتیان.

لە دەقی ئەو وتارانەوە کە لە ئەورووپا و ئەمریکا لە بارەی بەختیارەوە بڵاو دەبوونەوە و لە پەروەندەیەکی چەندهەزار لاپەڕەییدا نووسرابوو، لێت روون دەبۆوە کە پەیامنێرەکان لە هەموو جێیەک بەشوێنییەوەن. خەڵکێکی زۆر لە ئێرانییەکان هاموشۆی ماڵەکەی دەکەن. دەستە دەستە قوتابی دێنە سەردانی، لە ئەڵمانەوە، لە بەریتانیا و فەرەنساوە. تەنانەت لە رۆژنامەکانی دژی ئێرانیشدا کە حیزب و تاقمە جۆراوجۆرەکان لە ئەورووپا چاپ و بڵاویان دەکردنەوە، جاری وابوو باسێکی ئەو هەر دەکرا. رۆژنامەیەک نووسیی: بەختیار دەیەوێ پێوەندی بە رووسەکانەوە بکا.

رۆژنامەیەکی ئینگلیزی نووسیی، کە سەفەرەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ بۆ ئەمریکا پاش رووخانی بەختیار، بۆ گفت و متمانەوەرگرتن لە کێنێدی و سی ئای ئەی بووە، کە پشتیوانی لە هەوڵ و تێکۆشانەکانی وی نەکەن. بەرپرسانی ئەمریکی رازی بوون بەو مەرجەی حەزرەتی خاوەنشکۆ دەست بە چاکسازییەکە بکا. تەنانەت سەرۆکوەزیرانی ئەو کاتیش کە بیرۆکەی چاکسازییەکە خۆی دایهێنابوو، دەیەویست سەفەری ئەمریکا بکا و خۆی جڵەوی کاروبارەکان بەدەستەوە بگرێ. بەڵام نەشیدەوێرا. براکەی نارد، ئەویش پێی جێبەجێ نەبوو. تەنانەت حەزرەتی خاوەنشکۆش لە وتارێکدا فەرمووی، کە بەختیار و مڵکدارە گەورەکان و مەلاکان دژی چاکسازی بوون و کوژرانی یەکێک لە راسپێراوانی چاکسازیی زەوی و زار لە فارس، ئاکامی پیلانێکی بەختیار بووە. یانی لە دوورترین شوێنی وڵاتیش ئەوەندەی دەست دەڕۆیی.

دوو سێ ساڵێک وا دەهاتە بەرچاو کە بەختیار هێور بووەتەوە و ئیتر چالاکیی سیاسیی نییە. بەڵام ئەو بێدەنگییە هەر بە رواڵەت بوو. رووداوە سیاسییەکان دەری خست کە لە هەموو کاولاشەکاندا شوێن پێی ئەو دیارە. لەو ساڵانەدا خەبەر دەهات کە لە بەغدا و بەیرووتە و جاری وایشە لە ژنێڤ. نامەیەکی گەیشتە دەست خزمێکی من بەناوی سەردار،

که هەرای نایەوە. ئەو بەختیارە، لە ترسان نامەکانی دایە ئاژانس و داوایان لێ کرد و گوتیان، لەگەڵ بەختیاردا نامە بگۆڕێتەوە. بەڵام ئەو کابرایە، پیاوێکی ترسنۆک بوو و هەموو جارێ بەڵێنی دەدا و دواییش تەفرەی دەدا. ئاخریەکەیشی ملی بۆ رانەکێشا. ئاژانس لە دۆست و خزمەکانی ژنەکەی یارمەتیی وەرگرت. دەرکەوت ئەو لەوە زاناتر و هۆشیارترە کلکی بە تەڵەوە بێ.

پاش کوژرانی سەرۆکوەزیرە تاسولووسەکە، بە لێکۆڵینەوە لە دەوروبەرییەکانی بکوژ، روون بۆوە کە یەکێک لە تۆمەتباران لە بەغداوە هاتووە و لە ژنێڤ چاوی بە بەختیار کەوتووە. پاش دوو مانگ و نیو یەکێک لە گۆڕەپانی دەربار‌دا فیشەکێکی بە جەنابی حەزرەتی خاوەنشکۆوە نا، ئەو دەمەی دەیەویست سواری ترۆمبێلەکەی بێ، دوو سەربازی کوشت و خۆی بە کۆشکدا کرد و لەوێ فیشەکێکی بەو ژوورەوە نا کە حەزرەتی خاوەنشکۆ لەوێدا خۆی حەشار دابوو، بەڵام باش بوو زیانێک بە زاتی پیرۆزی نەگەیشت. لە دۆست و ئاشناکانی بکوژەکە شەش کەس کە بە کۆمۆنیستبوون تۆمەتبار بوون و لە بەریتانیا دەرسیان دەخوێند یان خوێندبوویان، گیران. لە نێو ئەو بەرگە و کاغەزانەی لە گیرفان و ماڵەکانیاندا دۆزرانەوە، ئادرەسی بەختیار لە ژنێڤ دەست کەوت. لە سەفەرەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆدا بۆ رۆژئاوا، قوتابییە ئێرانییەکان کردیانە هەرا و رێگەکانیان گرت. دوژمنانی ئێران لە بەرلین نووسییان، پیاوەکانی ئاژانس بە دار و تێلا لە قوتابییەکان بەربوون ــ هەڵبەت ئەم هەواڵە درۆیە. پیاوانی ئاژانس قەت کاری وا چەوتیان نەدەکرد و، لە تێکهەڵچوونی نێوان پۆلیس و خۆپێشاندەران قوتابییەکی ئەڵمانیی دوژمنی ئێران کوژرا.

ئیتر لەمەودوا هەموو هەوڵی ئاژانس بۆ پشکنین و راوەدوونان و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی ئێران و قوتابییە لاڕێبووەکان لە ئەورووپادا تەرخان کرا.

سەدان راپۆرت لەو رۆژانەدا لە هەموو پێتەختەکانی ئەورووپاوە لەبارەی بەختیار و پێوەندییەکانی ئەو بە قوتابی و بەرهەڵستکارانەوە دەهات. ئاژانس ئیتر بیری لەوە دەکردەوە هێزەکانی خۆی لە ئەورووپادا پەرە پێ بدا. تاقە نوێنەرێک بە ناوی سکرتێری دووەم و راوێژکارێک لە پێتەختەکانی ئەورووپا بەس نەبوو. دەبوایە کادیری تازە بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی نیشتمان ئامادە بن. هەر لەو رۆژانەدا بوو کە دکتۆر جیهانگیر بە منی گوت:

"دەتەوێ سەرێکی فەرەنگستان بدەی؟

نەمدەزانی چیی جواب دەمەوە. خافڵگری کردم. وەزعم شپرز بوو. ژنەکەم تازە مردبوو. منداڵم بێ سەرپەرشت بوون. دایکم لەو کونجە خانووەدا پێی نەدەحەوانەوە. وامان دانابوو منداڵەکان بنێرمە لای باپیرەیان لە نەتەنز. چاوەڕێ بووین باپیرەیان بێ و بیانبا. هاتنەکەی هەر لەم حەفتەیەوە دەخستە حەفتەیەکی دی. تێدا مابوو و بۆخۆشم نەمدەزانی چ دەکەم.

ئەگەر گوتبایەم باشە رازیم، لەوانەبوو لێم بکەوێتە گومان کە دەمەوێ بەتەنێی بەجێ بهێڵم و ملی رێیە بگرم و بڕۆم. پرسیم: "بە خاوخێزانەوە؟"

"راهێنانی کادری دەرەوەی وڵات چەند مانگێک دەخایەنێ و دیارە هەر لەوانەیە چەند مانگێک زیاتر نەبێ. جگە لەوەش، لەوانەیە هەر نەشتوانی لە شارێک بمێنیتەوە و جێ قوونت خۆش بکەی. لەوانەیە ناچار بی شارەو شار بڕۆی."

شەوێ باسەکەم لەگەڵ دایکم و خەسووم هێنایە گۆڕێ و ئەوان نەیاندەزانی پێیان خۆش بێ یان ناخۆش. هەر ئەو شەوە خوشکم کە ئیتر رووی قایم ببوو و چەند شەوان پەیتا پەیتا نەدەهاتەوە ماڵێ و بەبێ ئەوەی بیشارێتەوە دەیگوت لەگەڵ برادەرەکانی هۆدەیەکی فرۆشتنی کەلوپەلی خۆجوانکردن لە نێو فرۆشگاکەدا دەکاتەوە و دەیەوێ وەک براکەی خەریکی ئاڵووێری کاڵا بێ، تەلەفۆنی بۆ کردم و هەواڵێکی پێ راگەیاندم و لێی روون کردمەوە چۆن خافڵگر بوومە.

دوو حەفتە بوو کەس فەرزانی نەدیتبوو. لە ماڵەوە نییە، بۆتە بەردی بن گۆم. کە ورد لێکم داوە، دیتم ئەو دوو حەفتەیە هاوکاتە لەگەڵ ئەو رۆژەی هەواڵێکم لەبارەی بەختیارەوە لە بەغدا پێ گەیشت.

بۆ سبەینێ پێ و شوێنی شێخۆ کەوتم. چما دەکرا ئاوا بە ئاسانی بیدۆزیتەوە؟ دوو سێ ڕۆژی خایاند، نەمویست لە پشت تەلەفۆنەوە زۆری قسە لەگەڵ بکەم. هەر پرسیم:

"دەنگ و باسی فەرزان؟"

ئەو شێخۆیە دایەخۆگێیەک بوو نەبێتەوە. وەڵامی داوە:

"فەرزان کێیە؟ من ئەو ناوەم قەت نەبیستبوو. بەڵام زۆرم حەز لێ بوو چاوم پێت بکەوێ."

قەول و قەرارمان دانا. هەر لەو ژوورەی ئەوماڵەدا کە کۆنیاکم دابووین.

هەر گەیشتێ دەرگای سندووقەکەم کردەوە و پیاڵەیەک شەرابی ئاگرینم بۆ خۆم و ئەو تێ کرد.

"دەنگ و باس؟"

"خەبەرێکی خۆش لەگۆڕێ نییە. بەر لەوەی تۆ بمدەیە بەر پرسیاران، من دەست پێ دەکەم. ئەو ڕوقیەیەی خوشکت سەری لە گێچەڵان دەخورێ. ئەوە چ دەکا؟"

"چ دەکا؟ دەیەوێ بە یارمەتیی چەند برادەرێکی خۆی بووتیکێک بکاتەوە و پارووە نانێک پەیدا بکا."

"کوڕە تۆ زۆر خاوی، دووکانی چی."

"قسەکەت بکە. ئەگەر پیاوی خراپەی خوشکی من بڵێ، دەم و قەپۆزت تێک دەکەمەوە."

"نا، خراپت وەرگرت. باسی ئەو شتانە نییە. ئەو خوشکەی تۆ هەر لەو شتانە نییە. هەر باسی ئەو شتانە نییە. لەو دەمەوە کە تەڵاقی لە مێردەکەی وەرگرتووە، مەرد و نامەردی وا لەبەر چاو کەوتووە، کە هەزاریان بە تفێک سواخ دەدا."

"ئەی چی؟"

"من هیچم بۆ گوتن نییە، خۆ ت وەستای. ئاگات لێی بێ. چاوت بەسەرییەوە بێ. هاموشۆی کۆمەڵێک هەرچی و پەرچی دەکا، کە من زۆرم کەیف پێیان نایە."

"کێن؟"

"جا ئەگەر زانیبام پێم دەگوتی. من بۆ تۆ مە. ئەو پیاوەتییەی لە تاڵترین ڕۆژەکاندا لەگەڵت کردووم لەبیر ناکەم. ئەوانە لە گیان و سەری خۆیان بێزارن. بۆ هەموو کارێک ئامادەن."

زۆر تێک چووم. لەدڵی خۆمدا گوتم: "کەر لەکوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە! من لەکوێ وەشوێن کڵاوی بابردوو کەوتووم. من ئەوە لە دوژمنانی حەزرەتی خاوەنشکۆ دەگەڕێم بۆ ئەوەی لەناویان بەرم و بیاندەمە دەستی دادپەوەری، کەچی لە پەنا گوێمەوە شتی وام لێ شاراوەیە، کە بنیادەم هەر فکریشی بۆیان ناچێ."

کارم زۆر بوو. دەرفەتی ئەوەم نەبوو سەرم بخورێنم. بەڵام شەوێکیان، وەختێک کە دڵنیا بوومەوە ڕوقیە لە ماڵەوە نییە، بە دزی دایکمەوە چوومە ژوورەکەی ڕوقیە و سندووقی جلوبەرگەکانیم سەروبن کرد و قەفەزی کتێبخانەکەیم سەروبن پشکنی. دەمزانی حیزبییەکان، لە پێشدا بە کتێب و کاغەزان سەر لە گەنجەکان دەشێوێنن و، جا دوایی ئەقڵ و ئاوەزیان دەدزن و لە ڕێیان وەردەگێڕن. خەر ێک بوو چاوم بێتە دەرێ. ڕێک لەو نامیلکە و شەونامانەی ئێمە لە پەروەندەی سەرلێشێواواندا هەمانبوون: "شێوازی جەنگی پارتیزانی لە کووبا"، "خەباتی چەکدارانە تاقە ڕێگەی ڕزگاری"، "ئاخۆ ڕێگەیەکی ئاشتیخوازانەش هەیە؟"، "خەباتی چەکدارانە و ڕەدکردنەوەی بیردۆزی مانەوە"، "پارتیزانی نێو شاری"، "خەباتی چەکدارانە هەم ستراتژی و هەم تاکتیک." و سەدان کاغەزی بەزەڕ، کە ئەگەر لای هەر گومانلێکراوێک دۆزرابانەوە، بە لایەنی کەمەوە چەند ساڵان دەبوو لە تەویلەدا بێ.

بەژوورەکەدا هەر هاتم و چووم و لە خۆمم پرسی، چ بکەم؟ بەرۆکی خوشکەکەم بگرم؟ قژی بگرم و دەیکێشم؟ چ بە دایکم بڵێم؟ ماڵە نەتەنزییەکە چیم پێ دەڵێن؟ ئەوەندە لە ژوورەکەدا هاتم و چووم، کە وەختێک دایکم دەرگاکەی

کردەوە و جلوبەرگە پەرش و بڵاوەکان و کتێبەکانی دیت لەسەر عەرزەکە کەوتوون، مێشکم وا ئاڵۆز بوو هەر ئەوم نەدی.

"ئەوە چ دەکەی؟ کەلوپەلەکەی روقیە بۆ تێک وەردەدەی؟"

پرسیم: "هیچ دەزانی خەریکە چ قوڕێکمان بۆ دەگرێتەوە؟ چ بەڵایەکمان بەسەر دێ؟"

ئەو قسانەم لە نەزانی کرد. لە زارم دەرپەڕین. جا بۆچی سەری دایکمی پێوە بێشێنم؟ دەسبەجێ بەبێ ئەوەی سەر لەخۆم بشێوێنم، گوتم: "هیچ نییە. پێم وابوو مشک چووەتە نێو جلەکانییەوە. ویستم بیگرم. مەترسە، ئێستا کۆیان دەکەمەوە، هیچ بە روقیە مەڵێ."

دایکم بڕوای نەکرد.

"نا، شتێک هەیە. من هێشتا ئەوەندە نەخەڵەفاوم. منیش سەرم لە هەندێ شت دەردەچێ. بۆچی هەردووکتان شتی خۆتان لە من دەشارنەوە. نەجیبەخانم هەندێ شتی لێ روون بۆتەوە."

نەجیبەخانم خەسووم بوو.

"چیی لێ روون بۆتەوە؟"

"هەر ئەوەی کە هەردووکتان خەریکی هەندێ کارن کە ئێمە سەری لێ دەرناکەین. نەجیبەخانم دەڵێ، هەمیشە کۆڵێکی پارە لە گیرفانیدایە، بەڵام کە لێی دەپرسم چ دەکڕی و دەفرۆشییەوە وا ئێمە نایبینین، وەڵامم ناداتەوە. جگە لەوەش، تاکەی خەڵک قسەم لێ بشارنەوە. دەر و دراوسێ لە کن من بە ئاماژە و برۆهەڵتەکاندن قسە بە ساواک دەڵێن و من خۆم پێ ناگیرێ. بۆ مێردەکەم ساواک بووە، یان "کوڕەکەم؟"

یەک دوو سەعاتێک کە لە ماڵی دایکم بووم، هەر وا بۆڵاندی و گوتی رۆقیەش ئێستا وەک تۆی لێ هاتووە. هەمووتان کار و شتی خۆتانم لێ دەشارنەوە. ئیتر لە گۆشەیەکی ژوورەکە کرووشمەی دەکرد. تەزبێحی داویشت و دەپاڕایەوە و فووی دەکرد و دیسان دەیبۆڵاندەوە.

من لە رادەبەدەر نیگەران بووم بۆیە چوومەوە ماڵی خۆمان. نەمدەزانی چ بکەم. راپۆرتەکە بدەم؟ بە دەستی خۆم خوشکەکەم بخەمە گێچەڵەوە؟ چما دەکرێ مەسەلەیەکی ئاوا گرینگ بشاریتەوە؟ خۆمم نەخۆش کرد. تەلەفۆنم بۆ دکتۆر جیهانگیری کرد و گوتم، باش نیم. لە دوێنێ شەوێوە تا ئێستا یەک پشوو دەرشێمەوە و تەنانەت ناتوانم بچمە لای دکتۆرێکیش.

دەرگای ژوورەکەم لەسەر خۆم پێوە دا و لەسەر مۆبلەکە لێی تخێڵ بووم. یەک دوو پیاڵەم ئارەق پێدا کرد. دەنگی پشیلەی دراوسێکەمان وەڕەزی کردبووم. راکشام. خەوم لێ نەکەوت. پێم حەیف بوو بە بێکاری دانیشم. ژیانم بەو رێگەچارەیەوە بەسترابۆو کە دەبوو بیدۆزمەوە. ئاخۆ راپۆرتەکە رابگەیەنم یان نا؟ هەرچی نەجیبەخانم ویستی بەدەورمدا بێ، نەمهێشت. منداڵەکەمی کە دووساڵ و نیو بوو و زۆرم خۆش دەویست، بۆ هێنام گەمەی لەگەڵ بکەم، بەشکم تۆزێک هێور ببمەوە. کاری تێنەکردم. هەر بیرم لە وەڵامی ئەو پرسیارە دەکردەوە: ئاخر راپۆرتەکە بدەم یان نا؟ دایکم چیم پێ دەڵێ؟ ئەگەر هەر ئەمشەو هاتن و بردیان، چ جوابی دایکم و نەجیبەخانم بدەمەوە؟ چما دەکرا شتێک لە ئاژانس بشاریتەوە؟ وەختێک بەرەڵایەکی وەک شێخۆ زانیوێتی کە روقیە خەریکە دەبێتە "فیدایی"، بێ و نەبێ خەڵکی دیکەش ئاگادارن. بەتایبەتی کە فیتنە و فەرتەنەیەک هەموو وڵاتی گرتبۆوە. بەو حاڵەوە نەمدەتوانی لە ماڵێ دانیشم و بەکارەکانی خۆم رانەگەم و هەر بیر لە روقیە بکەمەوە. نەجیبە خانم لە کاشانەوە ئاگادار بوو کە چەند مەلا و فەقێیەک لە مزگەوتدا کردوویانەتە هەرا و ناڕەزایەتییان لە چاکسازیی زەوی و زار دەربڕیوە. کە دەیانەوێ ماڵی موسوڵمانان داگیر بکەن و دەنگیان لێ هەڵبڕیوە: "الناس یسلگون علی اموالکم وانفسکم" و ئەگەر پۆلیس هەموانی دەسگیر نەکردبایە، دەبووە فیتنە و فەرتەنە. لە تاران ساواک مەلایەکی بەناوبانگی راوەدوو نابوو و کۆمەڵێک لە مەزهەبییەکان لە هەوڵی

حوکمەت بۆ داگیرکردنی مڵکی خاوەن زەوییەکان ناڕازی بوون و ئاژانس چاری نەبوو جگە لەوەی قۆڵبەستیان بکا و بیانخاتە زیندانەوە. لە شارەکانی دیکەشەوە هەواڵی وردە سەربزێویی دیکە دەهات و ئیتر وردە وردە دەردەکەوێ ساواک لە دابینکردنی سەقامگیریی گشتی چەندە کاریگەرە.

چۆن توانیبام لە ماڵەوە دانیشم و نەزانیی کچێک ببێتە کۆسپی بەردەمم لە راپەڕاندنی ئەو ئەرکەدا کە لەسەر شانمە؟

فکر و خەیاڵ وایان زۆر بۆ هێنابووم ژانەسەرم گرت. حەبێکی ئاسپرینم خوارد و لێی خەوتم. کەڕەی بەیانی لە خەو هەستام. بێ تاقەت بووم. ئاوێکم بە دەموچاومدا کرد، جلوبەرگم لەبەر کرد و بەر لەوەی بچمە ئیدارە، سەرێکم لە ماڵی دایکم دا بۆ ئەوەی ژوورەکەی روقیە خڕ بکەمەوە. تازە تاو هەڵدەهات کە دایکمم لە بەر دەرگا دیت. پرسیم:

"ئەوە بۆ لێرەی؟"

گوتی: "چاو و دڵت روون."

پرسیم: "چ قەوماوە؟"

گوتی: "روقیە رۆیشت و گوتی ئیتر بەو ماڵەدا نایەتەوە."

"بۆچی؟"

"چووزانم. خۆ هیچ بە من ناڵێن. من نامەحرەمم. ئێوە کارەکانی دەکەن، دەبێ من نەگبەتییەکەی بەشان هەڵگرم."

"من هەر ئەوەندەم بۆ ساغ بۆوە. دوێ شەوێ هاتووەتەوە ماڵێ و کە زانیوێتی شتەکانی بەسەریەکدا دراون، دەسبەجێ شتەکانی لە جانتایەک خستووە و گوتوویەتی: دایکە، ئیتر من لەم ماڵەدا ناژیم. کەسیش سەروسۆراغم نەکا. هەمووتان زاڵمن.

"بۆ کوێ دەڕۆی؟ لێم پرسی. هەر لەو بەردەرگایە وەڵامی دامەوە:

"خۆشم نازانم. بەڵام لەو ماڵەشدا ناژیم."

ئیتر چار نەبوو. جێی خۆی بوو ئەرکی خۆمم راپەڕاندبایە و مەسەلەکەم بۆ دکتۆر بیژەن گێڕاباوە. بەڵام ئەو کابرایە بوودەڵە بوو. سەری لێ دەشێوا و دەیکردە هەرا. بە هەندم نەگرت. لەگەڵ دکتۆر جیهانگیر دانیشتم و ورد ورد بۆم گێڕاوە. لێم پرسی: "چ بکەم؟"

ئەو شتە بۆ دکتۆر جیهانگیر شتێکی تازە نەبوو. دیسان گومانلێکراوێکی دیکە.

"ئاخری روونی دەکەینەوە چووەتە کوێ. دەیدۆزینەوە. خەمت نەبێ. راپۆرتەکەت بنووسە. لێم گەڕێ منیش بیرێکی لێ بکەمەوە تا بزانم دەبێ چ بکەین. برۆ کاکە جارێ کارەکانی خۆت بکە. مەسەلەی بەختیار برانەوەی نییە. مەلاکان خەریکن شۆڕش وەڕێ دەخەن. نازانی لە قوم چ باسە؟"

چار نەبوو هەر دەبوایە بڕیار بدەم. دڵنیاکردنەوەی من لە لایەن دکتۆر جیهانگیرەوە لەوانەیە هەر بۆوە بووبێ کە کاروبارەکەی خۆی راپەڕێنێ. ئێستا چ خوشکەکەم بکەوێتە مەترسییەوە و چ من، بۆ ئەو هەر شتێکە. ئیتر ئەوەندەم ئەزموون کۆ کردبۆوە کە بە قسە رازی نەبم. پیاو دەبێ پیاوی ژیان بێ. لە دڵی خۆمدا گوتم: لە پێشدا هەوڵ دەدەم روقیە بدۆزمەوە و بیکەمە لایەنگری ئاژانس. دەچمە لای جێگری سەرۆکی ئاژانس. ئەگەر جێبەجێش نەبوو چش. خۆ ژیانی من نابێ لەسەر گووکارییەکانی ئەو ببێتە هیچ. چیم لە دەست بێ دەیکەم. بەڵام ئەگەر هیچم پێ نەکرا، خۆ خەتای من نییە.

قسەکەی شێخۆ لە گوێچکەمدا دەزرینگایەوە: ئەوەندە خۆت بە دکتۆر بیژەن و ئەم و ئەوەوە هەڵمەواسە. دکتۆر بیژەن کێیە؟ من دەبێ خۆم بەوانی سەرسەرەوە ببەستمەوە و بچمە پێشێ. نابێ کچەتیوەیەکی نەفام هەودای ژیانم بپسێنێ و بۆ کوێی حەز لێیە رامکێشێ.

هیچ وەڕووی خۆمم نەهێنا. چوومەوە سەر ئارەقخواردنەوەکانی شەوانەم. وردە وردە هاتم ە سەر ئەوەی کە ئەو کاک دکتۆرە، کابرایەکی ساختەچی و بوودەڵەیە. هیچی لەباراندا نییە. دەستی لە کلکی حوشترێ گیر بووە و دڵی بەوەندە خۆشە. دەلەوڕێ و مەڕێکە لەگەڵ ران کەوتووە. چما من لەبەر خاتری روقیە ببوومە پیاوی ئاژانس تا ئێستا لەبەر خاتری جەنابی دکتۆر جیهانگیر بێکا و بار بکەومەوە. نا، روقیە نابێ ببێتە کۆسپی بەردەم پێشکەوتنی ژیانم. هەوڵ دەدەم خۆم بگەیەنمە ئەو بەشەی ئاژانسەوە کە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی ئەو کارانەی لە ئەستۆیە وا شێخۆ باسی کردن.

لە ئارەقخۆاردنەوەی شەوانەدا لەگەڵ دکتۆر جیهانگیر باسی راهێنانی کادری دەرەوەی وڵاتم هێنایە گۆڕێ و پرسیم: "من پێم ناخۆش نییە خولێکی راهێنانی لێپرسینەوە ببینم."

بیرێکی کردەوە و سەیرێکی چاوی کردم، زەردەیەکی پڕ مانای هاتێ، کە ترسی خستە دڵم ەوە. گوتی: "یارۆ، وا دیارە لە دەست ئەو گرفتاری و کێشەیەی خۆشکەکەت فیزماڵکی دەدەیەی؟"

گوتم: "نا، نەوەڵا، بەخوای، بەڵام خۆت دەزانی کە بنیادەم هەر بە پەروەندەخوێندنەوە خۆ فێری هیچ نابێ. حەز دەکەم لە بەشەکانی دیکەشدا شتێک بزانم. بڵێی و نەڵێی ئەوە بەکالۆریۆسی یاسا وەردەگرم. لەبەر خوشکەکەم نییە. خۆت گوتت دڵنیا بم. من وازم لەو هێنا. هەر کەسە و بە رێی خۆیدا."

پاش چەند جاران مشتومڕ لەگەڵ دکتۆر جیهانگیر لە شەوخواردنەوەکاندا تێگەیشتم کە ئەو وەکیلباشییە و وردە بەردەستەکانی ئەو هیچیان لێ هەڵناوەرێ و هیچیان پێ ناکرێ. دانیشتم و بیرم کردەوە و کڵاوی خۆمم کردە قازی. بە شوێن رێگەیەکدا دەگەڕام کە هەرچۆنێکی بێ خۆم بگەیەنمە تیمسار سەرلەشکر. باشە بۆچی ئەو نامەردە؟ چەند تایبەتمەندیی هەبوو. یەکێکیان ئەوەی کە یەکێک بوو لە دوژمنە قەستەسەرەکانی بەختیار و دڵنیا بوو تا ئەو زیندوو بێ و دەستی بڕوا، ناگاتە ئامانجەکەی خۆی واتە سەرۆکی گشتیی ئاژانس. دووەم ئەوەی کە هێشتا گەنج بوو و خوا بزانێ چیها فێڵ و تەڵەکەی کردووە تا بەو تەمەنەیەوە بگاتە ئەو پلە بەرزە. لە هەمووشیان گرینگتر حەکەدار و بەئاڵووش بوو. ژنێکی پێ جوان بوایە وازی لێ نەدەهێنا. هەموو ئەو ژنە جوان و زەریفانەی لە ئاژانسدا کاریان دەکرد، تا بە سێبەری ئەودا تێنەپەڕیبایەن، نەیاندەتوانی بێنە نێو ئاژانسەوە. خۆم ئەوەم لە زمانی ئەو ژنە ژیکەڵەیەوە بیست کە پێکەوە ئەرکێکمان پێ ئەسپێدرابوو.

دەیگوت: "چاوی سوور هەڵدەگەڕان و لووتی فش دەبوونەوە و زاری کەفی دەکرد و وەک شێتان نێچیرەکەی خۆی هەڵدەگرت. دەسدرێژیکردنە سەر ئەو ژنە گەنجانەی دەکەوتنە دەست ئاژانسەوە، تەنیا بە رەزامەندیی تیمسار سەرلەشکر و لە بەرچاوی ئەو دەبوو. گێڕانەوەی خۆشی و چێژ بۆ ئەو نیوەی چێژەکە بوو. بە نهێنییەوە و بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەم بە دکتۆرە هاوکارەکانم کردبێ، نامەیەکم بۆ ئەو راوچییە بێ حەیایە نووسی کە خۆی دەبوو ببێتە نێچیری من. لەو دەمەدا ئاژانس و وەزارەتی دەرەوە و حەزرەتی خاوەنشکۆ هەر هەموویان بە مەسەلەی بەختیار و رووداوەکانی قومەوە خەریک بوون. لەو نامەیەدا ئاگادارم کردبۆوە کە بۆ پێشکەشکردنی راپۆرتێکی زۆر گرینگ و نهێنی داوای چاوپێکەوتن دەکەم. وام دانابوو کە لەچارەسەری کێشەکەی بەختیار و کۆتاییهێنان بەو مەسەلەیە زۆر گرینگ دەبێ. بۆ راپەڕاندنی ئەو مەئموورییەتە پێویستم بە پشتیوانی و هاوکاریی تیمسارە. لە نامەکەدا نووسیبووم:

"ئەگەر تیمسار رازی بێ، لە جێیەکی دوور لە ئەغیار چاوی بەو کارمەندە چواردەساڵەی ئاژانس بکەوێ، لەبەر ئەوەی ئیمانم بە نیشتمانپەروەری و شاپەرستیی بەڕێزیان هەیە، دڵنیام داوا و پێشنیارەکانی ئەم بچووکەی خۆی قەبووڵ دەکا."

داواکارییەکەم بە ناونیشانی ماڵەکەی و ئادرەسی شوێنی کارەکەی خۆمەوە بۆ نارد. سێ چوار رۆژی پێ چوو کە تیمسار سەرلەشکر بەدەم سەرانسۆی کاروباری لقە جیاجیاکانەوە، لە پڕ هاتە ئەو سنوورەی دکتۆرە ساختەکان کاریان تێدا دەکرد. لە دکتۆر جیهانگیریی پرسیی:

"ئەم برادەرە کێیە؟"

وەڵامی داوە: "یارۆ، کارمەندی خاوەن پێشینە و خزمەتگوزار."

گوێی نەدایە قسەکەی وی. رووی لە من کرد و گوتی: "وەبیرم هاتەوە. تۆ هەر ئەو کەسە نی کە لە رووداوەکەی زانکۆدا رۆڵت هەبوو؟"

کرنۆشێکم بۆ کرد و هیچم نەگوت. دکتۆر جیهانگیر ویستی باسی خزمەتەکانی من بە ئاژانس بکا و بۆی روون بکاتەوە، کە تیمسار قسەکەی پێ بڕی و گوتی: "دەبێ لەوە زیاتر کەلکی لێ وەرگیرێ." ئەوەی گوت و رۆیشت.

زۆری نەبرد کە رێگەیان دام بچمە خولی راهێنانی لێپێچینەوە.

بە یەکێک لە ئامانجەکانی خۆم واتە لێکۆڵینەوە لە راکردنی روقیە لە ماڵی دایکم گەیشتم.

چەند حەفتە دواتر، رۆژێکیان دەمەویست سواری ئەو ترۆمبێلە بم کە لەبەردەم ماڵێکی ساواکی رایگرتبوو، لەو دەمەدا تیمسار منی دیت و بەبێ هیچ قسەیەک سوار بوو و منیش باسی نەخشەکەی خۆمم لە بارەی گرفتارییەکەی بەختیارەوە بۆ کرد. دوو سێ جار دەستی لە سەر شانم دا و من گەیاندمەوە ماڵێ و دڵنیا بوومەوە کە دڵیم بەدەست هێناوە. تیمسار سەرلەشکر فەرمووی: "جارێکی دیکەش پەروەندەکەی بەختیار بخوێنەوە." کتێبێکی باشی لێ دەرهاتبوو.

تیمسار فەرمووی:

"بۆ نەگبەتی ئێستا کاتێکی خراپە. ئێمە دەبێ لەگەڵ مەلاکان پاکانەحیسابێک بکەین و چووزانی بەختیار دەستی لە ئاژاوەکەی مەدرەسەی فەیزییەشدا نەبێ. دەبێ زۆر بە وردی و زۆریش بە پارێزەوە بوارەکان بۆ ئەو کارە خۆش بکرێن. نابێ بۆ هیچ کەسی باس بکەی. من خۆم حەزرەتی خاوەنشکۆی لێ ئاگادار دەکەمەوە و بە رەزامەندیی جەنابیان قۆڵی لێ هەڵدەماڵم. با هەر بەینی خۆمان بێ. من زۆر بە نهێنی تۆ ئاگادار دەکەمەوە. ئەمر دەکەم هەموو ئەو راپۆرتا نەی لە بارەی چالاکییەکانی بەختیارەوە دێن، بخرێنە بەر دەستی تۆ."

بۆ سبەینێ هەر گەیشتمە نووسینگەی کارەکەم، سەیرم کرد کۆمەڵێک راپۆرت لە کۆڵن و ژنێڤ و بەیرووتەوە هاتبوون و لەسەر مێزەکەم دانرابوون. راپۆرتێکیان هیی شارەوانی بوو، کە فەرزان ئیجازەی وەرگرتووە و لەگەڵ دایکی چووەتە کەربەلا. راپۆرتەکەی دیکە سەرنجی راکێشام، کە بە تەنێ بە فڕۆکە چووەتە بەغدا و لە هوتێل فندق دەژی. بەڵام جگە لە من کەس گرینگیی بەو راپۆرتە دەدا؟ هەموو پیاوانی ئاژانس هۆش و زکریان لای بەختیار بوو و ئیدیعاشیان دەکرد دیتوویانە.

هەواڵێک کە هەمووانی تۆقاند، لە وەزارەتی دەرەوەڕا هات کە بە ئەمری حەزرەتی خاوەنشکۆ لەبەرگیراوەیەکی پەروەندەکەی بەختیاریان دەویست لەو رۆژەوە کە لە تارانەوە چووبووە ئەورووپا. بۆ سبەینێ لە رۆژنامە و رادیۆکانی دەرەوەدا گوترا، بەختیار بە کامیۆنێک چەکەوە لە لوبنان گیراوە و لە زیندان چاوەڕوانی دادگاییکرانە. رۆژنامەکان ورد ورد خیانەتەکانی ئەویان دەنووسییەوە و داوایان لە دەوڵەتی لوبنان دەکرد، ئەو دزە تاوانکەر و تالانچی و زیناکەرەمان بدەنەوە. هەوڵە دیپلۆماتیکە نهێنییەکان دزەیان دەکردە نێو میدیاکانیشەوە. وردە وردە دەرکەوت کە لوبنان رادەستکردنەوەی ئەو بە دروست نازانێ. لە سەرانسەری دنیا بوو بە هەرا، کە نابێ رادەست بکرێتەوە. تەنانەت نووسەرێکی ناوداری فەرەنسیش کە پشتیوانیی لە قوتابییانی کۆنفدراسیۆن دەکرد، ئێستا دڵێکی بە پشتیوانی لە بەختیار خۆش بوو. قسەی حیسابیشی ئەوە بوو، کە بە رادەستکردنەوەی تاوانبارێک بە ئێران، دەراو خۆش دەبێ بۆ

رادەستکردنەوەی بەرهەڵستکارەکانی دیکەش و دەبێ پێشی بگرن. دەوڵەتی لوبنان دەیگوت، تاوانێک لەو وڵاتە کراوە و دەبێ پێی رابگەن و تا کۆتایی دادگاییکردنەکەش رادەستکردنەوەکەی مەحاڵە. بە رای ئاژانس، پشتیوانییەکەی نووسەرانی فەرەنسی بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر بوو کە کۆنفدراسیۆن پشتیوانی لە بەختیار دەکا.

رووداوەکانی مەدرەسەی فەیزییەی قوم، وای کرد خەڵک هەر ئاگایان لە چالاکی و کردەوەی تێکدەرانەی بەختیار نەمێنێ. کۆمەڵێک مەلای گوندی لە گەڕەکەکانی خواروی شاری جیاجیا لە دەوری مەلایەک بەناوی خومەینی کۆ بوونەوە و بە زمانی خۆیان "رۆژئاواییبوون"ـی حەزرەتی خاوەنشکۆ و دامودەزگای حکوومییان بە دژی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەقەڵەم دا و لە کۆبوونەوەکانیان لە مزگەوت و مینبەرەکانەوە رەخنەریان لە هەڵی پێشکەوتنخوازانەی حکوومەت دەگرت. بۆ وێنە دەیانگوت:

"وڵاتی بە ئەمریکاییەکان فرۆشتووە. زوڵم و دەستدرێژیی ئاژانسی تەناهیی وڵات و شارەوانی و پۆلیسیان مەحکووم دەکرد و دەستدرێژیکردنە سەر مزگەوت و قوتابخانەکانیان بە پێچەوانەی یاساکانی شەرع لەقەڵەم دەدا."

حەزرەتی خاوەنشکۆ بە نەرمونیانی لەگەڵ ئەو تێکدەرییانە جووڵاوە و هەوڵی دا مەلایەکی دیکە وەک ئایەتوڵای "مەرجەعی تەقلید"ی هەموو موسوڵمانانی شیعە بە فەرمی بناسێ، بۆ ئەوەی لایەنگرانی ئایەتوڵا روحوڵا خومەینیی چەک کردبێ. بەڵام ئەو سیاسەتە بەرهەمی باشی لێ نەکەوتەوە، بگرە بەپێچەوانەوە "مەزهەبییەکان"ی دنە دا و پێداگرتری کردن و خەریک بوو دەبووە فەرتەنە، کە ئیتر هەوڵێکی شێلگیرانە پێویست بوو.

لە بەهاریساڵی 1347ـدا دادگایی بەختیار لە لوبنان دەستی پێ کرد. ئەو لە دادگادا گوتی، لە لوبنان هیچ کەتنێکی نەکردووە و، چەکی بۆ دۆست و برادەرەکانی خۆی دەبردە بەغدا. چەند پارێزەرێکی لێوەشاوە و لەکڵ درەهاتووی لوبنان بوونە بەرگریکەری. بانگەشەی ئەورووپی و ئەمریکییەکان کە بەختیار ئازادیخواز و دژی رژیمی دیکتاتۆرییە و لەولاشەوە لێوەشاوەیی بەرگریکەرەکانی، دادگایان ناچار کرد سێ مانگی زیندان بۆ ببڕێتەوە. بەختیار لەپڕێکدا ئاومۆر دەکەن و دەیکەنە ئازادیخواز.

کورتی ببڕینەوە، دەوڵەتەکەی حەزرەتی خاوەنشکۆ زۆر پێداگر بوو بەختیار بدرێتە دەست بەرپرسانی لوبنان و رۆژنامە بیانییەکانیش نووسیان، کە ئێرانییەکان ئامادەن بە پەنجا ملیۆن فرانکی سوویسری بەختیار بکڕنەوە.
سەرۆککۆماری لوبنان ملی رانەکێشا و لە ئاکامدا پێوەندیی نێوان ئێران و لوبنان پچڕا و بەختیار سەرکەوتووانە سواری فڕۆکە بوو و هاتە بەغدا. پێویست بە گوتن نییە، کە لەودەمەدا پێوەندییەکانی ئێران و ئێراق لەسەر مەسەلەی کوردەکان کە ئێراق پشتیوانیی لێ دەکردن، سارد و ئاڵۆز بوو، کۆمەڵێک ئێرانی و ئێراقی لە فڕۆکەخانە پێشوازییەکی گەرموگوڕیان لە بەختیار کرد و بردیانە شوێنێکی ئەمن، کە پۆلیس و سوپای ئێراق دەیپاراست. کە ناوی فەرزانم لە نێو لیستی پێشەوازیکەراندا دیت، تاوێک چاوم لێک نا. هاوارە لە من، دیتت چۆن هەڵخەڵەتای؟

بیست کەس لە هاوکارەکانی بەردەستی من نێردرانە بەغدا. ئیتر ئەوەندەم دەسەڵات هەبوو کە دەمتوانی چەند کەسێکیان خۆم هەڵیانبژێرم. ئەوان پێیان ئەسپێردرابوو، وردەکاریی هەوڵ و چالاکییەکانی ئەو تەنانەت ئەگەر پێیان وابێ کەمبایەخیشە، بۆ سەرووی خۆیان واتە تیمسار سەرلەشکر بنێرن. ئەو هیچوپووچە ئەودەم یەکێک بوو لە نزیکترین هاوڕێ و باوەڕپێکراوانی حەزرەتی خاوەنشکۆ، کە دواتر ناپاکیی لە دۆست و مەزن و گەورەترین نانبدەی خۆی کرد. جا چونکە هێشتا زیندووە و لە کالیفۆرنیا و لەندەن ماڵی خۆی هەیە و لەو کەسانەیە کە دەبێ دابدۆشرێن، زیاتری لەسەر دەنووسم. ئەو تیمسار سەرلەشکرە کە دواتر دەرکەوت هەر ئەو خەیاڵە خاوانەی لە بن سەریدایە و دەیەوێ ببێتە سەرۆکی ئاژانسی ئێران، بەختیاری نەک بە دوژمنی حەزرەتی خاوەنشکۆ و ئێران دەزانی، بگرە ئەوی بە کۆسپێک لەبەردەم پێشکەوتنەکانی خۆی دادەنا. لە تاران بەختیار بەبێ ئەوەی لەوێ بێ، دادگایی کرا. ئەو چێشتەی لێیان دەنا، ئەوەندە خەست و سوێر بوو، کە تەنانەت دوو سێ کەس لە پیاوەکانی ئەو تۆمەتبار و تاوانکەرەش لە ریزی دادوەرانی

دادگا سەحراییەکە بوون. هەموو دادوەرەکان یەکدەنگ دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانەکەیدا لە سەرانسەری ئێران و لەسێدارەدرانەکەیان پەسند کرد. بڕیاری ئیعدامەکەی ئیتر بوو بە یاسایی و پیاوانی ساواک لەسەریان بوو لە هەر جێیەک بیدۆزنەوە گیانی لێ بستێنن. بەڵام هێشتا کەس نەیدەزانی لە کوێ دەژی. جاری وابوو لە ڕۆماوە خەبەری دەهات و دواتر لە ژنێڤەوە. لە بەغدا یەکێک لە پیاوانی ساواک دەتوانێ خۆی لێ نزیک بکاتەوە. بەختیار هەر سەیری دەکا دەزانێ ئەو کابرایە یەکێک بووە لە پیاوەکانی خۆی. ڕاپۆرتەکەی ئاوا نووسیبوو:

"هەر چوومە ئۆفیسەکەیەوە، پێی گوتم: هاتووی بمکوژی؟ فەرموو ئەرکەکەت ڕاپەڕێنە."

تیربارێکی ڕووسی لە دیوارەکە دەکاتەوە و وا دەنوێنێ کە بیەوێ بیداتە دەستێ. پیاوەکەی ئاژانس وا تێ دەکەوێ، ناچار لە ژوورەکە رادەکاتە دەرێ."

ئەو هەواڵە خزمێکی بەختیار گێڕاوێتەوە. من دەقاودەق لە زمانی شێخۆم بیستەوە کە بە قسەی خۆی دەیگوت، چەند رۆژێک بە شوێن بەختیارەوە بووە لە بەیرووت و ئەودەمەی کە چەند مانگێک لە زیندان بوو، لە بەغدا ژیاوە.

هاوینی 1349 هەواڵ هات، کە دوو کەس فرۆکەیەکی ئێرانییان بە زەبری دەمانچە ناچار کردووە ڕووی خۆی بەرەو بەغدا وەرسووڕێنێ. ئەوە شاکاری من بوو و پلەی منی لە سیخوڕێکی گەڕۆکەوە کە لە زانکۆ و نێو حیزبدا بخولێتەوە و سەری خۆی بە فەرزان و شێخۆوە بخافڵێنێ، بەرز کردەوە و منی کردە هاودەم و هاودەنگی تیمسار سەرلەشکر و لەویش ژوورتر و، بووە هۆی ئەوەی بتوانم چاوم بە حەزرەتی خاوەنشکۆش بکەوێ. ئەوە شتێک بوو کە من لە ترۆمبێلەکەدا بۆ تیمسار سەرلەشکرم باس کرد. ئەو هەوڵە ئازایانەیە چەند مانگی خایاند. وردەکاریەکانی دەبێ چەند مانگیان تەمرین بۆ بکرێ. پیاوکوژێکمان لە ئەمریکای باشوورەوە بەکرێ گرت. چەند وشەیەکی فارسیمان فێر کرد بۆ ئەوەی پیاوکوژەکانی ئێمە رابێنێ. فرۆکەوانەکان دەبوایە ئامادە و ئاگادار بکرێنەوە و سەریان لێ نەشێوێ و لە هەمبەر کاردانەوەی مسافیرەکاندا ئارام و لەسەر خۆ بن. ڕاهێنانی فرۆکەڕفێنەکانیش ماوەیەکی خایاند. چەند حەفتە کارەکە وەدوا کەوت. یەکێک لە فرۆکەڕفێنەکان نەخۆش کەوت و نەیتوانی بەشداری تەمرینەکان بێ. دەبوو تەواو ئەو کارانە بە نهێنی بمێننەوە. سەرۆکی ساواکیش ئاگای لەو شتانە نەبوو. فرۆکەڕفێنە ڕاهێنراوەکان تەنانەت دوو پیاوکوژە مسافیرەکەشیان نەدەناسی. هەموو کارەکان بەدەست خۆمەوە بوو و من فەرماندەیان بووم. ئەو فێڵە، سەرنج و متمانەی بەختیار وەها رادەکێشێ کە بەڵێ فرۆکەڕفاندنەکە یەکێک بووە لەسەرکەوتنەکانی خۆ ی دژی حەزرەتی خاوەنشکۆ، کە فەرمان دەدا هەردووکیان ببنە پاسەوانی تایبەتیی خۆی. یەکێک لە پیاوکوژەکان ڕۆژێکیان لە کاتی ڕاودا فیشەکێک لە بەختیار دەدا و دەیکوژێ. ڕاگەیەنراوی دەوڵەتی ئێراق گوتی، بەختیار لە سۆنگەی هەڵەی ڕاوچییەکەوە کوژراوە، بەڵام ئەو ڕاوچی و برادەرەی دوو پیاوی ساواک بوون، کە پێیان ئەسپێردرابوو حوکمی ئیعدامەکە جێبەجێ بکەن. حەزرەتی خاوەنشکۆ خۆی لە چاوپێکەوتنێکی ڕێکەوتنی 4ی فێبریوەری 1974ـدا لە زوریخ کە لێیان پرسی:"ئاخۆ حەزرەتی خاوەنشکۆ بەختیاری کوشت؟" فەرمووی:"ئەوە ئێمە نەبووین، ساواک بوو."

لەمەودوا ئیتر من خۆم یەکێک بووم لە سەرکردە پلەدووەکانی ئاژانس و ئیتر قسەم وەعەرزی نەدەکەوت. بەڵام بە رواڵەت هەر بۆ شوێنەونکێ هێشتا هەر لەو بەشەدا هاوکاری دوو دکتۆرە ساختەکە بووم و لەسەر ئامانجەکەی خۆم واتە سۆراغگرتنی روقیە و رزگارکردنی لەو بەڵایەی بەسەر خۆی هێناوە، سوور بووم.

کۆتایی بەختیار هاوکات بوو لەگەڵ ئەو مانگانەی من هەوڵم دەدا خۆم بخەمە نێو بەشی لێپێچینەوە و لێپرسینەوە و پاش خەڵەتاندنی دکتۆر بیژەن و دکتۆر جیهانگیر کە بەڵێ دەمەوێ شوێن پێی روقیە هەڵگرم و فێری شێوازی شاپەرستیی بکەم و هەمیشە هەر لە ژووری زانیارییەکان لە خزمەتی خۆیاندا دەبم، چوومە بەشی بەرپرسی ڕاوەدوونان لە بندەستی تیمسار سەرلەشکردا. خۆ دەمبینن کە من خۆم کابرایەکی نەرمونیان و بە بەزەیی نیم، بەڵام چونکە ئەم خوێنمژە دەستی هەزار شمر و چەنگیز و تەیمووری لە پشتەوەرا بەستبوو، سەرکردەکانی دیکەش هەر پێیان دەگوترا

تیمسار، ئەمەیان بۆ ئەوەی دیار بێ کامەیانە و، خۆیشی بزانێ کێیە چاوێکی لەسەر کردووەتە چوار چاو، ناوی دەنێم تیمسار سەرلەشکر. من خۆم ئیتر لە هاوینی 1349ـەوە ئەوە دوازدە ساڵ بوو کە لە ئاژانسدا کارم دەکرد و کەم و زۆر لە پەروەندەکاندا دیتبووم کە چۆناوچۆن تۆمەتبار و تاوانباران وا لێ دەکەن دان بە شتەکاندا بنێن، بەڵام جانەوەری ئاوام قەت نەدیتبوو.

ڕۆژێکیان بە پێشنیاری دکتۆر بیژەن و دکتۆر جیهانگیر و سەرۆکی ئاژانس چوومە ژوورەکەی. لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو و تا چەند خولەکێک سەری هەر هەڵنەبڕی. وەک بڵێی ئاگای لە ئێمە نەبووە. ئەگەرچی سەرجووخە (مفەوەز)ـێک پێشتر پێی ڕاگەیاندبوو کە من هاتوومەتە سکرتاریا و ئیجازەی چوونەژوورەوەی بۆ وەرگرتبووم. سەیرم کرد لاساییکەرەوەیەکی ئەوەندە لێزانە هەر نەبێتەوە. وک بڵێی قەت نەیناسیبێتم و نەیدیتبێتم. باشی لێ شارەزا بوو و جوان دەوری دەگێڕا. خەریکی هەڵدانەوەی پەروەندەیەکی ناسک بوو. ئینجا سەری هەڵێنا و بەبێ ئەوەی ئیجازە بدا دانیشم، نیوسەعاتێک باسی گەورەیی ئێران و خۆشەویستیی شا لە دڵی خەڵکە شاپەرستەکەدا بۆ کردم کە لەگەڵ خوێن و دەماری ئێرانیاندا تێکەڵ بووە و بە دەمارەکانیاندا دەگەڕێ و شتی دیکەی لەو چەشنە. هەر دەتگوت ئەو شتانە لە ڕووی نووسراوێکەوە کە هەمیشە لەبەر دەستی بوو، دەخوێنێتەوە. لە نێو قسەکانیدا ناوی ڕوقیەشی هێنا: "ئەوە نیشانەیەکی باشە، کە وازت لە خانەوادەکەی خۆشت هێناوە و ئامادەی بە دڵ و گیان خزمەتی حەزرەتی خاوەنشکۆ بکەی.

ئینجا دەستی بە دوگمەیەکدا هێنا و کابرایەک بەناوی خاتی هاتە ژوورەکەی. منی بەو ئەسپارد و ئەمری کرد لە ژووری چاوەڕوانی چاوەڕێ بم. پێم وایە دە خولەکێکی خایاند، خاتی هات و لەگەڵ خۆی بردمییە هۆڵێک، کە کۆمەڵێک پشکنەر دانیشتبوون و هەندێکیان بەپێوە ڕاوەستابوون و منی بەوان ناساند.

چەند مانگێک من خەریکی پەروەندەخوێندنەوە بووم و شێوە و ڕێگەکانی قسەدەرکێشان فێر بووم. یەک دوو جاریش لەگەڵ چەند کەسێک لە لێپێچینەوە لە تاوانبار و گیراواندا بەشداریان کردم. گرینگترین مەئموورییەتی من لە چەند مانگی یەکەمدا چاوترسێنکردنی کوڕە بەرپرسێک بوو، ئەویش بە پشتقایمیی یەکێک لە بەرپرسە پلەبەرزەکانی حکوومەت و ژەنەراڵێک کە خزمی ژنەکەی بوو. ئەو ئەرکە وەک تاقیکردنەوەیەک وابوو، کە ئاخۆ من کاری قورسترم پێ دەکرێ یان نا؟

سەربەڕێوەبەر* نەیدەویست مل بۆ ئاژانس ڕاکێشێ و کارمەندێکی خۆی کە تۆمەتبار بوو بە هاوکاریی قوتابییانی کۆنفدراسیۆن لە ئەورووپاوە بانگ بکاتەوە و ڕادەستمانی بکا. ئەم مەئمووریيەتەش زۆر پێویست و بەسوود بوو. چونکە لە فەرتەنەکەی بەختیارەوە ڕوانگەی ئاژانس و میدیاکان هەموو چووبووە سەر چالاکیی کۆنفدراسیۆن لە ئەورووپا و ئەمریکا. زۆربەی قوتابییەکان هەڵیاندەکوتایە سەر کونسولگەرییەکان و داگیریان دەکردن و سووکایەتییان بە کارمەندانی باڵیۆزخانەکان دەکرد، کەلوپەل و مێز و کورسی و مەکینەی تایپیان دەشکاندن و وێنەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆیان دەدڕاند و جاری واش بوو چەند سەعاتان شتەکان پێکدا دەدران تا پۆلیس دەهات و دەریدەکردن و دەیگرتن. جا کە باڵیۆزخانەش ساکاڵای دەبردە دادگا، بڕە پارەیەک لە قوتابییەکان دەستاند و دەبڕایەوە. زۆربەی جاران ئەو بڕە پارەیەشیان لە سندووقی کۆنفدراسیۆن دەستاند کە لە زۆربەی شارەکانی ئەورووپا و ئەمریکا لقی هەبوو. کەوابوو بەرەنگاربوونەوە و بەگژ ئەوانەداچوونەوە لە ڕوانگەی ئاژانس و پێگەی حکوومەتی پادشایەتی و گەورەیی حەزرەتی

* سەربەڕێوەبەر: واتە بەڕێوەبەری هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکان. من ئەوەم پێ لە بەڕێوەبەری گشتی دروستترە.

خاوەنشکۆوە، لە سەرووی هەموو شتێکەوە بوو. جا وەرە لەو دەمەدا فەرخە بەرپرسێک کە گونی خۆی و پیاز لێک ناکاتەوە، بێ و پێشی هەوڵ و تێکۆشانەکانی ئێمە بگرێ. من و ژنێکی ژیکەڵە پێمان ئەسپێردرا حەیای ئەو خوێڕییە بەرین. کارێکی ئاسان نەبوو. چەند رۆژان لەگەڵ ژنە تەمرینمان کرد. ئەو بوو بە ژنێکی ناز و لەنجەفرۆش ـ لەو ژنانەی دەستی هەموو کەسیان پێ رادەگەیشت ــ و منیش پیاوێکی بەدەمار و بەغیرەت. دوو سێ رۆژان باش کارمان کرد. گاڵتەجاڕ بوو و شێلگیریش. جاری وابوو پێدەکەنین و جاری واش بوو لەسەر جووڵەیەکی هەرزەکارانەی ژنە یان تەوس و توانجێکی من کڵاومان تێکەڵ دەبوو. تا ئەو رۆژەی خاتی هات و تاقیی کردینەوە. ئەو ئەرکەمان وەختێک پێ ئەسپێردرا کە لە یانەی ئەفسەراندا بەزم و ئاهەنگێکی شکۆمەندیان بۆ زەماوەندی ئەم جەنابی سەربەرێوەبەرە لەگەڵ یەکێک لە خاتوونە دەرسخوێندووەکانی بنەماڵەی ژەنەراڵ گرتبوو و لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەیەک باس باسی جوانیی بووکەخان و مێرخاسیی زاوا زێڕینە بوو. چەند مانگ پاش ئەو زەماوەندە وا دانرا بۆ کارێکی پێی ئەسپێردرابوو بچێتە ئیسفههان. من و خانمە ژیکەڵەش سواری ترۆمبێل بووین و رێک لەو هوتێلە دابەزیین کە ئەوی لێ بوو. شەوێ لە هوتێلی شاعەباس کۆمەڵێک خواپێداو خەریکی خۆشی و رابواردن دەبوون و بۆ ژنە ژیکەڵەکە کارێکی ئەستەم نەبوو کە بە ناز و لەنجە دڵان بڕفێنێ و جەنابی سەربەرێوەبەر هەڵخەڵەتێنێ. هەردووکیان پاش نانخواردن و خواردنەوەی مەشرووب چوونە ژووری خەو، بۆ ئەوەی چەند سەعاتێک پێکەوە بن. نیوسەعاتێکی نەبرد، منی برا چکۆلەتان کە بەحیساب مێردی خانمە ژیکەڵەکە بووم، بە کەشم و نەشمەوە لەبەر دەرگای ژووری خەوەکەیان راوەستابووم و لە دەرگام دەدا. کاکم حەزی لێ نەبوو دەرگای ژوورەکە بکاتەوە و هات و هاواری منیش کە جار بە جار بەرزتر دەبۆوە و پاڕانەوە و لاڵانەوەی ژنە ژیکەڵە ناچاری کرد دەسبەجێ هەر بە بندەرپێکەیەوە بێ و دەرگاکە بکاتەوە. وەژوورکەوتنی من و مل لەبەرملنانی کابرای مێباز و تێهەڵدان لە ژنە و هەڕەشەی کوشتن ئەوەندە حەیابەرە بوو، کە خزمەتکارەکانی هوتێل و بەرێوەبەری هوتێلەکە کۆ بوونەوە و لێکیان کردینەوە و وا دانرا هەر ئەو شەوە پۆلیس لەو مەسەلەیە ئاگادار بکرێتەوە. من دەستی خانمە ژیکەڵانەکەم گرت و لەوێ بۆی دەرچووین. بەیانییەکەی بەرێوەبەری هوتێل نامەیەکی دا بە جەنابی سەربەرێوەبەر، کە شەوی پێشتر یەکێک بۆی لە کونی کلیلی دەرگای ژوورەکەی ئاخنیبوو. لەسەری نووسرابوو: "ئاوا پیاو بەبووک دەبەن."

کاکی سەربەرێوەبەر زۆر لەوە ئاقڵتر بوو نەزانێ ئەو بزەیان لە کوێوە پێوە کردووە. هەڵبەت یەکێکی دیکە لە ئەرک پێ ئەسپێردراوەکانم ئەوەش بوو کە حەیاچوونەکەی ئیسفەهان لە هەموو جێیەک بەتایبەتی لە نێو دۆست و کارمەندەکانی بندەستی جەنابی سەربەرێوەبەردا بڵاو بکەمەوە.

کاری لەو چەشنە و پێکهەڵپڕژان لەگەڵ تازە مامۆستایەکی زانکۆ، کە لەکاتی گوتنەوەی مێژوودا باسی ئازادی و دیموکراسیی دەکرد و جاروبارە ئاماژەیەکی بە سەرەڕۆیی و دەسەڵات و ماڵ و سامان و پێگەی دەسەڵاتداران دەکرد و مەبەستیشی دیارە "شا" و ئاژانس بوو، لە رێگەی نێوان "چیزەر و دزاشیب" یەکێکی دیکە بوو لە ئیمتیحانەکانی من بۆ دەرچوون لە بواری لێپێچینەوەدا.

خولی راهێنان و تاقیکردنەوەکەم هێشتا تەواو نەببوو کە رووداوەکانی سیاهکەل روویان دا و لە رێبەندانی 1349 بە دواوە هەرچی کارمەند و سیخوڕ و قوڵەچۆماغی ئاژانس بوون دژی چریکەکان رێک خران. تا ئەو دەم من لە لێپرسینەوە و لێپێچینەوەکاندا بەشدار نەدەبووم. جار و بارە کە کار دەگەیشتە ئەوەی لە کابرای تێکدەر هەڵدەن، من سەیرم دەکردن و بەشێکیش لە راهێنانەکانم ئەوە بوو چاودێر بم و لەگەڵ تۆزە تەمبێکردنێک رابێم تا خراپکاران دان بە تاوانەکەیاندا دەنێن. هاوکارە رێزدارەکانم رێگەیان نەدەدام بەشداری تۆقاندن و ترسوەبەرنانەکانیان بم. بەڵام وەختێک لە رێبەندانی 1349ـدا یەکەم هێرشی چریکەکان دەستی پێ کرد، ئیتر راهاتوویی بێ مانا بوو. هەمووان دەبوایە دەست بەکار بن. یەک دوو هێرشی چریکەکان بۆ سەر پۆلیسخانەکان و دەستگرتن بەسەر بانکەکاندا و تێهەڵچوونەکەی

سیاهکەل کە لە ئاکامدا پانزەکەس ئیعدام کران و بە شوێن تۆ کەسی دیکەوە بوون کە وێنەکانیان لە دار و دیوار دابوون، ڕووداوێکی سامناک بوو. من کە سەیری ئەو وێنانەم دەکرد هەڵدەلەرزیم. نەکا روقیە یەکێک بێ لەوان. ڕۆژێکیان مووساگیان کە ببووە سەرۆکی بانکی لاهیجان، تەلەفۆنی بۆ کردم و ئەحواڵمی پرسی. پێم سەیر بوو، دەمێک بوو ئاگام لێی نەمابوو. لە روقیەی پرسی:

"پێم وایە لە فـوومەن دیتوومە. ئەو نەیناسیمەوە. بەڵام دڵنیام خۆی بووە. چیی بانگم کرد، روقیە، روقیە.. یان نەیبیست یان نەیدەویست تووشم بێ. ئەی هیچ ئاگات لێی نییە؟ مێردی کردووە؟ لە فۆمەن چ دەکا؟ ئەگەر لەدەستم بێ، هەموو شتێکی بۆ دەکەم. ئامادەم لە بانکیش ئیشێکی بدەمێ."

ئیتر گومانم نەما کە روقیەش چووەتە گەڵ چریکە فیدارییەکانەوە و هەر ئەمڕۆ و نا سبەی لەوانەیە وێنەی ئەویش بە دیوارانەوە بدەن. راستە من حیسابی خۆمم لە هیی روقیە جوێ کردبۆوە، بەڵام نیگەرانیی دایکم ئۆقرەی لێ بڕیبووم. هەر شتێک بێ، لە داوێنی دایکم بەربۆوە و کچی دایکم بوو. دڵنیا بوومەوە کە مووساگیانیش یەکێکە لە سیخوڕەکانی ئاژانس. شتێکی لەبارەی روقیەوە بیستووە و ئێستاش دیتنەکەی ئەوی لە فوومەن کردووەتە بیانوو بۆ ئەوەی من ئاگادار بکاتەوە و نەک ئەو لە فوومەن بووە و نە روقیەی دیتووە و نە بانگیشی کردووە.

لە خولی راهێنانی لێپێچینەوە و لێپرسینەوەدا چەند هەفتەیەک لە ئێڤین مامەوە. هەر جارێکی دەرفەتم دێنا، لە کونی دەرگاکەوە سەیری ئەو ژوورانەم دەکرد کە هاوار و ناڵینیان لێوە دەهات و دەترسام لە نەکاو چاوم بە روقیە بکەوێ. جارێکی کچۆڵەیەکی وشکەڵاتووی داماوم دی، دەمەویست بڕوا بەخۆم بێنم کە ئەوە خوشکمە. بەڵام نەموێرا جارێکی دیکە بگەڕێمەوە و لە کونی دەرگاکەوە سەیری بکەمەوە.

نایشارمەوە کە من لە قۆناغی راهێناندا ئامرازەکانی ئەشکەنجەکردنم زۆر دیتووە. قەمچی و داری کارەبایی و گاز و کەلوپەلی دیکەش. بەڵام مامۆستاکەمان واتە جەنابی دکتۆر فەرید کە لە ئەمریکا فێری ئەو هونەرە پیرۆزە ببوو و لەو فرۆکەیەدا کە بەربۆوە گیانی بە نیشتمان بەخشی، ئێمەی قوتابییانی لێپێچینەوەی دڵنیا دەکردەوە کە، ئیتر ئەم ئامرازانە کەلکیان لێ وەرناگیردرێ. ئەمانەیان لە یەکەم ساڵەکانی سەردەمی سەرۆکایەتیی تەیمووری بەختیار لە ئیسراییلەوە هێناوە و، ئیتر کۆن بوونە و کاریان پێ ناکرێ. جەنابی حەزرەتی خاوەنشکۆ خۆی لە دیمانەیەکدا فەرموویوویان: "ئێمە کەرەستەی جەنگی دەروونیمان هەیە کە زۆر لە شێوازەکانی ئەشکەنجەی سەدەکانی ناڤین کاریگەرترن."

جا منیش کە زۆر ئیمانم بە وتەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆ هەیە، فەرموودەکانی ئەوم قبووڵە. بەڵام ئەوەی لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەی وڵاتدا خوێندوومەتەوە ئەو ماوەیەی لەوێ ژیاوم و ئەوەی لە پەروەندەی چریکەکاندا خوێندوومەتەوە ئەوانە دەگێڕمەوە و راست و درۆی ئەو شتانە بۆ خوێنەران بەجێ دێڵم.

من خۆم هەرگیز لە ئەشکەنجەدانی هیچ تاوانبار یان تۆمەتبارێک یان چریک یان تێکدەرێکدا بەشدار نەبووم. لە ڕاڕەوە دووروودرێژەکانی بەندیخانەی ئێڤین دیتم جەللادێک بە قەمچییەک کچێکی رووت رووتی وەبەرخۆی داوە و لەبەروبەری ڕاڕەوەکە ئێمەی ساواکی راوەستابووین و دیتمان کە جار جارێ یەکێک لە پیاوەکانی ساواک پێلەقەیەکی لە کچەکە دەدا و دەیخست و دیسان بە زەبری قەمچی وەپێش خۆی دەداوە. ساتێک بەرچاوم تاریک بوو، دڵم تێکەڵ هات و، ئەژنۆم لەرزین و وەمزانی ئەوە روقیە و خێزانەکەم و دایکمن کە قوونی رووتی رادەکەن و دەکەون و دەزریکێنن و ئیتر ناتوانن هەستنەوە. کە لە نەخۆشخانە وەهۆش خۆم هاتمەوە، نەمدەزانی چیم بەسەر هاتووە.

هەر ئەوەندە پێیان گوتم، خولی راهێنانەکەم تەواو بووە و تەنیا لێپرسینەوەی هێمن و بێ هات و هەرام پێ دەسپێردرێ. ترسی وەم بوو هەر یەکسەر لە ئاژانس دەرم بکەن. بەڵام تیمسار سەرلەشکر گەورەیی کرد و بێ و نەبێ لای خۆی گوتوویەتی ئەو یارۆیە کۆمەڵێک زانیاریی لەسەر شێوازی کارکردنی ئێمە بەدەستەوەیە و باش نییە هەروا

بەرەڵای بکەین بڕوا. بەتایبەتی کە لە پەروەندەکاندا ئاگاداری پێوەندیی نێوان من و شێخۆ بوو و، بۆیان باش نەبوو لەو قاسید بن. لەبەرچی؟ لێم روون نییە. بەڵام هەر کەسە و گونڕەشێکی هەیە.

ئەوەی من لە پەروەندەکان و لە قسەکردن لەگەڵ رزگاربووانی زیندانی ئێڤین و ژێرزەمینەکانی شارەوانی لە ئەورووپا لێم روون بۆتەوە، دەینووسمەوە، چونکە ژیانی من دەبێ هەرچۆنێک بێ لە غوربەتدا تێپەڕێ.

ئەو رووداوانەی لە رێبەندانی 1349ـەوە تا بانەمەڕی 1350 قەومان، بە رای فیداییەکان و (جانباختەگان)ەوە [*]، حەماسەیەکی لەبیرنەکراوە. لەم بەشەدا من دەستەواژەکانی خۆیان بەکار دێنم ــ بە رای ئێمەی ساواکی هەموو تێکدەران خایین و گەمژە و شێت و.. با دووپاتەی نەکەمەوە ــ لە روانگەی حەزرەتی خاوەنشکۆشەوە ئەوان کۆمەڵێک گەنجی گەوجی کەللەکەر بوون، کە دەیانەویست پێشی پێشکەوتنی وڵات و میللەتەکەمان بگرن. چونکە جەنابی حەزرەتی خاوەنشکۆ رایگەیاندبوو کە لە وڵاتەکەیدا هەموو جۆرە ئازادییەک هەیە، جگە لە ئازادیی خیانەتکردن.

من ناوی تاقەسواری ئەو حەماسەیە ناهێنم. دەزانم کە رۆژی پێنجی خاکەلێوەی 1352 لە بەندیخانە رایکرد و تا ئێستا سەرەڕای ئەو هەمووە لێکۆڵینەوەیە لە مووساگیان کە لە ئێرانە و یەکێکە لەو ساواکییە لێزانانەی سات و سەودایەکی لەگەڵ من هەیە و، لە شێخۆش کە ئەوکاتی لە لەندەن دەژیام بەردەوام دیتوومە و لەو بوارەدا لەگەڵ ئەویش هێناومانەتە بەر باس، هیچ زانیارییەکم دەست نەکەوتووە کە ئاخۆ ئەو ژنە هێشتا زیندووە یان نا و، لە کوێ دەژی و چ دەکا و ئاخۆ هێشتا هەر لەسەر باوەڕەکەی خۆی سوورە یان نا. تەنانەت فەرزانیش کە دواتر لە ئەوووپا لەگەڵی بوومە برادەر، هیچ هەواڵێکی ئەو ژنەی نەبوو. بەڵام دەزانم کە ئەو کچە بیستوچەند ساڵانە، چەند مانگان پاش گیرانەکەی هەر لە تەختی ئاسنین بەسترابۆوە و رۆژێ سێ جار ئەویش بە هات و هەرا و جنێو و قسەی ساردوسووک بە بەندییەوانەکان، ئیجازەی دەدرایە بچێتە ئاودەست. بە قەمچییەکی سیمیی کارەبایی لێیان دەدا و بە باتۆن شوێنە هەستیارەکانیان دەسووتاند. جارێک هەوڵی دابوو بە چەنگاڵ قورگی خۆی هەڵدڕێ و خۆی بکوژێ. بیستبوویەوە کە ئازادیخواز و شۆڕشگێڕی بەرازیلی بە ددان زمانی خۆی لەت کردبوو بۆ ئەوەی نەتوانێ وەڵامی پرسیاری لێپێچەرەکان بداتەوە. ویستی لاسایی ئەو بکاتەوە بەڵام بۆی نەچووە سەر. ئەو کچ ەلێ لەبەرچاوی چەند پیاو لەسەر زگ راکێشا. رووت و قووت بوو. پیاوێک هەوڵی دا زینای لەگەڵ بکا. ئەوەش تەنیا بە ئیجازەی تیمساری سەرلەشکر دەکرا. بە گاز هەموو گۆشتی لەشیان دەپچڕی و قسەی نەدەدرکاند. من خۆم چەند جاران لە ژوورێکی تەنیادا لەگەڵ ئەو ژنەی لەبەر دەرگاوە راوەستابوو بۆ ئەوەی نەهێڵێ را بکا، بە زمانێکی خۆش ئامۆژگاریم کرد. جنێوی دەدامێ و پێی دەگوتم، جەللاد و بێگانەپەرست. گوێم نەدایە. هەر پاتەم دەکردەوە: "بۆچی خۆت ئاوا ئازار دەدەی؟ بۆچی بەزەییت بەخۆتدا نایەتەوە؟ بۆچی فریوی کۆمەڵێک خەڵکی نەزان دەخۆی. بیر لە دایک و باوکت بکەوە. ئەوان ئازار دەچێژن. ژیانیان فەوتاوە. برایەکت بە کوشتن دا. برا چکۆڵەکەشتیان گرتووە. هەر ئەوەندە بنووسە برادەرەکانت کێن، بەر دەدرێی. پارەت دەدەنێ، دەتوانی بچی بخوێنی. بۆکوێت حەز لێ بوو سەفەر بکەی. ئەوەندە مەڵێ "گەل"، "گەل". ئەوانە کێن؟ مەگەر من گەل نیم؟ من بەزەییم پێتدا دێ. من دژی زۆر شتم. حەزرەتی خاوەنشکۆ..."

لە ناکاو وەک نێچیرێکی زامار ئامبازم دەبوو و دەیەویست پێم هەڵپڕژێ و جنێوی دەدا و قسەی ساردوسووکی پێ دەگوتم و دوایی هێور دەبۆوە و گۆرانیی دەچڕی: "برۆ ئەو داوە دانێ بۆ مەلی تر... هەڵۆ هێلانەکەی زۆر بەرزە قوربان."

دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە حەزرەتی خاوەنشکۆ ئەمری فەرمووبوو، هیچ ژنێکی چریکی نەکوژرێ. دیارە بەزەیی ئەو لە جێی خۆی، بەڵام ترسی میدیا بیانییەکانیش لەگۆڕێ بوو و نەدەبوایە بیان  وو بدرێتە دەستی بەرهەڵستکاران.

---

[*] جانباختطان: طيانبةختكردووان، ئةوانةش تاقمي◌َكي ديكة بوون.

بەتایبەتی کە قوتابییەکانی کۆنفدراسیۆن، کە هیچ کەس نازانێ چۆن دەیانزانی و ئەو زانیارییانەیان لەکوێ دەست دەکەوت و لە رۆژنامەکانیاندا بڵاویان دەکردنەوە. چونکە کچە دەیزانی ناتوانن بیکوژن، دوازدە رۆژان مانی لە خواردن گرت. ئاوی کوڵیو بەقورگداکردن و هەڕەشەی لێدانی دەرزییەکی قسەدرکێنیش هیچ کاری تێ نەکرد. برا بچووکەکەیان کە شێت ببوو، هێنایە لای. هەر مێشێکیشی میوان نەبوو. گووی خۆیان لە زاری کرد و لە دەموچاویان هەڵسوی. ئاخری هیچ چار نەما جگە لەوەی دەستی لێ هەڵگرن و بە شێتی لەقەڵەم بدەن.. لەو سەعاتانەدا کە ئەشکەنجەیان نەدەدا، شیعرەکانی وان ترۆی ڤێتنامیی بە گۆرانی دەگوتەوە.

تۆمەتی ئەو کچە ئەوە بوو کە لە نووسینی تراکت و بانگەشەکانی سیاهکەلدا بووە و لەسەر دیواران شیعری نووسیوە: "ناکشێینەوە هەنگاوێ هەتاکو دەمی مردن."

ئەوە تەنیا دروشمێک نەبوو. ئەوانە هەر هەموویان ئیمانیان بەو شتانە هەبوو. ئەو شتەی کە من هەر نەمدەزانی چییە. چۆن بنیادەمێک دەکرێ بە لێکدانەوەیەکی بێ بنەما و نازانستییانە بەڵام خەڵک خەڵەتێن کۆمەڵێک خەڵک باوەڕمەند بکات بەبێ ئەوەی یەکتریان دیتبێ و ناسیبێ و وایان لێ بکا لەو رێیەدا گیانی خۆیان بەخت بکەن. یەکێک لەوانەیان لە کاتی بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەکاندا گرت. ناوی ناهێنم. نازانم زیندووە یان مردوو. پەروەندەیەکی زۆر قورسی هەبوو. کاربەدەستەکان هەموویان ئەویان نیشانی یەکتری دەدا. دەستێکی پێنج سەنتی مەتر لە دەستەکەی دیکەی کورتتر بوو.

لە کاتی بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەکاندا گرتبوویان. یانی بوو بە تێکهەڵچوونێک و ئەنگاوتیان. هاوڕێ ماتۆڕسوارەکانی رایان کرد و پاسەوان و ساواکییەکان نەیانتوانی بیانگرن. نەیانتوانی ناو و نیشانی راکردووەکان لەو بریندارە وەرگرن کە برینەکەی کێم و چڵکی کردبوو و ئیتر نەشیدەتوانی بجووڵێ. چونکە بێهۆش کەوبتوو و تەنانەت فریا نەکەوتبوو بەو حەبە سیانۆرەی پێی بوو خۆیشی بکوژێ. دەیانبردە ئەشکەنجەگا و ئەشکەنجەیان دەدا. دیسان ناتوانن هیچ زانیارییەکی لێ وەرگرن. جارێکی دەرفەت دێنێ و لە پەنجەرەوە خۆی هەڵدەدێرێتە حەوشەکەوە. هیچی لێ نایە، تەنیا تەقەڵەکانی زگی دەپسێن. هەوڵەکەی بۆ ئەوەی دڵ و ریخۆڵەی خۆی بێنێتە دەری تا بمرێ، سەری نەگرتبوو.

هەمووان وایان دەکرد.

گەنجێک لەگەڵ برای ئەو کچە چریکەی لەسەرەوە باسم کرد و گوتم چۆنیان ئەشکەنجە دەدا، گوللەی وێ کەوت و لەو چرکەیەدا کە تەنیا کەوتەوە، سیانیدەکەی قووت دا بۆ ئەوەی هاوڕێکەی پێوە نەکا. ئەوانە هەمووان بەیەکتریان دەگوت هاوڕێ. رفاندیانە خەستەخانە بۆ ئەوەی نەهێڵن بمرێ. بەڵام مرد و ئەو پرستارەی نەیتوانیبوو رزگاری بکا، درایە دادگا و سزا درا.

ئەو دەمەی لە برای کچە ئەشکەنجەدراوەکەیان دەپرسییەوە و ئەشکەنجەیان دەدا، هاوار و جنێو و ناڵینەکەیان لە سەر شریتێک راگرت و لە کاتی لێپرسینەوەدا بۆ برا بچووکەکەیان گرت، یانی ئەوە هەر ئێستا خەریکین برا بچووکەکەت ئەشکەنجە دەدەین، تۆ ئەگەر نهێنییەکان بدرکێنی، ئەو رزگار دەکەی. برا بچووکەکەیان ئەوەندەی زۆر لێ کرا، مێشکی تێک چوو و، رۆژێکیان لاقی خاتیی گەست و ئیتر ئەقڵی لەکار کەوت. لەو سۆنگەیەوە دووهەزار تمەنیان بە خەڵات دایە خاتی.

چریکێکی دیکە، هاوڕێیەکی خۆی پێوەی دەکا. لە بگرە و بەردەدا چەکەکەی لێ دەستێنن و دەیخەنە نێو ترۆمبێلەوە. ئەوەندەی یەک و دوو سیانیدەکەی قووت دەدا و ئاڵقەی ئەو نارنجۆکەی لە بن کراسەکەی شاردوویەتەوە رادەکێشێ و دەیخاتە پێش سەیارەکەوە. خیانەتکارەکە دەیەوێ فرێی بداتە دەرێ، نارنجۆکەکە دەتەقێتەوە و هەردووکیان دەمرن.

چریکێکی دیکە بەناوی چەنگیز لە تێهەڵچوونێکی بەهاری 1350ـدا توانیی خۆی رزگار بکا. لە رەزبەری هەر ئەو ساڵەدا ئەو خانووەیان گەمارۆ دا کە ئەوی تێدا دەژیا. بەگژ دوو مەئموورەکەدا هاتەوە و دوایین فیشەکی بە ساواکییەکانەوە نا و بە نارنجۆکێک خۆی کوشت.

برای کچە ئەشکەنجەدراوەکە پازدە رۆژ تاقەتی هەموو ئەشکەنجەیەکی هێنا. هێندەیان بە مست و پێلەپە لێ دابوو گورچیلەکانی دڕان و خوێنی دەمیزت. دڵی راوەستا و مرد. گوتیان بە مشار هەر دوولاقیان بڕییەوە و بە تەور پەنجەکانیان پەڕاند.

ئەشکەنجەکان هەر بەو شێوەیە نەبوون. وەک حەزرەتی خاوەنشکۆ فەرمووبووی، ئاژانس کەرەستەی رۆحپڕووکێنی هەبوو، کە زۆر لەو ئەشکەنجە سەدە ناوەڕاستیانە کاریگەرتر بوون.

چەند لەگەنێکی خوێناوییان پێشانی کچە ئەشکەنجەکراوەکە دا، کە براکەی پاش نەخۆشکەوتن تێیان رشابۆوە.

بە برایەکیان گوتبوو: "ئەگەر قسە نەدرکێنی و ناوی دۆست و هاوڕێکانت نەڵێی، خوشکەکەت بە رووت و قووتی دێنینە لات، بۆ ئەوەی غیرەتت بجووڵێ."

یەکێکی دیکە لە رێگەکان، شانۆی ئیعدامکردن بوو.

کەڕەی بەیانی بە مەبەستی گوللەبارانکردن زیندانییەکەیان بەچاوبەستراوی لە دارێک دەبەستەوە و دەستەی ئیعدامیان بۆ دادەمەزراند. حوکمی ئیعدامەکە دەخوێنرایەوە. چەند چرکەیەک بەر لە تەقەکردن یەکێک خۆی دەگەیاندێ و هەرای دەکرد: "فەرمان هاتووە ئیعدامەکە راگرن."

من لە هیچ کوێ نەمخوێندووەتەوە بەڵام شێخۆ دڵنیا بوو کە بۆ شکاندنی نەوابی سەفەوی، ژنێکی رووت و قووت لەبەر چاوی سەمای کردووە. یەکێک لە رێگەکانی دیکە نەرمونیانی و بەزەیی کاربەدەستان بوو پاش لێپێچینەوە، بەو مەبەستەی تۆمەتبار لە دادگادا بەخۆیدا بێتەوە و نەیکاتە هەرا، بۆ ئەوەی دادگاییەکە بەبێ سەرئێشە تەواو بێ و هیچ هەواڵێک درز نەکاتە دەرەوە. من ئەقڵم نەیدەبڕی کە دادگا بۆ چ دەبێ. ئەوانە دژی خەون و ئارەزووەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆ بوون، کەوابوو دەبوایە سزا بدرێن. ئیتر ئەو هەمووە دامودەستوورەی بۆ چ بوو؟ بۆ ئەوەی بیان وو بدەنە دەست رۆژنامەکانی فەرەنسا و کۆمۆنیستەکان. من خۆم لە چەند دادگاییکرانی چریکەکاندا بەشدار بووم و جاری وابووە ئەوە تاوانبارەکان بوون کە دەبوونە سکاڵاکەر. خۆ زاریان نەدەبەسرا. یەکێک بەناوی ئەحمەدزادە دوو سەعات بارودۆخی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئێرانی لێک داوە و شێوەی دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی وێنا کرد. هەر ئەو ئاغایە، ئەشکەنجەگەرێکی زۆر باش رەقاندەوە. دەقاودەق قسەکانی لە رۆژنامەکاندا بڵاو بوونەوە. رۆژنامەیەکی دیکە نووسیبووی، کە تاوانباران هەر لە یەکەم رۆژی قۆڵبەستکرانیاندا ئەشکەنجە دەدرێن. لە پێشدا بە قەمچیی سیمیی کارەبایی لێیان دەدەن و دوایی پسپۆڕانی کاراتێ و جۆدۆ لە تێکدەران بەردەبن و زەبری گورچووبڕیان لێ دەدەن بەبێ ئەوەی شوێنەواری بمێنێتەوە. چریکەکان زۆرجاران لەهۆش دەچن و زۆر جاریش هەیە دەست و پێ شکاو دێنەوە ژوورەکانیان. ئەو رۆژنامانە شێخۆ کۆی کردوونەوە و من لە ئەورووپا لەبەرم گرتوونەتەوە و ئێستاش هەر کاتێک پێویست بێ بڵاویان دەکەمەوە.

ئەو لێپێچینەوانە جاری وابووە ساواکییەکان لە زیندانی ئێڤین کردوویانن و جاری واش هەبووە کاربەدەستانی شارەوانی لە ژێرزەمینەکانی بینای شارەوانیدا. کێبڕکێی نێوان شارەوانی و ساواک دەبێتە هۆی ئەوەی هەر کامە و لەوی دیکە بەزەبروزەنگتر و بێ بەزەییانەتر تۆمەتبارەکە ئەشکەنجە بدەن و زووتر قسەی لێ دەرکێشن. بەر لەوەی تۆمەتبار و تاوانبار بمرێ.

چەند رۆژێک بەر لە دادگایی، بە زمانی خۆش لەگەڵ چریکەکان هەڵسوکەوت دەکرێ. خواردنی خۆشیان دەدەنێ و جێی نەرمیان بۆ دابین دەکەن و وا دەنوێنن کە دادگای سوپا سەربەخۆیە و داوەریکردن لەسەر تاوانباران دادپەروەرانە دەبێ. هەر تۆمەتبارەو دەبێ بە دەستوخەتی خۆی بیروباوەڕ و هەوڵەکانی خۆی بنووسێتەوە بەبێ یارمەتیی پارێزەر.

بڕیاری ئاژانس بە واژۆی تیمسار سەرلەشکر لەبارەی تاوانبارانەوە لە پەروەندەکەدا هەیە و کام دادوەر دەوێرێ حوکمێکی پێچەوانەی ئەمری ساواک دەربکا؟

ئاژانس هەوڵ دەدا لە کاتی دادگاییکردندا هیچ ئاسەوارێکی داغ و درەوێشە بە گیانی تاوانبارەوە نەمێنێ و دیار نەبێ. دیارە ئەوە هەمیشە جێبەجێ ناکرێ. ئەوانەی سەردەکەون و دەتوانن قسەیان لێ دەرکێشن خەڵات دەکرێن. ڕۆژنامەکانی فەرەنسا و ئینگلیز ڕایانگەیاندووە کە لە ماوەی مانگێکدا لەبری کاری زیادە و پاداش، سێ هەزار تمەنیان بە ژنێک داوە. لەو کاتەوە تا ئێستا بە ترۆمبێلی پەیکان هاتوچۆی ئێڤین دەکا.

جار هەیە نەگبەتی بەرۆکی ساواکییەک دەگرێ. ساڵی 1349 و 1350، کە چریکە فیداییەکانیان لە داو دەخست، هەندێکیان لە ترسی مار خۆیان دەخستە زاری حەزیاوە. کابرایەک بەناوی حوسێن پوور کە دەیگوت ئەندازیارم، بەبێ پرینگانەوە هەر کەسی دیتبایە ئەوە بێکار بە شەقامەکاندا دەخولێتەوە، بە تۆمەتی ئەوەی خەریکی دیوارنووسینە، دەیگرت و پاش ئازار و ئەزیەتێکی زۆر کە جاری وابوو ئەشکەنجەشی دەکردن، لە بری پارەیەکی زۆر کە لە خزم و کەسەکانی دەستاندن ئازادی دەکردن. لەو ساڵانەدا دروشمنووسین ببووە سەرچاوەیەکی داهات بۆ کەسانی پلەنزمی وەک حوسێنپوور. من هێشتا دڵنیا نەبوومەتەوە، بەڵام پێم وایە هەر ئەو کاربەدەستە ڕۆژێکیان ڕوقیەی گرتبوو و خوشکم توانیبووی لە چنگی ڕا بکا. فەرزان لە پاریس ئەو ڕووداوەی بۆ گێڕامەوە و دڵنیا بوو کە ئەو دەبێ ساڵی 1351 لە بەندیخانەدا بووبێ یان لە ڕیزی ئەو قوربانییانەیە کە تیمسار سەرلەشکر بەرپرسە لە کوشتنیان. بەڵام حوسێنپوور تۆڵەی لێ کرایەوە.

لە نێو دەستبەسەرکراواندا ژنێکی چارشێوبەسەریان لەگەڵ بوو، کە دواتر دەرکەوت کچێکی ئەمریکاییە. ڕۆژنامەکانی تاران کردیانە هەرایەک نەبێتەوە. حوسێنپوور کە لە گوێلەمستەکانی تەیمووری بەختیار بوو و دواتر ببووە شاپەرستێکی خەست و بەکەفوکوڵ، ئەو ڕووداوەی ئەوەندەی دیکە ترش و خوێ کرد:" کە بەڵێ ئێمە سیخوڕ دەگرین، تەنانەت سیخوڕی ئەمریکاییش. ئێران وڵاتێکی سەربەخۆیە و ترسی لە کەس نییە و ئەم کارەیان کردە نوێنگە و نیشانەی لێوەشاوەیی و فیداکاریی ساواک بەتایبەتی داروودەستەی حوسێنپووری ئازیزی بەختیار. کردیانە هەرا و فەرتەنەیەک کە سیخوڕێکی ئەمریکاییان گرتووە، بۆ ئەوەی بیر و ڕای گشتی کە لە سۆنگەی ڕووداوەکەی سیاهکەلەوە وروژابوو، بزانن ئاژانس چەندە ئازا و لەخۆبوردووە. کچەیان ناو نا سیخوڕی ژمارە یەک و لە ماڵەکەشیدا کۆمەڵێک وێنەی هەندێ گەڕەک و ناوچە و دەوروبەری تاران دۆزییەوە و ئیتر مسۆگەر بوو کە نێچیرێکی دابەستەیان دەست کەوتووە، بێخەبەر لەوەی ئەو چاڵەی هەڵیانکەندووە خۆیان تێی کەوتوون.

ئەلیزا، دەسگیرانی یەکێک لە چالاکانی کۆنفدراسیۆن بوو کە ئەوێ ساڵێ 1351 یەکێک بوو لە "کاردار"ەکان. جا چونکە خۆی نەیدەتوانی بێتەوە ئێران، دەسگیرانەکەی ناردەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خزم و کەسەکەی ئاشنا بێ.

ئەلیزا لەگەڵ دایک و باوکی هاوڕێکەی چووبووە ئیسفەهان و شیراز و لەگەڵ چەند چارشێوڕەشێک سەری لە مزگەوتەکان دەدا. لە شاچراغ پیاوەکانی ساواک دەبینن ئەوە یەکێک خۆی کردووەتە ژنەموسوڵمان و چووەتە نێو حەرەمەوە و خەریک بووە ژنە موسوڵمانەکان چەواشە بکا، نەکا زیانێکیشی پێ بگەیەنن. لە تاران شەوێکیان کە لە شەقامێک چاوەڕێی هاتنی یەکێک لە هاوڕێکانی دەسگیرانەکەی بووە، دەیگرن.

نەیانتوانی پەنجەیەکیش لە ئەلیزا بدەن، چونکە چەند ڕۆژێک پاش گیرانەکەی و لەبەر بێتاوانییەکەی داوای دەکرد ئازادی بکەن. پێشنیاریان پێ کرد دان بە تاوانەکەیدا بنێ و پەشیمانی دەربڕێ و نامەیەک بۆ حەزرەتی خاوەنشکۆ بنووسێ پەشیمانیی خۆی دەربڕێ و خۆی ڕزگار بکا. خۆی لەم کارە بوارد کە دەکرا بکرێتە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر بۆ سیخوڕێتیی ئەو. کار گەیشتە باڵیۆزخانەی ئەمریکا، بەتایبەت کە مانگرتنەکەی لە خواردن لە میدیاکانی وڵاتەکەیدا بوو بە هەرا و، کاربەدەستانی باڵیۆزخانە نەیانتوانی یان نەیانویست ئەلیزا قایل بکەن کە مل بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشێ.

بۆ سێیەمجار وشکەمانگرتنی ڕاگەیاند و تەنانەت ئاویشی نەخواردەوە. زیندانییە سیاسییەکانی دیکەش پشتیوانییان لێ کرد و دەیانویست بەکۆمەڵ مان بگرن کە ئیتر ڕۆژنامەکان وایان بڵاو کردەوە سیخوڕە ئەمریکییەکە پەشیمانیی دەربڕیوە و حەزرەتی خاوەنشکۆ لە تاوانەکەی خۆش بووە. بەڵام ئەو هەرایە کە پشتی حوسێنپوور و چەند کەسێکی دیکەی شکاند، بەوەندە نەبڕایەوە. ئەلیزا چۆوە لای دەسگیرانەکەی لە ئەمریکا و وەدرۆی خستەوە کە پەشیمانیی دەربڕیبێ و میدیاکانی ئێرانی بە درۆزن و ئاژانسیشی بە ساختەچی ناو برد و ئیدیعای کرد سووکایەتی بە ئابڕووی ئەو و خەڵکی ئەمریکا کراوە و لە بری هەر ڕۆژێک دەسبەسەرکرانەکەی خۆی داوای چەندین ملیۆن دۆلاری قەرەبووی لە ئێران کرد و دەسگیرانەکەی و کۆنفدراسیۆن و سێ پارێزەری دادگاکانی ئەمریکا بەرگریکردنەکەیان بەئەستۆ گرت و دەوڵەتی ئێرانیان بە دانی بڕەپارەیەکی ئێجگار زۆر وەک قەرەبوو مەحکووم کرد. بۆ پێت وایە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا دەستبەردار بوون؟ ئەو مەسەیەیان کردە کراسەکەی عوسمان و دەهۆڵیان بۆ کوتا تا وای لێ هات دەوڵەتی ئێران ناچار بوو حوسێنپوور دەربکا و بیداتە دادگا.

لەو بگرە و بەردەیەدا، نهێنیەکانی هاوکاریی ساواک لەگەڵ سیا بە تێروتەسەلی لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکادا بڵاو کرانەوە و خرانە بەرباس و، کرانە هەوێن و پێخۆری بانگەشەی حیزبی بەرهەڵستکاری دژی حکوومەتەکە.

بەڵایەکی لەو جۆرەش بەسەر دکتۆر بیژەن کە ناوەکەی خۆی حاجی ساوجی بوو، هات. بەڵام لەوەیاندا شەقێکیان لەو هەڵدا و منیان بەرز کردەوە. دوایی ئەم ڕووداوەتان بۆ دەگێڕمەوە.

لە ڕۆژەکانی پێش دادگاییکردن لە دادگای سوپادا، گورگە خوێنخۆرەکان دەبوونە شوانی میهرەبان و بە زمانی خۆش و تەماح وەبەرنان، کڵاویان لەسەر ساویلکەکان دەنا بۆ ئەوەی نهێنییەکان نەدرکێنن و لە لێپرسینەوەدا باسی ئازار و ئەشکەنجەدان و شتی وا نەکەن، چونکە دادوەرەکان بڕوا بە قسەکانیان ناکەن و فەرمانی جەنابی شای خاوەنشکۆیان قبووڵە، کە ئێمە کەرەستەی زۆر کاریگەرتر لە شێوەکانی قسەدەرکێشانی سەدەکانی ناوەڕاست مان هەیە. ئامراز و شێوازەکانی ئێمە گوشاری دەروونین. کەوابوو نابێ دادوەر تووڕە بکەن و وای لێ بکەن ناچار بێ حوکمی زیندانیی دوورودرێژ یان ئیعدامتان بۆ ببڕنەوە.

لەو بارەیەوە ڕۆژێکیان لە پاریس قسەم لەگەڵ شێخۆ کرد کە ئیتر هیچ هیوایەکی بە چاکسازی نەمابوو. چاوەڕوانی بەڵایەک بوو کە ئێران سەروبن بکا. باسی چاونەترسی و ئازایەتی و تاقەتی چریکەکانمان دەکرد. گوتی:

"ئەوانە کۆمەڵێک بنیادەمی تایبەتن."

گوتم: "وایە، ئەوانە جۆرە بنیادەمێکی تایبەتن. ئەو هەمووە ئازارەیان دەدەن، سووکایەتییان پێ دەکەن، داغیان دەکەن و درێشەیان لە جەستەی ڕۆدەکەن، جاری وایە پاش لێپرسینەوە ماوەیەکی زۆر هەر بێهۆش دەکەون و کە چاو دەکەنەوە، هەمان تاس و حەمامە. وەک نە بایان دیتبێ، نە بۆران."

"ئەرێ یارۆ، قەت ئاشق بووی؟"

"نا".

"ژن و منداڵەکەتت خۆش دەوێ؟"

"ئەدی."

ژنەکەم مردبوو و پێوەندییەکی واشم لەگەڵ منداڵەکانم نەمابوو. خۆ ڕاستە ئەوان ڕوویان لە کابرایەکی ساواکی وەردەگێڕا و پێیان وابوو ڕاکردنی ڕوقیەش خەتای منە. شێخۆ سەرێکی لەقاند و گوتی:

"ئاخر ئاوایە، ئێوە ــ لەگەڵ تۆم نییە ـ ڕەگتان نییە. ئەوا ن قەت ئاشق نەبوون. بۆن و بەرامەی عیشقیان بەسەردا نەهاتووە. بنیادەم دەبێ شتێک، کارێکی خۆش بوێ، دەبێ شێت و شەیدا بێ بۆ ئەوەی خۆی لەپێناویدا بە ئاو و ئاگردا بکا. ئەو چریکانە ئاشقن، خۆیان بە زاری حەزیادا دەکەن و ئێوەش بە قەمچی سیمیی کارەبایی و کورسییە

ئەلکتریکیەکەتان هیچتان پێ ناکرێ. منیش وەک تۆم. ئەمڕۆ لە دەمیان دەدەی، سبەینێ لە سەد زاری دیکەوە هاواریان کەڕتان دەکا."

هەر واش بوو. هەرچی ئامۆژگاریی کاربەدەستان بوو هیچی لێ شین نەبۆوە.

چریکەکان لە دادگادا، هەرگیز ڕەچاوی دامودەستوورەکانیان نەکرد. کە سەرۆکی دادگا فەرمیبوونی مەحکەمەی ڕاگەیاند، ئەوان دەیانکردە گەمە و فشە، پێدەکەنین، هاواریان دەکرد و جنێویان بە کاربەدەستەکانی ئاژانس دەدا کە لە هەمبەر دادوەراندا وەک مشکی لەئاوهەڵکێشراو لە نێو خەڵکەکەوە دانیشتبوون و، ناوە ڕاستەقینەکانیان بەبێ نازناوی دکتۆر و ئەندازیار و مامۆستا دەهێنان. کە لە ناو و کارەکانیان دەپرسین، جوابەجەنگێیان دەکردەوە. دەیانگوت ئێمە ڕۆڵەی گەلین و پیشەمان شۆڕشە. کە بووکەڵە زرێوەپۆشەکان ــ ئەوە ناوێک بوو ئەوان لە ئەفسەرەکانیان نابوو ــ هەوڵیان دەدا دەستەمۆیان بکەن، ترسیان وەبەر دەنان. دادوەرەکان کە بۆ خۆگێلکردن لە بەدفەڕییەکانی ئەوان سەریان دەخستە سەر پەروەندەکان و جاروبارەش لە بنەوە زەردەخەنەیەکیان دەهاتێ، دەتگوت بەزمانی بێ زمانی تاوانبارانیان تێدەگەیاند، کە ئێمەش وەک ئێوە دیل و کۆیلەین. سەیرێکی چریکەکایان دەکرد و لەگەڵ یەکتر دەکەوتنە سرتوخرت.

هەر سەرۆکی دادگا تاقەتی نەدەما، سەربازەکانیان لە تۆمەتباران بەر دەدا. ئەوان بەربەرەکانێیان نەدەکرد. هەڵدەستانە سەر پێ و لەسەر کورسییەکانیان رادەوەستان و سروودی شۆڕشگێڕانەیان دەچڕی و سەرباز و ئەفسەرەکانیان دەستەوستان دەکرد. بەڵام لە کاتی دوایین بەرگریدا هەموو بێدەنگ دەبوون و ورد ورد گوێیان رادەگرت، ئەو بەرگرییە لە راستیدا سکاڵای تۆمەتبارکراوان بوو دژی دادوەران و دامودەزگای حکوومی. چاوقامییەکەیان دەگەیشتنە ئاستێک کە سووکایەتییان بە پیرۆزایەتییەکانی وڵاتیش دەکرد و خزم و کەسەکەی خاوەنشکۆیان بە قا چاخچیی مادە هۆشبەرەکان لەقەڵەم دەدا. بوختانی وایان بۆ بنەماڵ ەی بەرزی پادشایەتی دەکرد، کە من هەر ناوێرم بیانووسمەوە. ئای تۆمەتی چۆنیان لە خوشکە گەورەکەی دەدا. یەکێکیان ناتۆرەیەکی وای لەو خاتوونە نەجیبە هەڵدا، کە سەربازەکان قاقا پێکەنین. یەک یەک حەیای برادەرانیان برد. سەروەت و سامانەکەیان بە تاڵانی جوتیاران و بەرتیلوەرگرتن وەسەریەک ناوە. مڵکەکانیان بە زۆرەملی بە بەگزادەکان ئەستاندووە. بە ترۆمبێل و کۆپتەر دەچنە ڕاو. درۆی وایان دەکرد لە قوتووی هیچ عەتارێکدا نادۆزرێتەوە.

دوازدە چریکی فیدایی خەڵق حوکمی ئیعدام و زیندانی درێژخایەنیان بۆ بڕدرایەوە و دیسانیش لە زیندان وازیان لەو ئەرکە نەهێنا کە باوەڕیان وابوو لەسەر شانیانە.

لە جێی ئەوان تاقم و گرووپی دیکە بە ناوی جۆراوجۆری وەک "سازمانی ئازادیبەخشی خەڵق" کە دەستی بەسەر بانکی ئینگلیز و ئێراندا گرتبوو و هەڵیکوتابووە سەر باڵیۆزخانەی ئەمریکا بۆ ئەوەی باڵیۆزی ئەمریکا برفێنن و، تاقمی "ئارمانی خەڵق" و "مجاهدین" و "جان باختەگان" هاتنە مەیدان و هەتا ساڵی شۆڕشەکە هەر وا دژی ڕژیمی پادشایەتی خەباتیان کرد. خەباتی تاقمە چەکدارەکان ئاگرێکی هەڵاییساند هەر مەپرسە. ژمارەی کاربەدەستانی سیا لە ئێران زیاتر کران. سەدان کەس بۆ فێرکرنی گەڵاڵەی بەرەنگاربوونەوەی بەرگریی چەکدارانە نێردرانە ئەمریکا و ژمارەی چەکدارانی دەربار و وەزارەتخانەکانیش زیاد کران و بۆ پاراستنی سەرگەورەکان، داوای دەیان ترۆمبێلی زرێپۆشیان لە ئەڵمانیاوە کرد.

ڕووناکبیران کە ئێستا لە خەباتی ئاشتیخوازانە بە قەڵەم و زمان دژی ساواک ڕێگەیەکی دیکەیان شک نەدەبرد، کەوتنە جموجۆڵ. شێخۆ کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەخۆ شارەزای کاروبارەکانی ئەوانە و زۆربەی کتێبەکانیانی خوێندووەتەوە و لێکی داونەتەوە و هاموشۆی لەگەڵ چەند کەسێکیان هەبووە، زۆر شتی بۆ گێڕاومەتەوە کە شیرینن بیانبیستی.

قسەوباسەکەی ئێمە لە دووەم ساڵی شۆڕشدا بوو، ئەو دەمەی من ئیفلیج و نقوستان کەوتبووم و ئیتر شێخۆش ترسی ئەوەی نەمابوو نهێنییەک بدرکێنێ. دەیگوت، ئیتر شمریش باشاریان ناکا. سروودی شۆڕشگێڕانەیان دەنووسی، پڕ

لە رق و دوژمنایەتی و هاندەر بۆ رووخاندنی بناغەی زوڵم و دەسەڵاتی تاکەکەسی. جا بە فۆتۆکۆپی نەسکیان دەکردن و لە نێو قوتابییاندا بڵاویان دەکردنەوە و دەیانفرۆشتن، لە نانەقەندیش ئاسانتر.

ئەوانەی گەنجتر بوون، خۆیان بە ئاو و ئاگردا دەکرد بۆ ئەوەی پێوەندی بە چریکەکانەوە بکەن. دەچوونە رەشت و مازەندەران و لە دارستانەکاندا بە شوێن فیداییەکان و مجاهدین و جانباختەگاندا * دەگەڕان. زانیارییان لەسەر بارودۆخی ئەوان لە زیندانەکاندا و هەڵسوکەوتی خراپی ئەشکەنجەدەران و کەرەستەکانی ئەشکەنجەدان کۆ دەکردوە. ژیان و پێشینە و بەرتیلخۆرییەکانی ئەوانیان دەنووسییەوە و بۆ یەکتریان دەگێڕانەوە و دەیانناردە دەرەوەی وڵات. پێوەندی لەگەڵ کۆنفدراسیۆن ببووە بەشێک لە شانازییەکانی ئەم نووسەر و ئەو قوتابی و فڵانە رووناکبیر.

قسەکەیم پێ بڕی "ئاخر یا شێخ"، ئەو بنیادەمانەی تۆ ناوت ناون رووناکبیر، چۆن دەیانزانی لە زینداندا چ دەکری؟"

"تۆ زۆر خاوی، تۆ کە هەڕە لە بەڕەی ئەو شتانە ناکەیەوە، چۆن ساواکی بووی؟ ئەگەر دەتەوێ شتێک بزانی، پێوەندیی بە جەنابی فەرزانەوە بکە. لە پاریس لە بانیژەی خانووەکدا دەژی و ئاگای لە هەموو دنیایە. لێی بپرسە زۆر شت دەزانێ. ئێستا کە بەڕە لەسەر هەتیوان هەڵدراوەتەوە، دڵنیام نهێنییەکی هەر لایە کە بیەوێ بیدرکێنێ. من برادەرێکم هەبوو تازە زانکۆی تەواو کردبوو. لە شەقامی "پاماشین" کلینیکی هەبوو. هەر جارێکی دەچوومە ئەوێ، چەند بنیادەمێکی جۆراوجۆرم لە ژووری چاوەڕوانییەکەی دەدی، کە هەر دەگەیشتمە ئەوێ، فیزماڵکیان دەدایێ. ملهوڕی یەخەکراوە بە پێڵاوی شڕ و پاژنەنووشتاوە و هەندێکی دیکە بە کراسێکی سپی و خاوێن و بۆینباخ و پانتۆڵی ئوتووکراو و پێڵاوی بۆیاخکراوەوە، مەلا و شەپقەبەسەر، گەنج و پیر. ئەو برادەرە پزیشکەم قەت جارێکی باسی ئەو کەسانەی نەکرد کە بەردەوام لە کلینیکەکەی کەوتبوون. دیارە من ئەوەندە لێزان بووم کە وەڕووی خۆمی نەهێنم. زۆر جار قاچ شکاوێک کە دەهاتە لای دکتۆر، بە قاچی لەگەچگیراوەوە دەهاتەوە دەرێ و، بەڵگەیەکی لە بن گەچەکەدا حەشار دابوو، کە دواتر لە رۆژنامەکانی کۆنفدراسیۆن و ئەنجومنە ئیسلامییەکانی ئەورووپا و ئەمریکادا دەخوێنرانەوە. ئەو جوامێرە لە شۆڕشدا کوژرا. یادداشتەکانی لای منن. ئەو کلینیکە لە گەڕەکی خوارووی شار، ناوەندی کۆکردنەوەی هەواڵ و هەواڵناردن بوو. پزیشکێکی تاسلووس کە هیچ کەس سۆسەی ئەوەی لێ نەدەکرد ئەهلی سیاسەت و خەبات و مشتومڕ و ئەو بەزمانە بێ، لە دادگایەکدا دانیشتبوو و رەچەتەی دەپێچاوە و ئەنژکسیۆنی لێ دەدا و، زانیاریی بۆ "(جانباختەگان)" کۆ دەکردەوە و پێی دەگەیاندن."

"ئەی بۆ ناوەکەی ناڵێی؟"

"زۆر زیرەکی، پێت بڵێم دەسبەجێ بینووسی و یەکێک دادۆشی؟ نا ئەوە هیچی بۆتۆ تێدا نییە. هەندێ لەو بەجەرگانە لە سەر هیچ و خۆڕایی خۆیان لە داوی ساواک دەخست. کەسانی وەک حوسێنپوور لە زیندانیان توند دەکردن و ئەشکەنجەیان دەدان و ئازادیی خۆیانیان بە بەرتیل و دەستوداوێنبوونی ئەم و ئەو دەکڕییەوە.

وا پێش هاتووە کە یەک دوو کەس لەو گیانلەسەردەستانە لە زیندانێدا مردبێن. یەکێکیان ساواکییەکان چەند فیشەکێکیان پێوەنا و کوشتیان و خەڵاتیان پێ وەرگرت."

تاوێک بێدەنگ بوو و من نەمویست قسەی پێ ببڕم. بیری دەکردەوە و نەیدەزانی رای خۆی بڵێ یان نا.

"ئێوە زۆر کرچوکاڵ بوون. کارەکانتان هەمووی کەرانە بوو. پێتان وابوو وەختێک سەردەستەکەتان هەڕوگیڤی لێ دەدا کە ئێمە کەرەستەی کاریگەرتر لەوانی سەدەکانی ناوەڕاستمان هەیە بۆ ئەشکەنجەدان، هەموو دنیا بڕوا دەکا. ئەمریکاییە داشدیارەکانیشی گاڵتەیان پێ دەکرد. هەر زۆرهێنانێک، کاردانەوەیەکی لێ دەکەوێتەوە. ئێوە ملهوڕیتان دەکرد و ئەوانیش بە فێڵ و دەهۆ خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوەتان ئامادە دەکرد. ئەو پزیشکە لە یادداشتەکانیدا

*طيانبةختكردووان... تاقميَكي ديكةي بةرهةلَستكاي رذيمي ثاشايةتي.

نووسیبووی که منداڵی شازده حەڤدە ساڵان هەمیشە کەپسوولی سیانیدیان لە گیرفانیدا بوو و کەسانێکیش هەبوون کە لە کاتی مەترسیدا ئەو کەپسوولەیان لە زاریاندا شاردبۆوە. ئەوانە ئیمانیان وابوو کە دەبێ دنیا بگۆڕن. دەزانی ئیمان چییە؟ دەیانگوت بە قسەکردن و نووسین و بانگەشە هیچ شتێک چارەسەر نابێ. یەکێکیان نووسیوێتی، ئاسن و قورقوشمیان لە دەوراندەوری دنیاکەی ئێمە گرتووە، دەبێ کونی کەین، دەبێ لە ناخەوە بیتەقێنینەوە. ئەوە لە ساویرێک بەولاوە نەبوو، بەڵام ئارەزوویەکی شیرین بوو. ئەوان شێت و شەیدای دسیپلین بوون و، هیچ گومانێک بەدڵیاندا ختوورەی نەدەکرد، کە ئاخۆ بەرهەمی چالاکییەکانیان چ دەبێ."

چەند مانگ و ڕۆژان پاش شۆڕش هەر وا لەگەڵ شێخۆ قسەم دەکرد و من کە تا ئەو دەم دنیام لە دەروە و لەوانەشە سەرسەریانە سەیر دەکرد و بە سوودی خۆم ئاکامم لێ وەردەگرت، پاش تەگبیر و ڕا بە شێخۆ کە... قوونی دنیای دڕاندبوو و، نامەگۆڕینەوەلەگەڵ جەنابی فەرزان ــ ناڵێم هاتمە سەر ئەو باوەڕە ــ بەڵام بیرم کردەوە کە لەوانەیە هەندێ لە کار و کردەوەکانمان ژیرانە نەبووبێن. دیارە هەندێ بۆچوونی ئەوان لەسەر نووسینەوەی ئەم بیرەوەرییانە بێکاریگەر نەبووە.

هەرچۆنێک بێ لە ساڵانی 1350 ــ 54ـدا بەشی هەرە زۆری چالاکیی ئاژانس بۆ ڕووناکبیران و ڕۆژنامەنووسان و شاعیران و نووسەران تەرخان کرا.

ئێستا ئیتر مامۆستایان و نووسەران و هونەرمەندان و گەنجانی بازاڕی کە لە هۆدەی قەیسەرییەکدا دادەنیشتن و لە شەقامەکانی سەرووی شاریدا بە تەلەفۆن و تەلەگراف کاروباریان ڕێک دەخست و بەر لە هەمووان ڕۆژنامەنووسەکان قەڵتوبڕ کران.

فەرمان کرا، نزیکەی شەست ڕۆژنامە کە لە بەرگریکردن لە دەوڵەت بەولاوە هیچ سیاسەتێکیان ڕەچاو نەدەکرد و هەموو حەفتان جارێک وێنەیەکی خاوەنشکۆ و شەرحی هیممەت و فیداکاری و لەخۆبردوویی بنەماڵەی بەڕێزی ئەویان بڵاو دەکردەوە، ئیتر داخرێن. ئەوانە غیرەتی ئەوەیان نەبوو ڕەخنە لە بەرپرسانی باڵا بگرن، نەکا خودای نەکردە بۆنی دژایەتیی لەگەڵ شێوازی حکوومەتی لێ بێ. جاروبارە نەبێ ئاماژە یان توانجێک بەس بوو کە دەکرا وای لێک بدەیەوە کە ئەوە ڕۆژنامەنووسێک لە سۆنگەی کێشەی خۆیەوە چزوویەکی لە بەرپرسێک داوە. ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیان داخست، دیارە بە زمانی خۆش دامەزراوەکانیان کڕینەوە، قەرزە بانکییەکانیان بۆ دانەوە و بە بیانووی ئەوەی کە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ لە شارەکان زۆر پێویستیان بە هاوکاری ڕۆژنامەنووسانە، کاری پڕ داهاتتریان پێ دان. هەندێک لەوانەیان، کە سەرەڕای ئەو هەمووە چاکەیەش هەر بزۆزییان دەکرد، وەک نوێنەری تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ئاژانسی چاپەمەنی و هەواڵنێر ناردنە ئەورووپا و ئەمریکا. چەند کەسێکیان دواتر ئەگەرچی کارمەندی ساواکیش نەبوون، سیخوڕییان بۆ من دەکرد. بە کورتی، وایان کل و گوێ کردن، کە هیچ چاوبرسییەک ئەوەندە بێشەرم نەبوو شەق لەو هەمووە نیعمەتە هەڵبدا.

لەو بگرە و بەردەیەدا، زۆر کەس پاروە نانێکیان دەست کەوت. لەو کێشمەکێشەدا منیش گۆشەیەکم دەگرت و دەمکێشا. من ڕاسپێردرابووم بە ڕۆژنامەی "زیر و زبر" ڕابگەم. ئەو ئەرکە، تیمسار سەرلەشکر پێی ئەسپاردبووم. زانیم بۆچی منی هەڵبژارد. بێ و نەبێ حاجی ساوجی مەشهوور بە دکتۆر بیژەن یان یەکێک دیکە لەوانەی خۆم سمێڵیانم چەور کردبوو پێی گەیاندبۆوە کە من سەوداکەرێکی باشم و حەق و حیسابم ڕوون و ڕاستە. بۆ نەگبەتی نەیاندەزانی کە من پیاوێکی حەوت ڕەنگی وەک شێخۆم لەبەر دەست نییە ڕسق بڕ نەبێ و بەکار بێ. سەیرم کرد ئەو ڕۆژنامەی "زیر و زبر" نانێکی وای تێدا نییە زگی کەسێکی وەک تیسمار سەرلەشکر تێر بکا. باش بوو بەخت و شانسەکەم هێنای و زانیم کە یەکێک لە سەرگەورەکان لە پشت بەڕێوەبەرەوەیە، کە ماستاو بۆ سەرۆکوەزیران دەگرێتەوە. دەبێ ئەو دادۆشم. قۆڵم لێ هەڵماڵی، کە چوار ئەوەندەی بە خەڵک دەدرێ دەبێ بەو بەڕێوەبەرە بدرێ. بەڕێوەبەری داماو شتێکی زۆر کەمی

وەرگرت. دوولەسەر سێی چووە باخەڵی تیمسار سەرلەشکرەوە. دکتۆر بیژەنیش شتێکی لێ پاشقول دا و تۆزێکیش بە من برا، کە پێم وابوو بۆ رۆژی تەنگانەم پاشکەوت دەکرێ. هەی ترحێو.

هاوینی 1353 مردنی ژنەکەم، چەرمەسەرییەکی چەند ساڵەی لەکۆڵ کردمەوە. ئیتر وا لەپێ کەوتبوو، نەیدەتوانی سۆراغی منداڵەکانیشی بگرێ. لە پێشدا جاروبارە سەرێکی لە کاشان دەدا و چەند ڕۆژێک لەوێ دەماوە و دەهاتەوە. ئیتر تینی تێدا نەمابوو. چەند مانگێک لە ئاویلکەدان بوو. هەموو گیانی وەک گۆڵەگەنمی ئاخری هاوینی لێ هاتبوو. ماوەیەک هەر داهێزرابوو. بە ئازاری دڵەوە دەیناڵاند. لەم پزیشکەوە رامکردە فلان دەرمانفرۆش. ڕۆژ بە ڕۆژ لەڕ و لاوازتر دەبوو. ئیشتیای بۆ هیچ خواردنێک نەدەچوو و هەر پارووی لە زاری نابا، هێڵنجی دەدا. بەردەوام تای لێ بوو. مەرگ، لە ئازار و ژانێکی تاقەتبڕ رزگاری کرد. چەند حەفتە بەر لەوەی بمرێ، منداڵەکانیم لە کاشانەوە هێنایەوە تاران و دامنە دەست دایکم. دڵی خۆش بوو و دیارە رازییە.

لەو کاتەوە روقیە ماڵێی بەجێ هێشتبوو، خۆی بە بێکەس دەزانی. هاموشۆی کەسی نەدەکرد. دادەنیشت نێرگ ەلەی دەکێشا و تەزبێحی داویشت و لەبەر دەرگای ژوورەکە کوووشمەی دەکرد و بە دەنکە نۆک فاڵی دەگرتەوە. ئێستا کە دوو منداڵی دایک مردووی لەدەور بوو، جموجۆڵێک کەوتبووە ماڵەکەیەوە. کوڕ و کچێک پێکەوە گەمەیان دەکرد و لەگەڵ منداڵی دەروجیران پێک هەڵدەپڕژان. بیانووی دایکیان دەگرت. دایکم بۆخۆی سەرقاڵ ببوو. دیسان خۆی بە گەورەی ماڵێ دەزانی. نە من بیرم لە روقیە دەکردەوە و نە ئەویش. لانیکەم نەیدەگوت خەمی روقیەمە. تا را دەیەک منیش وام بیر دەکردەوە و دەمگوت نەکا دایکم هەر تەواو دڵنیا بووبێتەوە کە من ساواکیم و ئەو دەبێ هەموو شتێکم لێ بشارێتەوە. دڵخۆشیی خۆمم دەداوە، کە ئەویش وەک من روقیەی ـ کە سەردەمانێک هاودەنگ و هاوخەمی بوو ـ لەبیر کردوە. جاری وابوو رەخنەم لەخۆم دەگرت کە بۆچی لەبارەی چارەنووسی روقیەوە سەری قسە لەگەڵ دایکم ناکەمەوە؟ تا چەند مانگێک لەوەپێش هەر جارێکی دایکمم دەدی، یەکەم پرسیاری ئەوە بوو: باس و خەبەری روقیە؟ من هەموو هەوڵەکانی خۆمم بۆ دۆزینەوەی وی بۆ دەگێڕاوە. دەمگوت لە هیچ کوێ شوێنەواریم نەدۆزیەوە. هەر بەراستی ئەگەرچ ی لە زەجر و ئەشکەنجەی زیندانییەکاندا نەبووم، بەڵام بەردەوام لە هاوکاران و بەرپرسەکانم سۆراغیم دەپرسی. هیچ بە زەینیشمدا نەدەهات کە لەوانەیە دایکم پێوەندیی لەگەڵ روقیەدا هەبێ.

ناوی روقیە لە هیچ پەروەندەیەکدا نەهاتبوو. باشە لەوانەیە بەناوێکی دیکە بژی. لەوانەیە هەر نەبووبێتە چریک. هەر بڕوام نەدەکرد هاوڕێ و دەسگیران و کەڵەگای هەبێ ـ خۆمم قایل دەکرد کە حاشای لە من کردووە و نایەوێ قسە لەگەڵ برا ساواکییەکەی بکاتەوە ـ هەر بەوە دڵخۆشیی خۆمم دەداوە، کە ئەگەر ئەو دەیەوێ پشت لە من بکا و هیچ پێوەندییەکی بە منەوە نەبێ، دەی باشە ئەگەر ئەو ئیماندار و شۆڕشگێڕە، ئەی بۆچی دەیەوێ رسق و نانی من ببڕێ و پێشی پێشکەوتنم بگرێ؟

هاشمی کوڕم کە لە یەکەم حەفتەکاندا لە لای دایکم دەمدی، دەیپرسی: "بابە، ئەی بۆچی پوورە روقیەت لەگەڵ خۆت نەهێنایەوە؟"

دیار بوو دایکم وای تێگەیاندبوو کە روقیە لەگەڵ من دەژی و ئەمجارە کە باوکت بێتەوە لەگەڵ خۆی دەیهێنێتەوە.
بەڵام ئێستا کە دەچمەوە لای دایکم، ئیتر هاشم باسی روقیە ناکاتەوە.

ئەو خەیاڵاتە، ئەودەمە بە زەینمدا دەهاتن کە لای دایکم بووم. لە سەر کار ئەوەندە سەرقاڵ دەبووم، لەبەر گرفتاری و راکەڕاک و ساختەچێتی و ریایی خەڵکەکەی دەوروبەرم، فریای ئەوە نەدەکەوتم بیر لە روقیە بکەمەوە.
پەروەندەیەکیشی نەبوو. چریکە جۆراوجۆرەکان لە هیچ کوێ ناوی روقیەیان نەهێنابوو. وێنەیەکی فەرزان بە لاپەڕەکانی روقیەوە زیاد کرابوو کە دیار بوو لە نێو بەڵگەکانی بەختیار دەریانهێنابوو ــ هیچ زانیارییەکیان لەسەر فەرزان نەبوو، جگە لەوەی پلەبەرزێکی شارەوانی بووە و لەپڕ بەناوی سەفەری کەربەلا دیار نەماوە و لە بەغدا و بەیرووت شوێن پێیان دیتووە.

پاش دەمبێنکردنی رووناکبیران جارێکی دیکەش ئاژانس هەموو هەوڵی خۆی بۆ گرتن و راوەدوونان و لێپرسینەوە و لێپێچینەوە و ئەشکەنجە و کوشتاری ئەو فیدائییانە تەرخان کرد کە تازە لە داو کەوتبوون و ئەو مجاهدین و مەلایانە لە هەموو ئێراندا پشتیوانییان لە ئایەتوڵا خومەینی دەکرد. رۆژێکیان لە ماڵەکەی خۆمدا لە نیاوەران، نامەیەکی بێ ناونیشان و ئیمزام پێ گەیشت، کە تێیدا تەنیا ئەو رستەیەم دیت: "ئاگات لە مەرزییە بێ، خەریکە تێدا دەچێ."

لە ناکاو وەک کارەبا لێی دابم. چاوم رەشکەوپێشکەیان کرد و سەرم لەگێژەوە هات. ئەوە حاڵەتێک بوو کە لە کاتی دڵەڕاوکێی زۆر توندا تووشم دەبوو. ناوی "مەرزیە"م هیچ بە جوانی نەخوێندەوە. بە روقیەی تێگەیشتم. هەرچۆنێک بێ بە روقیەی تێگەیشتم بەڵام مەرزیە بوو. بڵێی و نەڵێی ناوی مەرزییە روقیەی بیر خستمەوە. چما روقیە پێشنیاری مەرزیەی پێ نەکردبووم؟ بەو ناوە زنجیرەیەک بیرەوەری و شتم پێکەوە گرێ دەدرانەوە. گرفتاریی ئەو کچەتیوەی لە کوشتنی عەقیدەکەی ناوەندی گشتیدا تۆمەتبار کرابوو، خۆتێهەڵقوتاندنی شێخۆ و نێوبژیوانییەکەی روقیە و تەگبیر و ڕا لەگەڵ دکتۆر بیژەن لە ئارەقخواردنەوەی شەوانەدا و بەرتیلوەگرتن و بەشی من لەو رووداوەدا، هەر هەموو دەنکی تەزبێحێک بوون. سەیرم کرد ئەو هەویرە ئاو زۆر دەبا. ئەو پارەیەی بۆ زەماوەندەکەی من خەرج کرا. هەرای سوپاییەکان کە ئێمە دەگرین و ئاژانس بەریان دەدا. گەیشتنەوەی مەسەلەکە بە سەربەرێوەبەر. ئەگەر ببێتە حەیاچوون، هیچ زیانێک بە سەرگەورەکان ناگا و دووکەڵەکەی دێتە نێو چاوی ئێمەمانانەوە و ئێمە دەخنکێنێ. شێخۆ خۆی نییە. من لە مەترسی دام. ئێستا کە وام لێ هاتووە و دەتوانم چەند رۆژێک لە ئەورووپا و ئەمریکا پشوویەک بدەم، ئەم مەرزییەیە لە تاریکییەکدا قوت دەبێتەوە و چاوی لە من بڕیوە کە لە پەلوپۆم بخا و لەعەرزم بدا. ئەو خوشکەی من هەر لە ئەوەڵەوە زانیوێتی مەرزییە چ تیرواسکێکە. ئێمەی نەزان بەرمان دا. ئێستا ئەوە بۆچی لەو تاریکاییەوە قوت بۆوە. ئەگەر روقیە ئەوێ رۆژێ ئاگای لە رێچکەی سیاسیی مەرزییە بوو، هەروەها دەیزانی کە لەگەڵ فیدائییەکان یان مجاهیدین و (جانباختەگان) و مەلاکاندا ساتوسەودایەکی هەیە و دەیتوانی خۆی بە زاری حەزیادا بکا و لە کوشتنی عەقیدی ناوەندی گشتیدا بەشدار بێ، ئیتر گومان نەدەما لەوەدا کە ئێستاش روقیە زۆر لە مەرزیە دوور نییە.

ئێستا ئەوە چ قەوماوە کە من دەبێ چاوم بەسەریەوە بێ. بە دڵنیاییەوە پێوە بووە. دیسان نامە بێ ناو و نیشانەکەم خوێندەوە. کاغەزەکە یەکێک بە پۆستی شارەوانیدا ناردوویەتی. لێی وردبوومەوە. خەتی شێخۆم ناسیەوە. مەرزییە، شێخۆ، روقیە، بەرتیلخۆری، هەرای سوپاییەکان. گورج وەشوێن کارەکە کەوتم. بە شێخودا چوومەوە. دوا هەواڵ ئەوە بوو کە چووەتە ئەورووپا. لە بادن بادن لەسەر مێزی قومار دیتوویانە، لە پاریس راپۆرتێکی لەبارەوە هاتووە و تەواو. تەلەفۆنم بۆ مەملووک کرد. ئەو ئیتر لە پۆستەکەی جارانیدا نەمابوو. کەسێکی دیکە لەوێ دانیشتبوو، بەردەستی باڵیۆزی گەڕۆک. ژمارەی تەلەفۆنەکەیم گرت. چەند رۆژان نەمدۆزییەوە. لە نێو کچ و ژنە گیراوەکاندا ناوی مەرزییە نەبوو. وێنەی ژنە تێکدەرەکانم پشکنی. کچۆڵەیەکی بیستوچەند ساڵان لەو دەچوو. بەڵام رەنگی بە رۆوە نەمابوو. تێک شکابوو. لە زیندانی ئێڤین دۆزیمەوە. گوتیان قسە ناکا و وەڵام پرسیاران ناداتەوە. لە لێپرسینەوەدا

کرۆکپ دادەنیشێ. لەوانەیە کە هەموانی وەڕەز کردووە و هەر ئامراز و ڕێگەیەکیشیان گرتووەتە بەر، هیچی لێ شین نەبوەتەوە. خۆم چوومە ژوورەکە. سەیری نەکردم. دڵنیام بووم ناسیومێتەوە. خاتی کە لەگەڵم بوو سەری سووڕ ما.

"ئەوە چۆنە سەیری تۆ ناکا؟ بەوپەڕی بێ شەرمییەوە سەیری نێوچاوی ئێمە دەکا و وەڵام ناداتەوە." گوتم:

"مەرزییە خانم، من براکەی روقیەم و هاتووم یارمەتیت بدەم."

هەر مێشێکی میوان نەبوو. لە خاتیم پرسی:

"لەوانەیە کەڕ بووبێ و نەبیستێ. لە گوێچکەیتان داوە؟"

گوتی نا. بێهیوا بووم. لە خاتیم پرسی:

"چیی کردووە؟ تاوانی چییە؟"

"گومان لەوەدا نییە دەستی لە کوشتنی عەقیددا هەبووە. جا چەندەی راستە نازانم. وەرە با بڕۆین چیی لە ماڵەکەیدا دۆزیومانەتەوە نیشانتی بدەم."

دیسان رۆژێکی دیکەم فەوتا. کات زۆر خێرا تێدەپەڕی و من هیچ کاغەز و بەڵگەیەکم بەدەستەوە نەبوو کە هاودەست و هاوکار و هاوکەتنی روقیە بێ. تەنیا خۆدزینەوەی لە سەیرکردنی من نەدەکرا بکرێتە بەڵگە کە منی ناسیوەتەوە و زانیوێتی من برای روقیەم. لە خاتیم پرسی:

"ئەرێ ئەو فەرمانەی حەزرەتی خاوەنشکۆ هێشتا لەجێی خۆیەتی کە ژن و کچ نابێ لە بەندیخانەدا بمرن؟"

"دەی هەر ئەوەیە دەست و باڵی بەستووین و هیچمان پێ ناکرێ. دەبێ لە ناڵیش دەین و لە بزماریش."

کە شتەکانیم پشکنی، هەر ئەو کتێب و نامیلکانەم دۆزییەوە وا لە ژوورەکەی روقیەدا دیتبوومن. "خەباتی چەکداری." "پارتیزانی شاری" و لەو قسە قۆڕانە. هەڵبەت دەکرا ئەو شتانە نیشانەی نیشانەی پێوەندیی روقیە و مەرزییە بن. خاتی پێی وایە هەر هەمووان لەو کتێبانەیان هەیە. نزیکەی شێست بەرگ نامیلکە و کتێبم پشکنی. بە خاتیم گوت:

"با ئەوانە هەڵدەمەوە، بەشکم نیشانەیەک لە پێوەندیی ئەو و روقیە بدۆزمەوە." چەند یادداشتێک سەرنجیان راکێشام. ئەوانم نارد وێنەیان لێ بگرنەوە و لەگەڵ خۆم بردمنەوە ماڵی دایکم و لەگەڵ دەستوخەتی روقیە پێکم گرتن. دایکم لەسەر بەرماڵ دوعای دەکرد. لە تەنیشت دووگردەکە قورئانەکەم هەڵگرت و لە دایکمم پرسی:

"دایە ئەوە هەر ئەو قورئانەیە وا روقیە بۆی ناردبووی؟"

بە سەرلەقاندن گوتی ئا. وەبیرم هاتەوە کە دایکم گوتبووی، ئەم قورئانە روقیە ناردوویەتی و بە دەستوخەتی خۆی پێشکەشی ئەوی کردووە. لە خەتی پشتەوەی قورئانەکە ورد بوومەوە. دەقاودەق ئەو خەتە بوو کە لە کتێب و نامیلکە دەسبەسەرداگیراوەکانی ماڵی مەرزییەم هەڵگرتبۆوە. دایکم بەسەهو چووبوو، ئەوە خەتی روقیە نەبوو. خەتی مەرزیە بوو. ئیتر گومانم بوو بە یەقین. روقیە و مەرزییە هاوڕێی گیانی گیانیی یەکتر نەبوون. رزگارکردنی مەرزییە دەکرا ڕێگەیەک بێ بۆ دۆزینەوەی روقیە.

کەوتمە شوێن شێخۆ. دەمەویست ئیجازەیەک وەرگرم و بچمە پاریس و مەسەلەکە لەگەڵ شێخۆ باس بکەم کە بۆ پێی وایە یەکێکی وەک من دەتوانێ گیانی ئەو کچۆڵەیە رزگار بکا. پاش دە رۆژان بە یارمەتیی جێنشینەکەی مەملووک لەسەر تەلەفۆن قسەم لەگەڵ شێخۆ کرد.

"ئەرێ یاشێخ، ئەو نامەیە چییە بۆت نووسیوم؟"

"کام نامە؟"

خۆی لێ گێل کرد. لەوە زیرەکتر بوو کە لەسەر تەلەفۆن وەڵامێکی رێک و روونت بداتەوە. نەدەکرا چەلەحانێی لەگڵ بکەی. بەو مەبەستەی تێی بگەیەنم کە دۆخەکە لەوە مەترسیدارترە من شتێکم لەدەست بێ، بە زمانی بێ زمانی تێم گەیاند کە واباشترە لە بابەت ئەو نامەیەوە کە نازانم کێ بۆی نووسیوم، پێوەندی بە کەسانی سەرترەوە بگرێ.

راستییەکەیم گوت: "لەو بوارەدا من دەسەڵاتم نەبوو. شتێک روون بۆوە، ئەویش ئەوەی کە روقیە و مەرزیە تەنانەت دووراودووریش هاورێ و هاودەست نەبوونە و، تا ئەو دەمەی مەرزییە لە بەر ئەشکەنجەدا قسە نەکا، هیچ مەترسییەک لەسەر من نییە و مەسەلەی بەرتیلەکەش حەیاچوونی لێ ناکەوێتەوە. بە هێما و ئاماژە مەسەلەکەم لە شێخۆ گەیاند. تاوێک بێدەنگ بوو. ئینجا ئاماژەیەکی وای کرد، کە زانیم تێگەیشتووە.

"ببوورە کاکە من جەنابت ناناسم. پێم وایە ژمارەکەت بە هەڵە گرتووە. ئێستا میوانێکی بەرێزم هەیە. جەنابی حاجی ە..."

تەلەفۆنەکەی داختستەوە. دیارە مەبەستی حاجی هەزارەی باوکی مەرزیە بوو. هەر ئەو رۆژە نامەیە کی بەبێ ناو و واژۆم بۆ شێخۆ ناردە پاریس و پێشنیارم پێ کرد، بۆ دەسگیرانەتی و زەماوەندەکەی ئەو خاتوونە وا باشترە بچێتە لای تیمسار سەرلەشکر."

لە رێگەی خاتییەوە کە دەمزانی بە تیمسار سەرلەشکر گوتووتەوە من چەندە لەسەر مەرزیە کونجکۆڵم، داوای ئیجازەم لە بەرێزیان کرد و ئەویش وەک جارەکەی پێش هاتە نێو ترۆمبێلەکەی من دانیشت و من سەرلەبەری رووداوەکەم بۆ لە بنی کوولەکە دا و، کە زانیی کارێکی خێرم پێیەتی، زەردەیەکی هاتێ و پرسیی:

"ئەوە هەر ئەو حاجییە نییە کارخانەکەی هەورێشم چنینی هەیە؟ دەیناسم."

کە لەبەر دەرگای ماڵەکەی لە ترۆمبێلەکەی من دابەزی، دەستێکی لەسەر شانم دا و گوتی:

"تۆش بێبەش نابی."

سەودایەک نەکرا. من خۆم هیچم پێ نەبرا و تیمساریش هەر هیچ. ئەو مەسەلەیە مانگێکی زیاتر خایاند و لەو مەدایەدا مەرزیە لە زینداندا مرد.

بەڵام تیمسار سەرلەشکر کەری خۆی لە پردێ پەڕاندبۆوە و مەرگی ژنێکی تێکدەر سیاسەتی ئەوی نەدەگۆڕی. پاش گیران و مەحکوومکران و ئیعدامی فیداییەکان و دۆزینەوەی تاقمێکی م وجاهیدین و (جانباختەگان) و تێهەڵچوونێکی چەکداری لەگەڵیان و لەناوبردنیان، تیمسار سەرلەشکر، سەرۆکایەتیی ئیدارەی سێیەمی ئاژانسی پاراستن و زانیاریی وڵاتی پێ درا. ئەو ئاژاوانە کۆمەڵێک کێشە و ژانەسەریان بۆ وڵات دروست کردبوو و سەرکردەکانی ساواک بڕیاریان دا بە بانگەشە و بانگەوازێکی بەربڵاو لە رادیو و تەلەفزیۆنەکانەوە خەڵک هێور بکەنەوە. سەرۆکی ئاژانس خۆی هاتە سەر تیڤی و وتارێکی پوخت و تێروتەسەلی دا بۆ ئەوەی خەڵک دڵنیا بن دەوڵەت جڵەوی هەموو بوارەکانی لەدەستدایە و ئیتر خیانەتکاران و تێکدەران و گوێلەمستی بێگانە و کۆمۆنیستەکان و پیاوکوژان شوێنەواریان نەماوە و مەملەکەت لە سایەی سەری جەنابی شاوە ئەمن و ئەمانە و هەمووان دەتوانن ئاسوودە بنوون و.. گەلێک قسەی ئاوا قۆڕ و پڕوپووچ و گەوج خەڵەتێنەی کرد و گوتی، حکوومەت بۆ پێشگرتن لە هەرچەشنە دەستدرێژییەک، هەوڵی کاریگەرتر دەدا. بەو ئاماژەیە، دەنگۆی ئەوەی کە تیمسار سەرلەشکر خۆی بۆ سەرۆکایەتیی ئیدارەی دووەمی ئاژانس ئامادە دەکا، پشتڕاست کرایەوە. ئەو بەشە بەرپرسی وەرگرتنی زانیارییەکانی دەرەوەی وڵات بوو کە نزیکەی دوو ملیۆن دۆلاری بوودجە لەبەردەستدا بوو. دیارە بە ورتەورت دەیانگوت هەر ئەو سامانە زۆر و زەوەندە نییە تەماحیان وەبەرناوە ئەو پۆستە وەرگرێ، بەڵکو پۆستپەرستییەکەشی هۆکارێکی دیکەیە. لە ئەورووپا و ئەمریکاوە کۆنفدراسیۆن و مەلاکان و ئەنجومەنە ئیسلامییەکان مەترسییەکیان نابۆوە کە پیاوێکی بەئەزموون و شێلگیر و دڵڕەق و چاونەترسی وەک ئەو دەیتوانی باشاری بکا.

زۆربەی ئاژاوەکانی دەرەوەی وڵات، ئەنجومەنە ئیسلامییەکان دەیانناینەوە. ئەگەر تیمسار ئەو سەرچاوانەی وشک کردبایە، هەنگاوێک لە ئامانجە سەرەکییەکەی کە سەرۆکایەتیی گشتیی ئاژانس بوو، نزیکتر دەبۆوە.

ئیتر هەموو فکر و زیکریان چووە سەر ئەورووپا و ئەمریکا. حەزرەتی خاوەنشکۆ جارێکیان فەرمووی، کۆمۆنیزم خەریکە لە لەندەنەوە دەخزێتە نێو ئێران و، پێویست بوو کۆمەڵێک کارلێهاتووی دنیادیتەی و باوەڕپێکراوی سەرکردەکانی سوپا بنێردرێنە ئەو وڵاتانە. هەڵبژاردنی ئەو کەسانە زۆر ئاسان نەبوو. بۆ ئەشکەنجەدان، کەسانی وەک خاتی و ژنە ژیکەڵە و ملهوڕە رەشۆکەکان بەکار دەهاتن. بۆ ناردنیان بۆ دەرەوەی وڵات و قسەکردن و هەستان و دانیشتن لەگەڵ باڵیۆزخانەکان و دیپلۆماتە دەرەکییەکان، کەسانێک پێویست بوون کە رواڵەتێکی خوێندەوار و شارستانی و بەئەدەبیان هەبێ و بتوانن لە کۆڕ و کۆبوونەوە فەرمییەکاندا بەرچاو بن و تێکەڵی خەڵکی دیکە بن.

دواتر دەرکەوت کە ئەو جۆرە مەئموورانەش ناتوانن شان بدەنە بەر باری ئەو بەرپرسیارەتییانەوە. لات و پات و هەرچیوپەرچییەکانیش هەر بەو رواڵەتە لاتییەی خۆیانەوە دەتوانن بەشداری کاروبارەکان ببن و دەشبێ ببن. دیارە لە نێو قوتابییەکانیشدا هیچوپووچی وایان تێدا هەبوو کە دەیانتوانی هەر دوو دەمامکەکە لە روخساری خۆیان بدەن. دەشیانتوانی خۆیان تیفتیفە بدەن و لەگەڵ ژنانی ژیکەڵە هەڕوگیف لێ بدەن و رابوێرن و سەما بکەن و هەم ئەگەر پێویست بوایە بە دار و تێلا لەو قوتابیە یاخییەکان بەر بن و قوفڵی دەرگاکان بشکێنن و کرچوکاڵەکان تێک بەردەن و درۆ بڵاو بکەنەوە و بە گزی و دەهۆ بن و لە هەموو جێیەک جێی خۆیان بکەنەوە.

دەبوو دەستەیەکیش هەڵبژێردرین، کە ئەهلی ساتوسەودا و معامەلە بن و گورجوگۆڵ و بەبێ دەنگی و بەبێ ئەوەی ناویان بکەوێتە سەر زار و زمانان و لە بنەوە ئەرکەکانی خۆیان جۆرێک راپەڕێنن کە نەهێڵن کاربەدەستانی باڵیۆزخانەش ئاگاداریان بن.

لەوەیاندا تیروپشکەکە بەناوی منی داماو دەرچوو.

شەوێکیان کە لەگەڵ دکتۆر بیژەن، حاجی عەلی ساوجی لە میوانخانەیەکی چەپەک لە تەجریش نانی ئێوارەمان دەخوارد، سەیرم کرد جەنابی دکتۆر زیاتر لەو ئەندازەیەی جاران کۆنیاکی هەڵدا. پرسیم:

"برا ئەوە چ دەکەی؟"

"دەمەوێ ئەمشەو بەخۆشیی تۆ بخۆمەوە."

- چ بووە، چ قەوماوە؟"

"پۆستێکی تازەیان بۆ داناوی."

گوتم: "چۆن! دەتانەوێ هەڵمدێرن؟"

"نا کاکە گیان، پۆستێکی باشتریان بۆ داناوی. ناتەوێ سەفەرێکی ئەورووپا بکەی؟"

"بۆچی، زۆریشم پێخۆشە، بەڵام..."

"بەڵامی ناوێ ئیدی."

"ئەگەر راستیت دەوێ ژنەکەم تازە مردووە. زۆر ناڕەحەتم. منداڵەکانم لای دایکمن. ئەو پیرەژنە ئیتر دەستی هیچ ناگرێ، تینی لەبەردا نەماوە. هیچی پێ ناکرێ. منداڵەکانم خەریکن گەورە دەبن و بە قسەی داپیرەیا ناکەن. روقیەش ...."

حاجی عەلی ساوجی قسەکەی پێ بریم:

"روقیە لە هیچ تاقمێکدا نییە، دڵنیا بە."

"چۆن، خەبەرێکی تازەت هەیە؟"

"هیچ خەبەرێکی تازەمان پێ نەگەیوە. تاقمێکی تازەی مجاهدین و (جانباختەگان) ـ نازانم چەند ناویان هەیەـ چەند رۆژێک لەوەپێش گیراون. ئەویان نەدیتووەو هەر ناشیناسن. یەکێکی ئەو تاقمە پیاوی خۆمانە. وێنەی روقیەمان پێشان داون. نایناسن. پیاوەکەی خۆشمان کە هێشتا زیندانییە نەیتوانیوە سۆراغێکی بکا."

شاگەشکە بووم و گوتم:

"ئەوە هەواڵێکی خۆشە، ئەی چ لە منداڵەکانم بکەم؟"

"خەزوورت لە کاشان دەوڵەمەندە. پێمان راگەیاندووە کە تۆ چ کارەی و چووینەتە بن هەنگڵی کە نەوەکانی بنێرێتە ئەمریکا و تۆش و ئەوانیش لە کۆڵ یەکتر ببنەوە."

"چەنێ باش ئاگاتان لە هەموو شتێکە و هەموو شتێکیش رێک دەخەن."

"لەبەر خاتری تۆ و بە قازانجی ئاژانس."

چەند رۆژ دواتر پێم راگەیەنرا، کە لە ماوەی چەند حەفتەیەکدا خۆم بۆ سەفەر ئامادە بکەم. دەسبەجێ و بەبێ ئاگادارکردنەوە چوومە ئۆفیسەکەی دکتۆر بیژەن. سەرقاڵ بوو. خەریک بوو کەلوپەلەکانی کۆ دەکردەوە. کە دیتمی، دەستی تێکەڵ هات. لە جێی خۆی هەڵنەستا.

"بێکار و باری. منیش ئێستا ئاگادارکردنەوەکەمم پێ گەیشت. چیت دەوێ؟"

گوتم: "هەر ئێستا دەمویست بزانم کە دەبێ لە تۆ جوێ ببمەوە یان هەر پێکەوە دەبین؟"

"ئەوەیان نازانم. زۆر کەس سەفەریان لەبەرە. دیار نییە پێکەوە دەبین یان نا."

خۆی بە کاغەز و دەفتەرەکانییەوە سەرقاڵ کرد و بەبێ ئەوەی سەیرێکی من بکا، گوتی:

"دیارە هەموومان دەچینە ئەورووپای ناوەندی. تیمسار سەرلەشکر بووەتە سەرۆکی ئیدارەی دووەم. نازانم بۆچی لە من و تۆی هەڵکێلاوە."

هەر نەیدەهێشت من قسان بکەم. هەم شاد بوو و هەمیش نیگەران. نازانم بۆ. هەر ئەوەندەم پرسی:

"کاتمان چەند هەیە؟"

"زۆر نییە. دەبێ هەموو ئەو زانیارییانەی لەو مانگانەی دواییدا لە دەرەوەی وڵات و هەموو راپۆرتەکانی کۆنفدراسیۆن بخوێنیتەوە. هۆشت بەخۆتەوە بێ. دەبێ ناوی هەموو قوتابییەکانت لەبیر بمێنێ. هیچ شتێک نابێ یادداشت بکەی. نابێ کاغەزێکی وا لەگەڵ خۆت بێنی، گومان دروست بکا، لە جانتاکەشتدا." وەک بڵێی ئەوانە بۆخۆی دووپاتە بکاتەوە، یان لە رووی بەڵگەیەکەوە بیانخوێنێتەوە کە فێریان بێ. ئینجا رووی لە من کرد و گوتی:

"ماندوو بووم. خەریکن بارێکی زۆرمان دەخەنە سەرشان. لەم دوو حەفتەیەدا دەبێ خولی راهێنانەکەمان تەواو بکەین. لە سەعات دەوە هەتا دووی دوانیوەڕۆ. تا شەوگار شەق دەبێ، دەبێ سەدان پەروەندە بخوێنینەوە. تۆ دەبێ فێری زمان بی. تازە من ئیی وەی نیم زمان فێر بم. تۆ هەر نەبێ بەکالۆریۆسەکەت هەیە و وا دیارە فەرەنسی و ئینگلیزییەکەش دەزانی. دەبێ چەندی پێمان دەکرێ پێوەنیدمان لەگەڵ خەڵک ببڕین. کاتی خۆشڕابواردنی شەوانەمان نییە. لەوانەیە یەکتر هەر نەبینین. لە بیرت بێ کە ئێمە دەچینە وڵاتگەلێک کە پۆلیس و ئیدارەکانی ئەمنیەت و ئاسایشیان بەدەست ئێمەوە و گوێلەمستی ئێمە نین. دیارە هەندێ لە سەرکردەکانیان روویان لەگەڵمان خۆش نەبێ. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین ــ ئەوە لەو فەرمانە نووسراوەدا کە تۆیش هەتە پێی زۆر لەسەر داگیراوەتەوە ــ کە بۆ وێنە لە فەرەنسا و ئەڵمان و نەمسا چەپییەکان زۆر خۆیان خزاندووەتە نێو دامودەزگای پۆلیسەوە. کۆمۆنیستیان زۆر تێدایە. جارێ بڕۆ و خەریکی کاری خۆت بە. لە خولی راهێنانەکەدا فێری هونەری نهێنیپارێزیمان دەکەن. براکەم، بە کورتی دەبێ لە غوربەت هەموو شتێک بی. هەم دز و هەمیش دزگر. لە ناخی دڵمدا ناڕەحەتم."

تۆقەی لەگەڵ کردم و بەبێ رووبینی لە ژوورەکەی دەریکردمە دەرێ و من هیچ رێیەکم نەبوو جگە لەوەی خۆم ئامادە بکەم. هەڵبەت هیچ ترسێکیشم نەبوو. بە تایبەتی کە چەند حەفتەیەک لە ئەورووپا ژیابووم و دەمزانی بەرەی خۆم لە ئاو دەرکێشم. دەی باشە ئەوە دنیایەکی تازە بوو و دەبوو بیناسم.

کاتێکی زۆرم نەبوو بۆ ئەوەی بە کاروباری خێزانەکەم رابگەم. رۆژانە دەرسم هەبوو و راهێنانی کردەیی. چۆن دەبێ بەرەنگاری چەپەکان ببینەوە. چۆن دەبێ کلیلی ساختە دروست بکەی و ئەو بەڵگانە بدزیت کە ئاژانس پێویستنی و وێنە بگری. دەستوەردان لە مەکینە نوێیەکان وردبینی و تاقەتی دەویست. دزەکردنە نێو ماڵی خەڵکەوە چ ئێرانی و چ فەرەنگی سەد جۆر فرتوفێڵی هەبوو. زیرەکی و تەڕدەستیی دەویست. نابێ هیچ شوێنەوارێک بەجێ بهێڵی. ئەگەر یەکێک کەوتە دەست پۆلیسی بیانی، چۆن لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەین. دەبێ خۆڕاگر بی، نەرمونیان بی. خۆت لە گێلی بدەی. بە زمانی خۆش بەرامبەرەکەت بخەڵەتێنی. ئەگەر پێویست بوو، دەکرێ بەرتیلیش بدەی. هەرچۆنێک بێ دەبێ شوێنەونکە بکەی. بە مەبەستی قایلکردنی پۆلیس دەبێ لەو ژنە جوانانە کەلک وەرگری کە لەبەردەستتدان. بۆ سەرکردەکانی پۆلیس، ئاژانس خۆی کاویار و مافوور و قوتووە جگەرەی زێڕی هەیە.

بۆ هەر کام لەو شێوازانە چەند نموونەیەکیان هەر وەک نموونە باس دەکرد. لە یەکێک لە شارەکانی ئەورووپای ناوەندی، ساواکییەکی باوەڕپێکراو تووشی کێشە و گرفتێک ببوو. لێرەدا ئیتر پێویست بوو لە ئاستی سەرەوەدا قسەی لێ بکە ی بۆ ئەوەی ئەو گرفتە چارەسەر بێ. ئەو بەرپرسەی لە سەردەمی لاوەتییەوە سەرۆکی پۆلیسی دەناسی راسپێردرا بەو کارە رابگا. هەردووکیان لە بواری شوێنپەنجەناسینەوەدا هاوخولی بوون. ئەو جەنابی سەرۆک پۆلیسە بانگهێشت دەکاتە هوتێلێکی زۆر رازاوە. وێڕای قسەی خۆش و ئەحواڵپرسین و هەڵدانەوەی لاپەڕەی بیرەوەرییەکان دەچنە سەر ئەو باسەش. کۆنە هاوڕێکە چەن د جاران لە قوتووە جگەرە زێڕەکەی کە چاوگر بوو، خولکی دەکا بۆ جگەرەکێشان. دەی دیارە لە کاتی ماڵاواییدا لەبیری کرد قوتووە زێڕەکە هەڵگرێتەوە و پۆلیسە کۆنەکارەکە لەو زمانە تێگەیشت و کارەکە جێبەجێ بوو. هەموو ئەندامانیش پۆلیسیش گەندەڵ نین ها. نابێ بەبێ دەراو لە ئاو بدەی. هەرچەشنە یاساشکاندنێکی وڵاتانی بیانی دەبێ بەبێ دەنگی بکرێ. ئەگەر پێویست بوو، دەبێ مل بۆ زیندانەکەشی راکێشی. دوایی ئاژانس خۆی مشووری گیراوەکانی دەخوا.

هەر کاممان دوو پەساپۆرتمان پێ بوو. پەساپۆرتێکی سیاسی و یەکی ئاسایی. ئەوەندەی کرابایە نەدەبوو پەساپۆرتە دیپلۆماسییەکە نیشان بدەین. نابێ کار بگاتە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە بیانییەکە و وەزارەتی دەرەوەی ئێران. کارمەندانی باڵیۆزخانە لە سەرباڵیۆزەوە بگرە هەتا سکرتێر و دەربارییەکان هەر هەموو بە لای ساواکەوە نامۆ و دژ و تەنانەت سیخوڕیشن. نابێ رووی خۆشیان نیشان بدەی. کارمەندانی بانک و فڕۆکەوانی و ناوەندە کولتووری و رۆشنبیرییەکان و دامەزراوە ئێرانییەکانی دیکەی دەرەوەی وڵات وەک ئەندامانی باڵیۆزخانەکان وان. ئەگەر لە کاتی کاردا، ساواکییەک زانیی کە یەکێک لە کارمەندانی ئەو دامەزراوانە کاربەدەستی ئاژانسە، نابێ وەڕووی خۆی بێنێ. هاوکات ناشبێ چەت بخاتە کارەکەیەوە بەو مەرجەی خۆی پێ نەناسێنین، دەکرێ یارمەتیدەریشی بین.

بۆمان نەبوو یادداشت لەو دەرسانە هەڵگرینەوە. ئاخری حەفتە ئەوەی فێریان دەکردین، لێیان وەردەگرتینەوە. دکتۆر بیژەن و چەند کەسێکی دیکە ئیتر خەریک بوون  بە نیوەچڵی وازیان لە کارەکە دەهێنا و پاشەکشەیان دەکرد.

تیمسار سەلەشکریش جاری وابوو دەهاتە پۆلی دەرسگوتنەوە و لە ئیمتیحاناتەکەشدا بەشدار دەبوو. جاری وابوو هەرهەموو ئەو چەند سەد لاپەڕە پەروەندەیەی پێیان دابووین، بەشێک بوون لە ئیمتیحاناتەکەمان. یەکێک لە راهێنانەکانمان تەقەکردن بوو بە دەمانچە و تفەنگ و تیربار و ئەوە خراپترین دەرسمان بوو. قەت نەمتوانی نیشانە بپێکم. هەر ئەو دەرسەم پێناخۆش بوو و رقم لێیەتی. ئاخرییەکەشی بێتواناییم لەو دەرسەدا ماڵوێرانی کردم و قوڕی بەسەردا کردم. ئەو دەمانچە سەگبابخێوە، تووشی ئەو رۆژە رەشەی کردم، با ئەوەی هەڵگرم بۆ دوایی.

نەماندەپەرژا سەری خۆمان بخورێنین. تا نیوەی شەوێ زەحمەتمان دەکێشا و شەکەت   و و ماندوو، لێی دەخەوتم. کەڕەی بەیانی هەڵدەستام و تا شەوگار شەق دەبوو راکەڕاکم بوو.

تاقەتی کەسم نەمابوو. نەمدەزانی چ لە دایکم بکەم. بەزەییم بە هاشمدا دەهاتەوە. زۆرم خۆش دەویست.

هەر جارێکی دەچوومەوە لای دایکم، خۆی لە باوەشم داویشت و دەگریا. دایکم نەیدەبردە بازاڕە و "ڕەوزەخوێنی". هۆن هۆن فرمێسکی دەباراند، لەگەڵ کەس ناچێتە سینەما. هیچ گەمە و ڕابواردنێکی نییە. هاوپۆلەکانی گەمەی لەگەڵ ناکەن. دەڵێن تۆ ناسکونازداری. ئەوانی دیکەش بۆ گەڕان و سەیران دەچنە شمێران، گەنمەشامی و گوێزی تازە دەخۆن. ئێمە هەمیشە لەو ماڵەدا زیندانیین. کە زۆر بێتاقەت دەبوو، بیانووی ڕوقیەی دەگرت.

"باوکە بۆچی ڕوقیە لەگەڵ خۆت ناهێنیتەوە؟"

ئیتر دایکم دەیکردە هەرا:

"بیبڕەوە. چەندە نووزەنووز دەکەی. مێشکت خواردم."

من تێدەگەیشتم. دایکم نەیدەویست هاشم ناوی ڕوقیە بێنێ. کوڕەکە وازی نەدەهێنا.

"بۆ پوورە ڕوقیە لەلای تۆ نییە؟"

سەیر نەبوو کە ئەو هاشمە ڕوقیەی لە نەنکی خۆشتر دەویست. دەمگوت:

"هاشم، دەی جارێ پوورە ڕوقیە لێرە نییە. لە جێی ئەو داپیرە لێرەیە."

"نەنەگیان هەر بەجێ و بان کەوتووە و دەڵێ مەیەنە لای من. نەخۆش دەکەون. ن مخۆش دەکەون. نەنەگیان زەرد هەڵگەڕاوە و وەک زەردێنەی هێلکەی لێ هاتووە. من پوورە ڕوقیەم دەوێ."

جا ئەوجار کچەکەشم دەیدایە گریان. نەمدەزانی چ بکەم. خەریک بوو دڵم بتۆقێ. دڵم دەدانەوە."

"خەم مەخۆن. ماوەیەک دەتاننێرمە لای باپیرە و داپیرە لە کاشان. باشە؟"

بە دایکمم گوت:

"دەمەوێ بۆ سووککردنی باری گوناحەکانم سەفەرێکی کەربەلا بکەم و بچمە مەرقەدی ئیمام حوسێن و بۆت بپاڕێمەوە چاکت بکاتەوە."

"باشە، باشە. تۆش دەتەوێ وەک ئەوی دی شوێنبزر بی. من هەر لە ئەوەڵەوە بێکەس بووم.. منداڵەکانت هەڵگرە و بیانبە."

گریان و نووزەنووزی منداڵ کەم بوو، نووزانەوە و بۆڵەبۆڵی دایکیشمی هاتەسەر. سەرم لەگێژەوە دەهات. یەکەوڕێ چوومە پۆستخانەی گەڕەکەکەمان. تەلەفۆنم بۆ خەزوورم کرد. گوتم:

"من سەفەرێکی چەند حەفتەییم لەپێشە. دەمەوێ چەند ڕۆژێک بچمە خزمەت مەرقەدی ئیمام حوسێن...."

بێدەنگ بوو. پێم وایە زانیی د ونیا بەدەست کێیە. پاڕامەوە کە ماڵوێران و داماوم. چارەڕەشم. بەشکم ئیمامی حوسێن خۆی ڕزگارم بکا... دەیبیست و هیچی نەدەگوت و بڕوای نەدەکرد. کورتی ببڕمەوە، وەرە نەوەکانت لەگەڵ خۆت بەرە. دایکم ئیتر منداڵی پێ بەخێو ناکرێ .. یەک قسەی کرد:

"زۆر باشە، دێم."

هاشم هێشتا نەبووە دەساڵان. نەیدەویست بچێتە کاشان. حەزی لێ بوو لای من بێ. بیستی کە من سەفەر دەکەم. پێداگر بوو ئەویش لەگەڵ خۆم بەرم. بۆ چما دەکرا چارەنووسی ئەو بە چارەنووسی خۆمەوە گرێ بدەم؟ هاشم گلێنەی چاوم بوو. چار چییە؟ دەبوو دەریبێنم و فڕێی بدەم.

کورتی ببڕمەوە، بەو جۆرە هەودای پێوەندیم لەگەڵ منداڵەکانم پساند و چارەنووسی خۆم بە چارەنووسی ئاژانسەوە گرێ دا و تووشی ئەو ڕۆژە بووم کە دەمبینن. بە دوو گۆچان بەڕێگەدا دەڕۆم. نە ژنم هەیە و نە منداڵ. نە ماڵ و حاڵێک و نە هیچ. بەلەنگاز و بە پەسیوم و چاوم لەو سەد دینا ر و سێ شاهییەیە کە بەو نووسینانە دەستم دەکەوێ بەشکم بەڕەی خۆمی لە قوڕێ پێ دەربێنم. بەڵام تیمسار سەرلەشکر و هاودەستەکانی خۆی وەک ئاهاری و دەماوەندی،

شاپەرست و نیشتمانپەروەرن و هێشتا پێیان وایە ئیتر جیهان بە ئارەزووی وان دەگەڕێ. تیمسار کە ئەودەمی پۆستەکەی وەرگرت ئەسپێ لە گیرفانیدا سەوزەڵەی دەگوت، ئێستا لە سایەی ملیۆنان دۆلاری ئاژانسەوە لە ئەورووپا و لە ڕێگەی پاشقولدان و ساتوسەودا لەگەڵ سەکردەکانی سیخوڕی لە جیهاندا و مەعامەلە بە یارمەتیی پاسپۆرتی دیپلۆماتیک و پارێزراو لە دانیماڵیات و گومرک، ئێستا کۆشکێکی لە میامی و خانووەکی هاوینەی لە کالیفۆرنیا و خوا دەزانێ لە کوێی دیکەی دنیاش هەیە کە لە دەستدرێژیی دەوڵەتی ئیسلامی پارێزراوە.

دەبێ بڵێم من هێشتا شاپەرستم و بڕوام وایە خاوەنشکۆ ئێرانی خستە سەر ڕێچکەی پێشکەوتن و گەشە و... هەر ئەو قسانەی خەڵکی وەک دەماوەندی و هاوپێڕەکانی دەیکەن و دووپاتەکردنەوەیان هێڵنجهێنەرە. بەڵام من زۆر لە دڵەوە بڕوام پێ دەکردن.

خوێندنەوەی پەروەندەی چەند هەزار لاپەڕیی کۆنفدراسیۆن و لقەکانی لە ئەورووپا و ئەمریکا و بلۆکی شەرق و دۆزینەوەی کۆدی ئەو بەرپرسانەی ڕاپۆرتەکەیان دابوو و مشتومڕی تاقمەکان پێکەوە لەسەر ئەوەی کام کۆمەڵە ڕێگەپێدراوە ببێتە ئەندامی یەکێتیی نێودەوڵەتیی قوتابییان و باس و مشتومڕ لەسەر سەرچاوەی داهاتەکەیان لە یەکێتییەکانی قوتابییان لە وڵاتانی دیکە و هەرایان لەسەر ئامانجە سیاسییەکانیان لە کۆمۆنیستییەوە بگرە تا لیبراڵ و دیموکرات و ئیسلامی و هەرای مەزەب و تۆمەتی سازش لەگەڵ پیاوانی حوکمەت و سیخوڕی بە قازانجی ئەمو ئەو و بە سوودی ڕێکخراوی ئەم تاقم یان ئەو گرووپ، حەکایەتێکە، سەدان کیلۆ کاغەزی دەوێ.

ڕۆژی یەکەمی بانەمەڕی ساڵی 1350، بە فڕۆکە چوومە ژنێڤ. بە پەساپۆرتێکی سیاسی و یەک ێکی ئاساییەوە. قەرار وابوو لە ژنێڤ یەکێک کە خۆی بە جیهان وەتەنی ناو دەبرد لە فڕۆکەخانە بێتە پێشوازیم. ئەو کابرایە کەمدوو بوو. لە هوتێل مێترۆپۆل جێی بۆ گرتبوومەوە. بەجێی هێشتم و ڕۆیشت. دوایی زانیم ئەو هیچکارەیەک نەبووە و وەک 13 ساڵ لەوەپێشی خۆم بەردەست بووە و ئەرکێکی نەبووە جگە لەوەی ڕێگە پێشانی مسافیرە تازەکە بدا و بۆ سەفەرەی لەندەن ئامادەی بکا. بلیتی فڕۆکەی لە ژنێڤەوە بۆ لەندەنیش لەگەڵ بوو.

لە فڕۆکەخانەی هیسرۆ، تووشی حاجی عەلی ساوجی بووم کە ئیتر هەر بەراستی قەڵافەتی دکتۆر بیژەنی هەبوو. دەستێک جلوبەرگی قەیتەرانیی لەبەر بوو و چاویلکەیەکی ڕەش لە چاو و بە نیشاندانی پەساپۆرتە سیاسییەکەی، بەبێ دامودەستووری گومرکی منی بردە دەرەوەی فڕۆکەخانە. سواری ترۆمبێلەکەی بوو و منیش لە تەنیشتی دانیشتم. هەر ترۆمبێل وەڕێ کەوت، زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

"من، دکتۆر بیژەن، سکرتێری سێیەم باڵیۆزخانەی پاشایەتیی ئێرانم لە بەریتانیا." و، بەو ناوەم بانگمی کرد کە لە پەساپۆرتە سیاسییەکەمدا نووسرابوو.

لەبەرخۆمەوە گوتم: "کوڕە سەیری وەکیل باشی بکە، خۆشحاڵیش بووم کە لەگەڵ هاوکاری 13 ساڵم دانیشتووم. بە دەستی ڕاستەم باسکی چەپیم گوشی. ڕاچڵەکی.

"ئەوە بۆ وا دەکەی؟ ئێرە لەندەنە. چما نابینی لێرە لە لای چەپەوە لێدەخوڕن. من شارەزای شارەکە نیم. دەبێ باش هۆشم بەسەر خۆمەوە بێ لەو ڕۆژانەی سەرەتادا هیچ دەستەگوڵێک بەئاودا نەدەم. بۆ نابینی سوکانەکە لەلای ڕاستە بەپێچەوانەی تەواوی دنیا و ئێمەش ڕانەهاتووین و دەبێ زۆر زۆر وریا بین، نەکا تووشی ڕووداوێک بین."

منی گەیاندەوە هوتێلەکەم و وامان دانا نیو سەعات دواتر لە خواردنگە یەکتر ببینین. لەوێ پاش تۆزێک سوعبەت و تەوس و توانج بەیەکتردادان، منی بردە ئۆفیسەکەی. قەول و قەرارمان دانا تەنیا لە باڵیۆزخانە چاومان بە یەکتر بکەوێ و کارەکانیشمان هەر لەم نووسینگەیەدا بکەین."

ئەوەی لە پەروەندەکاندا خوێندبوومەوە دەبوایە لێرە بە کردەوە تاقییان بکەمەوە. یەکەم کارێکی پێم ئەسپێرابوو بیکەم، ئەوە بوو کە لەبەردەم کۆنفدراسیۆن جگە گرووپگەلی ساختەی قوتابیان و چەند ڕێکخراوێکی دیکە دابمەزرێن بۆ

قوتابییە نیشتمانپەرست و شاخۆشەویستەکان. ئەو گەنجانەی ئەندامی کۆنفدراسیۆن نین، رابکێشن. دەبێ یارمەتییان بدەن، یارمەتیی ماددی و مەعنەوی. خانوویان بۆ بگرن. کێشە و گرفتەکانیان لەگەڵ ئیدارە حکوومییەکان و لەگەڵ وەزارەتی ناوخۆ (هۆم ئۆفیس) بۆ وەرگرتنی ئیقامە و لەگەڵ زانکۆکان بۆ چارەسەر بکەن. ئەو رێکخراوانە پێویست نییە خەڵکێکی زۆریان هەبێ. هەر ئەوەندە حەوت هەشت کەس لە دەوری یەکتر کۆ ببنەوە و بڵاڤۆکێک بڵاو بکەنەوە. دیارە یەک دوو کەسیان دەبێ لە ئەمر و نەهی ئاژانسدا بن. پرسیم:

"جا خەڵکی ئاوا لە کوێ پەیدا بکەین؟"

"تۆ کارت بەو شتانەوە نەبێ. ئەوان خۆیان دێنە لای من و تۆ و هەوڵ دەدەن بەرەمان لە بن پێ دەربێنن. ماستاو بۆ تۆ دەکەن. ئێمە لێرە نوێنەری کاروباری رۆشنبیریین لە باڵیۆزخانە و دەبێ بە کاروبارەکانیان رابگەین. دێنە لای تۆ پشتگیریت لێ وەرگرن بۆ ئەوەی بەردەوام دراویان پێ بگا. نوێکردنەوە یان زیادکردنی مۆڵەت و تەنانەت راگرتنی پەساپۆرتەکانیشیان بەدەست تۆیە. لە راگرتنی پەساپۆرتەکاندا دەبێ پارێز بکەی، دەبێتە هەرا، ئاکامێکی زۆریشی نییە. هەندێکیان بەناوی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە بەریتانیا دەژین. دەبێ بڕوانامەکانیان نیشانی تۆ بدەن و بەبێ پشتڕاستکردنەوەی تۆ کاروباریان جێبەجێ نابێ. لیستەیەکی شاخۆشەویستەکان لە باڵیۆزخانە ئامادە کراوە. هەمووانمان دەخەنە بەردەست و تۆ دەبێ گوڵبژێر بکەی، چەت و بنژیلی [*] لێ دابێژی و لەگەڵ باشەکانیاندا بە نەرمونیانی بجووڵێیەوە و کاروبارەکانیان راپەڕێنی."

خۆی لەو شتانە تێنەدەگەیشت. بە دڵنیاییەوە هەر لەبەری کردبوون کە خۆم بەسەردا هەڵکێشێ.

کورتی ببڕمەوە، من بوومە جێگری بەشی رۆشنبیریی باڵیۆزخانەی پاشایەتی لە بەریتانیای مەزن و نووسینگەیەکم لە باڵیۆزخانەدا هەبوو کە دەچۆوە سەر نووسینگەکەی دکتۆر بیژەن ـ حاجی ساوجی.

لێرە تەنیا مێزێک و قەفەزە و چەند کورسی و دوو قەنەفە و تەلەفۆنێک هەبوو و هیچی تر. بەڵام ماڵ و نووسینگەکەی دکتۆر بیژەن کە دواتر راگوێزرامە ئەوێ، هەقایەتێکی دیکە بوو.

ئەپارتمانێکی چەند ژوور و هۆڵێکی گەورەی هەبوو. لە ژووری کارەکەی تەلەفۆن و دەزگای تایپ و تلێکس و تەلەفزیۆنێکی سەر مێز و رادیۆ و چەند قەفەزەی کتێب و چەند کامێرا و مانیتۆفۆن و قەفەزێکی تایبەتی پاراستنی شریتەکان و دەزگای ڤیدیۆ و فۆتۆکۆپی و ئەگراندیسمانی هێڵی ورد و بەڵگەکانی تێدا دیار بوو. لە ژوور کورسیی پشت مێزی نووسینەکەوە، وێنەیەکی خاوەنشکۆ هەڵواسرابوو و مێزێکی کورت لە بەر مۆبڵەکەوە دانرابوو کە پڕ بوو لە رۆژنامە و گۆڤار و وێنەنامە و وێنەی گەورە و بچووکی خزم و کەس و کوڕو کچ و براکانی شا.

جەنابی دکتۆر کە پێشوازیی لە هەندێ قوتابی دەکرد، دەچووە پشت مۆبلەکەی دادەنیشت و میوانەکانی بەپێی پێگە و قورساییەکەیان لە لای خۆی دادەنا یان لەسەر کورسییەکەی دادەنان. کارەکەرێکی ئەڵمانیی پیر رۆژانە لەو ماڵەدا کاری دەکرد. حاجی ساوجی بە تەما نەبوو ژن و منداڵەکەی بێنێتە ئەو وڵاتە. دەیگوت:

"ژنی ئێمەمانان لەو کاژێر و کۆلیتە داخراوانەدا هەڵناکەن."

پیرەژنە ئەڵمانییەکە چا و شیرینی و چەرەز و گەزۆ و شوکولاتی بۆ میوانان دێنا و سەعات پێنجی دوانیوەڕۆ دەرۆیشت. لەو سەعاتەوە ئیتر دکتۆر پێشوازیی لە میوانە تایبەتەکانی دەکرد و جاری وابوو قوتابییەکی دەسکورت بەردەستیی دەکرد، لەو دەمەدا کەسانێک دەهاتن سەریان لێ دەدا کە کاری فەرمییان نەبوو یان دەبوایە ئەرکێکی زۆر زۆر نهێنییان پێ بسپێردرێ.

---

[*]چەت و بنژیلی لێ دابێژە: واتە پاک و پیسی لێ هەڵاوێرە.

هۆڵی میوانان رازاوە بوو، دوو ریز مۆبل و کورسیی لە دوو لاوە و دۆلابی مەشرووبات و چرای جۆراوجۆر و زۆر جۆری خشڵ و وێنەی لەچوارچێوەگیراوی خاوەنشکۆ و شاژن و جێنشین و کەسوکاری بنەماڵەی پادشایەتی.

هەر ئەو ئەپارتمانە دوو ژووری خەوی تێدا بوو و حەمام و ئاودەست و چێشتخانە و ژوورێکی پشوودان بە هەموو کەلوپەلەکانی وەک تەلەفزیۆن و ڤیدیۆ و هونەری دەستکاری ئێران کە هەندێکیان هەڵواسرابوون.

کە حاجی ساوجی ئەو ژوورەی نیشانم دا، گوتی:

"زۆرم حەز لێ بوو ئەگەر بۆ چەند رۆژێکیش بێ، ژنەکەم بانگهێشت بکەمە لەندەن."

بەڵام ئەو بانگهێشتە قەت سەری نەگرت.

ئەم دامودەزگایەم بۆیە وا بە تێر و تەسەلی شەرح دا، چونکە هەر هەموو ئەو شان و شکۆیە زۆر زوو بوون بە هیی من، بەبێ ئەوەی خۆم بمەوێ، بوومە خاوەن پێگە و کەسایەتییەک.

بۆ سبەینێ بەیانییەکەی سەعات هەشت و نیو خۆمم گەیاندە دکتۆر بیژەن لە باڵیۆزخانە و ، ئەویش منی بە جەنابی باڵیۆز و راوێژکار و کارمەندەکان و چەند تایپیستێکی ئێرانی و ئینگلیزی و یەک لەوان مۆنیکا کە لە ئەڵمانی خۆرهەڵاتەوە رای کردبوو، ناساند.

لە روانینی هەندێکیانەوە بۆم دەرکەوت کە ئاگادارن و من بە خۆمانە و رەشمەدارەکان دەزانن. لە تۆقەکردنیانەوە دیار بوو دەمناسن. هەر لەو حەفتەیەدا لەگەڵ سەرۆکی بانک و هەندێ کاربەدەستی ئابووری و نوێنەری ئێرانئەیر و کۆمەڵێک بازرگان کە وەشوێن کار کەوتبوون، تووشی یەکتر بووین.

هەر کە لەگەڵ دکتۆر بیژەن هاتمەوە ئۆفیسەکەی خۆم، کلیلی دۆلابی ئەرشیڤەکەی دامێ و گوتی:

"ئەم حەفتەیە هیچ کارێکم پێت نییە. ئەم پەروەندانە بخوێنەوە و مشتەرییەکانی خۆت بناسە."

ئیتر زۆر فەرمی قسەی لەگەڵ من دەکرد. ئەوەندە خۆی دەگرت، کە خۆشی ئاگای لێ نەبوو.

"هەرچی پێشینەی کاروبارەکانە لەو پەروەندانەدا تۆمار کراوە و تۆ ناتوانی بەبێ تۆژینەوە لەبارەی ئەو کەسانەوە کە سەردانت دەکەن، ئەمرێک دەربکەی. تا حەفتەیەک کەس کاری بەسەرتەوە نییە. خەریک بە. بەخوات دەسپێرم."

لەبەرخۆمەوە گوتم: دەی یاڵڵا.

ئەوەی گوت و رۆیشت و من دیتم کە پەروەندەکان ساڵ بە ساڵ ئەرشیڤ کراون. هەر وا لە گۆترە پەروەندەیەکم دەرکێشا و هەڵم داوە. ناوی وا لە پەروەندەکاندا دەبینران، کە زۆربەیان ئێستا بەرپرس و بەڕێوەبەری وڵاتن. یەکێک جێگری بانکی پیشەسازی و ئەوی دیکە سەرۆکی کۆمپانیای فەرش. سێهەمیان سەرپەرشتیاری ئیدارەی گشتیی گومروکاتە و چوارەمیان سەرۆکی کۆمپانیای بیمە و زۆری دیکەش. ئەو پەروەندانەم لێک نا و کاغەزەکانی ساڵی 1345ـم هێنایە پێش خۆم. لە ناکاو تووشی ناوێک هاتم کە ئاشنا دیار بوو. هەرچی لەخۆم نووسام، بیرم نەکەوتەوە، لە کوێ تووشی ئەم پەروەندەیە بوومە و لەکوێ ئەم ناوەم بیستووە. هەرگیز بە زەینمدا نەدەهات کە خاوەنی ئەو ناوە، هەر ئەو کەسە بێ کە لە راگەیاندنەکانی وڵاتدا بە پێداهەڵدان و پەسن و تاریفاتەوە ناوی دێنن.

عەسری جومعەی هەر ئەو حەفتەیەی نوێنەری رۆشنبیری و کولتووری ئێران لە بەریتانیا منی بە هاوکارە تازەکانی خۆی دەناساند، هەموو ئەندامانی نوێنەرایەتیی ئێران لە لەندەن لەسەر پێشنیاری تیمسار سەرلەشکر لە پاریسەوە هاتبوونە ئەو شارە و لە تەلاری باڵیۆزخانەدا بانگهێشت کرابوون بۆ خواردنی چای و شیرینی و شەربەت و کۆنیاک. هەر هەموو لەوێ بوون. بەرپرس و بەردەست، سکرتێر و تەلەفۆنچی و چایچی و کارەکەر. ئەوەشیان کۆبوونەوەیەکی تایبەتیی گشتی بوو و هەموو کەسێک بۆی هەبوو بەبێ رەچاوکردنی پێگە و کەسایەتییەکەی خۆی لەگەڵ دۆست و ئاشناکانی دانیشی و راوەستێ و قسە بکا و پێ بکەنێ و بخوا و بخواتەوەو سوعبەت بکا و تەوس و توانج پێکدا بدەن و پێ بکەنن. قاقای پێکەنینیان تەلارەکەی داگرتبوو. لەوێ زانیم کە چەند کارمەندێکی گەنج لە دەوروبەری ژنێکی زۆر

جوان کۆ بوونەتەوە و قاقا دەکێشن و تریقانەوەیان تەلارەکەی داگرتووە. دکتۆر بیژەن بە قاپێک شیرینیی پڕ لە خامەوە هاتە لای من و بردمی بۆ لای ئەوان و گوتی:

"ئەو خاتوونە لە ئەڵمانی خۆرهەڵاتەوە رای کردووە و لەبەر ئەوەی زیرەک و جوانە و چەند زمانی بێگانە دەزانی، ئەوە دوو ساڵێک دەبێ لێرە دامەزراوە. کارت بەسەرییەوە نەبێ."

هەموان بە ئینگلیزی قسەیان لەگەڵ دەکرد و پێکەوە بە فارسی یەکتریان دەدواند.

بۆ وێنە، یەک بە کێکی دەگوت:

"ئاگات لە خۆت بێ تێ نەکەوی. فلانی دەیەوێ ببێتە ژنی ئازمایش. زۆر بەتین و گوڕە و سەدی وەک من و تۆ دەترێنێ."

بۆ نەگبەتی لە سوعبەت و گاڵتەکانیان کە بە ئینگلیزی بوون، تێنەدەگەیشتم. حاجی عەلی ساوجی هەر گێرەی لە جێیەکی دیکە دەگەڕا. خۆ دیار بوو مۆنیکا لەو حەکەدارانەیە کە وێنەی نییە و تا بڵێی حازرقسە. کەس نەیدەتوانی و سووک و ئاسان ئەو چاوقایمە تەریق بکاتەوە. وەڵامەکانی ئەوەندە توند و چزوودار بوو و بەتوێکڵ بوون، کە هەرچی لە دەوری بوون قاقا پێدەکەنین و سەرسامی بوون. قاقا و پێکەنین و تەوس و توانجەکان وەختێک نیشتنەوە کە تیمسار سەرلەشکر هاتە نێویان و یەک یەک لە مۆنیکا کشانەوە و بەتەنیا جێیان هێشتن. چەند ساتێک دڵبەر بە زمانی فەرەنسی قسەی لەگەڵ ئەو کرد و دوایی چووە لای سەماوەرە برنجییەکە، بۆ ئەوەی چایەک بۆخۆی تێ بکا.

لەو ماوەیەدا ناوی ئازمایش سیخورمەیەک بوو، کە لە کەلەکەی من کوترابوو. دوای شەونشینییەکە چوومەوە نووسینگەکەم و پەروەندەی ئازمایشم کە نەمدەزانی یەکەم جار لەکوێی دابنێم، دەرکێشا.

ئەی هاوار.

بۆچی نابێ توخنی مۆنیکا بکەوم؟ ئەو جەنابی ئازمایشەش سەردەمانێک لە ئەڵمانی شەرقی بووە و شەوێکیان لەوێ رای کردووە و هەر ئەو کەسەیە کە چەند ساڵان راوێژکار و راوێژدەری حەزرەتی خاوەنشکۆ بووە و ئێستاش هەروایە.

شەوێ پەروەندەیەکم لەگەڵ خۆم بردەوە هۆتێل و ورد ورد خوێندمەوە. سەیرم کرد دەریایەکی سەیرە و ئەی لەو هەموو گەوهەرەی لەگەڵ ئاوماڵک و خشتوخاڵ و چزیلکەکانی تەختی بنی تێکەڵن.

سەیرێکی لاپەڕەکانی پێشەوەم کرد، ئەوە رێک ئەو گەنجە بوو کە ئاژانس لەگەڵ قوتابییەکان بانگهێشتی کردبۆوە بۆ ئێران بۆ ئەوەی پێشکەوتنە بەرچاوەکان بەچاوی خۆی ببینێ و کار بکاتە سەر هەموو قوتابییەکان. کە لە پەروەندەکەیدا وێنەکەیم دیت، دەرکەوت هەر ئەو کەسەیە کە لە ژنێڤ مەملووک تاریفی کردبوو و هەر ئەو هەتیوە بێ چاو و رووە بوو، کە منی تێگەیاندبوو ئەوا دەماوەندی و هاوڕێکەی لەسەر کامێرا و مانیتۆفۆنەکە لێک دەدەن. قەت پێم وانەبوو ئەو هەتیوە زۆڵە ئاوا بووەتە خاوەنی پێگە و ناو و ناوبانگێک کە سەدی وەک منی لە گیرفانی دەنا. ئەو بستەباڵایە لە ریزی قوتابییە توندڕۆکاندا بوو کە لە ساڵانی 1330 تا 1332 لە کۆڵن هەرایان دەنایەوە و چونکە پۆلیسی شار بە ئەمری سەربالێۆز کە خزمێکی شا بوو، بەشوێنییەوە بوون بۆ ئەوەی لە ئەڵمان دەری بکەن و ئەو شەوێکیان را دەکا و دەچێتە ئەڵمانی شەرقی و کۆمۆنیستەکان باڵیان بەسەر کێشا و ناردیانە لایپزیک بۆ ئەوەی دەرس بخوێنێ. دوو ساڵ پتر لەوێ نەمایەوە و پاش ئەوەی لەگەڵ دوو هاوڕێی خۆی شەڕی کردبوو، لەوانەشە هەر لەسەر خاتوو مۆنیکا بووبێ کە لەو وڵاتە هاتە دەرێ و دیسان گەڕایەوە ئەڵمانی خۆرئاوا. بنەماڵەکەی لە مەلا دەسترۆیشتووەکان بوون و کارمەندانی باڵیۆزخانە پشتیوانییان لەو بێ حەیایە دەکرد و شتەکەیان قۆستەوە. وەک شۆرشگێرێکی چەپی کە لەکیان لێ وەرگرت و ناردیانەوە تاران و "روکنی دووەم" کە لکی لە ناوبانگی ملهوڕییەکەی وەرگرت و خستییە نێو قوتابییەکانی تارانەوە بۆ ئەوەی دروشمی توندو خەڵەتێنەر بدا و خەڵک بە داوەوە بکا. چەند کەسێکیان خرانە بەندیخانەوە و دوای ماوەیەک ئازاد کران.

هەر ئەوەندەی کۆڵەکە سەرەکییەکانی ساواک خەریک بوون قایم دەبوون، دیسان سەروسەکتی ئەو لە ئەڵمان پەیدا بۆوە و لە هەموو جێیەک چ لە تاران و چ لە ئەڵمان مۆنیکای لەگەڵ خۆی دەگێڕا. دەیگوت ئەو کچە دەسگیرانمە. بەڵام ئەو دەسگیرانداریێتییەش زۆری نەخایاند، چونکە بووکەخان دەیزانی چۆن دڵان بڕفێنێ و بە ئاسانی دەیتوانی ئاشقان بخاتە داوەوە. گەنج و زمانخۆش و ناسکونازدار بوو. هەر تاڵێکی قژە کاڵەکەی چەند دڵی ئاشقی تێدا دیل بوو. جەنابی ئازمایش پاش چەند ساڵ خولانەوە لە ئەورووپا و هەڵسوکەوت لەگەڵ گەورەگەورەکان، هیوادار بوو لە دامودەزگای حوکمەتدا کارێکی پڕ داهاتی بدرێتێ و بەو جۆرە، زەماوەندەکەی خۆی لەگەڵ مۆنیکادا بۆ ئەو کاتە هەڵدەگرت کە ببێتە بەرپرسێکی پلەباڵا، بەتایبەتی کە هەڕوگیڤی ژنە جوانەکە لە میوانییەکانی باڵیۆزخانە و لە یانەی ئەفسەراندا بە جلوبەرگی جۆراوجۆر و گوارەی شۆڕ و پڵپڵە و لەرزانەوە خەرجێکی زۆری تێدەچوو، ئەوەش بە جەنابی ئازمایش دابین نەدەبوو کە بەردەستێکی روکنی دوو و ئاژانس بوو. کابرای ئاشقەناوبانگ، دەبوایە یان بە قبووڵکردنی ئەرکی زۆر قورس، شان بداتە بەر ئەو بارە، یان ئەوەتا دەبێ ناسک و دڵبەرەکە کاسبی بکا. دیارە کڕیاری زۆر بوو، تا ئەوەی کە دادگایی ئەو سێ قوتابییەی پێوەندییان لەگەڵ جەماوەری خەڵکی بەری خۆرهەڵات هەبوو دەستی پێ کرد و پەتەی خستە سەر ئاوێ. لە سەفەرێکیاندا بۆ ئەڵمانی خۆرهەڵات قوتابییەکان ترۆمبێلەکەیان لە سنووری نێوان هەردوو وڵاتەکە و لە شەقامێک کە دەرگای ماڵێکی تایبەتی بەسەردا دەکرایەوە، راگرت و بە شەمەندەفەر چوونە لایپزیک. جا لەبەر ئەوەی ترۆمبێلەکە دەرگای گەراجەکەی گرتبوو، پۆلیس بە کرێنی لای برد و چاوەڕێی کرد تا مسافیرەکان هاتنەوە. چەند رۆژ دواتر سێ قوتابیی خۆرئاوانشینیان بە جانتایەکی پڕ لە کاغەز و بەڵگەوە گرت و درانە دادگا. لە دادگاییەکەدا دەسگیرانەکەی مۆنیکا خاتوون کە بە ناوی دکتۆر ئازمایش خۆی ناساند، دەرکەوت و دەیەویست بەو ئەزموونە تایبەتییەی لە لایپزیک و شیوعییەکان هەیبوو، بیسەلمێنێ کە تۆمەتباران کۆمۆنیستن و ئەو کاغەزانەی هێناویانە، دژی بەرژەوەندییەکانی کۆماری فیدراڵی ئەڵمانە.

"تۆ دکتۆراکەی خۆتت لە کام وڵات وەرگرتووە و نامەی کۆتاییەکەت بە چ ناوێکەوە بوو؟"

ئازماییش کەوتە تەتەڵە. هەر ئەوەندەی گوتی:

"لە زانکۆی لایپزیک."

پارێزەرەکەی گوتی: "تەواوە."

داوای لە دادگا کرد، دادگاییەکە هەڵگرن تا بەڵگەی پێویستی لەسەر کۆ دەکەنەوە.

جارێکی دیکە کە دادگاییەکە پێک هاتەوە، پارێزەرەکە تەنگی بە شایەتەکە هەڵچنی و هەڵیپێچا و کەوڵی کرد. هەر وشەیەکی لە زاری هاتبایەتە دەرێ، داوای روونکردنەوەی لێ دەکرد. ئارەقەی پێ کرد، هەر دەسرۆکەی لە گیرفانی دەردێنا و ئارەقەی دەسرییەوە و پاش نیو سەعات پرسیار و وەڵامەوەرگرتنەوە، پارێزەرەکە، نامەیەکی لە پەروەندەکەی دەرهێنا و نامەکەی زانکۆی لایپزیکی خوێندەوە و دایە دەست سەرۆکی دادگا، کە نەک هەر دکتۆرا، بگرە بچووکترین کاغەزیش بەو ناوە لە هیچ زانکۆ و کۆلێژێکدا نییە.

ئازمایش داپلۆسێنرا. لە ئەڵمان وەدەرنرا و ئیتر چاوی رەشی لە ئەورووپا کاڵ بۆوە. دادگاکە لەبەر چەند هۆیەک، سێ قوتابییەکەی ئەستۆپاک کرد. یەک لەوان، پێی داگرتەوە کە حیزبی کۆمۆنیست لە ئەڵمانیا قەدەغەیە. بەڵام بڵاوکردنەوەی بانگەوازی کۆمۆنیستی بەتایبەتی بە زمانە بیانییەکان تاوان نییە، هەر وەک چۆن رۆژنامەی "هیومانیتێ" لە ئەڵمان دەفرۆشرێ و مەمنووع نییە. بەتایبەتی لەو کاغەزانەدا کە لە سێ قوتابییەکەیان گرتبوون، هیچ شتێکی دژی کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا تێدا بەدی نەکرابوو.

ئازمایش دیسان نەیتوانی لە ئەورووپا هەڵبکا و گەڕا یەوە ئێران و ئیتر نەدەکرا بۆ دزەکردنە نێو گرووپە چەپەکان بەکاری بێنن. لە دامودەزگای دەوڵەتدا بە زەبری خزم و کەسە دەستڕۆیشتووەکانی کە پشتیوانی جەنابی شا بوون، لە

پەیژەکە سەرکەوت. لە هەواڵەریی فارسدا کارێگی گرینگیان پێ دا. ئیدارەی کاروباری ئەوقافی پێ ئەسپێردرا. بوو بە جێگری وەزیری ڕێگەوبان.

لە ساڵانی پێش شۆڕشدا پارێزگاری فارس بوو و یەکێکیش بوو لە راوێژکارە تایبەتییەکانی خاوەنشکۆ، کە لە زۆربەی سەفەرەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆدا لە خزمەتیدا دەچوو. مۆنیکا لە ئەڵمانیا دەگەڕا. لە باڵیۆزخانە دەخولایەوە و هەر رۆژە و بەدەست یەکێک لە کاربەدەستەکانەوە بوو. بە ناز و لەنجەکەی خۆی دەنازی. ماڵەکەی ببۆوە مەکۆی خۆشی و رابواردنی ئێرانییەکان. کە ئیتر جوان خۆیان پێ گەرم کردەوە، کەوتە دەست تیمسار سەرلەشکر و لەگەڵ خۆی بردی بۆ سویسرا. بەڵام ئەوە چیرۆکێکە دوایی بۆتانی دەگێڕمەوە.

ئەو هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ.

رۆژ بە رۆژ پتر پێویستمان بەو گەنجانە دەبوو کە لە ژێر چاودێریی ئاژانسدا پەروەردە ببوون. هەرچۆنێک بێ جەنابی شا خۆیان فەرمووبوویان، ئێران دەبێ لە هەر پێنج وڵاتە زلهێزەکەی دنیا پێشکەوتووتر بێ. دەمدی و لە پەروەندەکانی ئاژانسیشدا رەنگی دابۆوە، کە زۆربەی ئەو برادەرانە بوونەتە دەسەڵاتدار و سیاسەتمەدارە لێزانەکانیان پشتگوێ دەخست. جومگە هەرە هەستیارەکانیان گرتبوو، هیچ کارێک بەبێ ئەوان رێک نەدەکەوت. خۆ ئەگەر دەستیشیان لە بنی هەنبانە دەرچووبایە هەر ئاسایی بوو، کارێکی دیکەیان پێ دەسپاردن. بەبێ هیچ قسەیەک، هەموو ئەمر و فەرمانەکانی ئاژانسیان جێبەجێ دەکرد. کاریان قسەی لەسەر نەبوو.

بەڵام ئەمەیان لە ناکلو وەک تەڵقەتەندوورە بەرەو ئاسمان رۆیشت. بڵێسەی رەنگاوڕەنگی لێ بۆوە. نەخوێندەوار و بێ حەیا و بێچاوڕوو و زمانپیس و تووڕە و تۆسن بوو. بەڵام ماندوویینەناس و زیرەک و ئامانجناس و چێژبەخش. چێژی وەردەگرت و دەشیدا. تەواوی ئەو سەروەت و سامانەی لەو دە پانزە ساڵەدا دزرابوو، هیچی بەناوی خۆی نەبوو و، لە بانکەکاندا خستبوویە سەرناوی ژنەکەی، کە کچی یەکێک لە مەلا شاپەرستەکان بوو و پاش ئەوەی شۆڕشگێڕەکان ئیعدامیان کرد، هیچ شوێن پێیەکیشی بەجێ نەهێشت.

سەرەڕای ئەو هەمووە تایبەتمەندییە سەیروسەمەرەیە، لە رووی پەروەندەکەیەوە لێم روون نەبۆوە، کە ئەو چۆن توانیی ئاوا بە گورجوگۆڵی هەموو هاوکار و هاوڕێکانی خۆی پاشقول بدا و بە مست و پێلەقە لە رێگەی پێشکەوتندا بە عەرزیاندا بدا و خۆی جێیان بگرێتەوە.

سەردەمانێک کاری ناردنی حاجییان بەو ئەسپارد. بازاڕییەکان گەلێ سروودیان پێدا هەڵگوت. لە رۆژنامەکاندا بانگەوازی زۆر چەور و خەست دەبینران، کە قەت لە سەروبەندی زیارەتی کەعبەی موعەزەمدا، هێندەی ئەم قۆناغە بەبێ کێشەو ژانەسەر نەبووە.

پێیەکی لە جەددە بوو و یەکێکی لە تاران. خۆی لە وردەکارییەکانیش هەڵدەقورتاند و خۆی بە بچووکترین کێشەی حاجییەکانەوە ماندوو دەکرد و بەردەوام بڕیاری دەدا و کێشەکانی چارەسەر دەکردن. ناوی ئازمایش، بە واتای کرانەوەی گرێکوێرەکان بوو.

خوا نەکا کڵاوی لەگەڵ یەکێک تێکەڵ بوایە. بێبەزەیی و دڵڕەق بوو. تەنیا ئەو دەموساتەی دەدی و هیچ بیری لە ئاقیبەتەکەی نەدەکردەوە. لەگەڵ ژنبراکەی، کە ئەودەم فەقێیەکی حوجرەی قوم بوو و دوایی بوو بە مەلایەکی بەناوبانگ بەناوی حاجی ئاغا ئەفخەم، قسەیان لێک هەڵبەزییەوە. لەسەر هیچوخۆڕایی، لەسەر ئەوەی بە دزییەوە بە خوشکەکەی گوتبوو، مێردەکەی وا باشترە ئەوەندە ماڵی موسوڵمانان بەفیڕۆ نەدا، ئەمڕۆ، سبەینێیەکی لەدووە. جۆرێکیشی گوتبوو، کە لەوانەیە ئیتر رۆژێک دابێ، نەتوانن پشتیان بە حەزرەتی خاوەنشکۆ گەرم بێ. هەر ئەوەی کردە دەسکەلایەک بۆ ئەوەی ناوی بزڕێنێ و دەستەیەک فەقێ و مەلای دەوروبەری وی بە دژە شا و مارکسیست ئیسلامی

لەقەڵەم بدا و بیانخاتە بەندیخانەوە. چیی مەلاکان لەگەڵی چەنەیان لێ دا بەشکم لە کەری شەیتان بێتە خوارێ، بەگوێیدا نەچوو.

دۆست و برادەری زۆر بوون، بەڵام دوژمنێکی قەستەسەر بۆسەی بۆ نابۆوە، بۆ ئەوەی پشتی بشکێنێ.

بەو حاڵەشەوە، مەسەلەی ئاڵۆز و بێچارەسەر بەلای منەوە ئەوە بوو: کە چیی کرد ئاوا توانیی لە چەند ساڵێکدا لەم قووڵکەوە بگاتە ئەو لووتکەیە؟ لە شایەتحاڵێکی تەریقکراوەی دادگاکەی کۆڵنەوە بێ و بگاتە وەزارەت و ببێتە پارێزگار؟ فرۆکەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان کرابوو و فەرماندە لەشکر و سەرۆکی ئاسایش سەریان لەبەر دادەنواند. فەرمانەکانیان لەسەر چاو دادەنا. هەر وەختێک ویستبای، بەبێ قەراردانان و کاتوەرگرتن، دەچووە خزمەتی خاوەنشکۆ و پاش یەک دوو سەعاتان دەهاتەوە شوێنی کارەکەی خۆی. بەو چاوانەی خۆم دیتم، ڕۆژێک کە جەنابی شاهەنشا لە فرۆکە دادەبەزی، تاقە کەسێکی لە ریزی وەزیرەکان و پیاوانی حوکمەت جوێ بۆوە و بەتاقی تەنێ هەتا بەردەم پەیژەی فرۆکەکە چوو و چەند ساتێک لەوێ لەگەڵ خاوەنشکۆ قسەی کرد، هەر ئەو هەتیوە قوون بەگووە بوو. دەی دیارە ئاساییە وا من هۆگری ئەو هەتیوە چاوقایمە بووم.

پەروەندەکەم خوێندەوە. ورد ورد سەرلەبەر و هەر ئەو قەدوقەڵافەتە ریوەڵەیەم دەدی کە لە هوتێلەکەی شاعەباس بە غاردان هاتە لای من و خۆی شیرین کرد کە ئەوە خانعەلی و دەماوەندی لەسەر یەک انیتۆفۆن و کامێرا خەریکن لەسەروگوێی یەکتر دەدەن هەموو پەروەندەکە ناگێڕمەوە، ناتوانم، چونکە ئیتر لەبەردەستیشم نییە، خاڵە زۆر گرینگەکانیم لەبیرە. دەزانم ئاژانس بە مەبەستی دزەکردنە نێو " (جانباختەگان)"ـەوە ناردییە فەل ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ەستین. ئاکامی چالاکییەکانی ئەوە بوو، کە سێ مجاهیدیان بە تاوانی هەوڵدان دژی ئاسایشی نیشتمانی لەسەر سنوور گوللەباران کرد. ئازم‌ایش خۆی لەکاتی کوشتنیاندا لەوێ بوو و پەنجەی لەسەر دادەنان، کە ئەمەم لە ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ‌ ﷺردووگای فەلەستینییەکاندا دیتووە و نکوڵیی تۆمەتباران بێ فایدە بوو. (جانباختەگان) دواتر ئیدیعای ئەوەیان کرد کە ئازمایش خۆی، پاش گوللەبارانکرانی سێ کەسەکە، یەکی گوللەیەکی لە مێشکیان داوە. ئاخۆ ئەو هەوڵ و کردەوەگەلەی گوێلەمستانی سەرمایەداری ئەویان گەیاندە ئەو پۆست و پلە و پێگە و داراییە؟ من پێم وانییە هەر لەسایەی ئەو تاوانانەوە بووبێ. لە ئاژانسدا کەسی لەو قوماشە زۆر زۆر بوون و هیچیشیان بە هیچ نەکرد و هەر نانەزگێکیان پێ برا.

لە پەروەندەکەدا چاوم بە نامەیەک کەوت، بەدەستوخەتی کەسێک، کە نەمدەناسی. دەقی نامەکەم لەبیر نەماوە. نووسەر خۆی بە "کۆمیتەی جاننسار" واتە گیانفیدا ناودێر کردبوو. دۆزیمەوە. شۆفێر، چێشتلێنەر و خزمەتکارەکەی تیمسار سەرلەشکر بوو. دڵنیام کردەوە کە ناوی نازڕێنم و ئاشکرای ناکەم و تیمسار هەرگیز نابیستێتەوە ئێمە پێکەوە قسەمان کردووە. ئاوا ترسەکەی رەوییەوە و ئەوەی لە بن بەڕە بوو هێنایە سەر بەڕەکە.

"شەوێکیان جەنابی ئازمایش و مادام مۆنیکا میوانی ئێمە بوون. با ئەوە بڵێم کە هیچ کەیفم بە مادام نەهات. زۆر هەرزە بوو و خۆی دەنواند. ئارەقیان خواردەوە و خۆش بوون. هەر سێکیان یەکتریان راماووسی. مۆنیکا، مادام مۆنیکا مەست بوو. پێکەوە، جەنابی ئازم‌ایش و تیمسار بردیانە ژووری خەوەکە..."

"هەر ئەوەندە؟"

"ئەی خۆ من لە ژووری خەوەکە نەبووم. هیچم نەدی. درۆیان بکەم؟"

پرسیم: "ئەی دوایی؟"

"من لە ژوورەوە خەریکی کۆکردنەوەی قاپ و قاچاغەکان بووم. دەمەویست گڵاسەکان لەسەر مێزەکانی بەر مۆبڵەکان هەڵگرمەوە، کە تیمسار بە میوانەکانییەوە هاتنەوە و توانجیان لە من دا: ئەوە چ دەکەی؟ تازە دەست پێ دەکەین. لە تەلارەکە چوومە دەرێ و لەبەر دەرگا راوەستام. سەرەڕای تریقانەوە و قاقاکێشانەکانیان، گوێم لە قسەیان دەبوو."

"چیت بیست؟"

"ئەرێ ئەوە دەتەوێ رسق سواری بای شەماڵ بکەی؟"

"خۆ پێم گوتی، کەس ئاگای لە قسەکانی من و تۆ نابێ."

"بە ئاژانسیش ناڵێیتەوە؟"

"بەڵێن بێ."

جا پرێسکەی دڵی بۆ کردمەوە.

"سەوداکەیان سەری گرت. جەنابی ئازمایش وازی لە مادام هێنا و ئەو شەوێ لە ماڵێ مایەوە. گەرەم، ئەمە ناشەرعییە. بۆ جەنابی سەرباڵیۆزم نووسی، کە لە پێناو پاراستنی ئابڕووی بنەماڵەیەکی شەریفدا پێشی ئەو هاوژینییە بگرێ، بەڵام ئەو گوێی نەدامێ. ئێستاش ئەوە دەستەوداوێنی تۆ دەبم."

"دەی تۆ بۆچی دەهری بووی؟ بەتۆچی؟"

"قوربان من لەم خێزانەدا گەورە بوومە. باپیرەم لە مڵکی ئەوانەدا رەعیەت بووە، چۆن من بەو سەری پیرییەمەوە ئەو گوناحە بخەمە ئەستۆی خۆم و دڵیشم بحەسێتەوە؟"

"ئەی نەتزانی سەوداکەیان چۆن سەری گرت؟"

"نا، قوربان، من جەنابی ئازمایشم سواری ترۆمبێل کرد و گەیاندمەوە ماڵەکەی. کە گەڕامەوە قیامەت بوو. لە گەراجەکەوە گوێم لە دەنگی مادام بوو کە جنێو بە هەردووکیان دەدا و دەیەویست بەو نیوە شەوە بە پێیان بچێتەوە ماڵەکەی خۆی. ئاخری مادام رازی بوو کە لە سەر مۆبلی تەلارەکە بنوێ و دەرگاکانی قفڵ بدا."

تۆمارکرانی ئەو نامەیە لە پەروەندەکەدا بۆ من گرینگ بوو. نووسەری نامەکە بۆ باڵیۆزخانەی ناردبوو و لە نەبوونی باڵیۆزدا، سکرتێری یەکەم، جا یان لە دوژمنایەتی لەگەڵ تیسمار یان هەر بۆ خۆپاراستن یانیش لەبەر هەردوو هۆیەکە، لە بن نامەکەوە نووسیوێتی "شیاوی گرینگیپێدان نییە." و داوێتی بە ئاژانس. بە کورتی، لەمەودوا مۆنکا بوو بە ژنی تیسمار سەرلەشکر و چووە ژنێڤ و برادەرە ئێرانییەکان تاقانە هاودەنگە دڵڕفێنەکەی خۆیان لەکیس چوو و ئیتر ناوی ئازامیش لە نێو ئێرانە خۆشگوزەرانەکانی لەندەندا، بوو بە هاوواتای چێژفرۆش.

ئەو رووداوە هەر وا سووک و سانا نەبڕایەوە. چەند مانگێکی بەسەردا تێنەپەڕیبوو کە هاوسەرەکەی تیسمار سەرلەشکر، واتە خاتوونی بەڕێوەبەر لەو خزمەتکار نوێکردنەوەیە ئاگادار بۆوە و بە کۆڵێک سەرمایەوە هاتە ئەورووپا و لە ژنێڤ نیشتەجێ بوو، بەبێ ئەوەی مێردەکەی ئاگادار بکاتەوە و، پیاوکوژێکی ئەمریکاییشی بەکرێ کرد مێردەکەی بۆ بکوژێ. دیارە ئەو چالاکییەی خاتوونی بەڕێوەبەر قەت ئاشکرا نەبوو و تەنیا لە پەروەندەکانی ئاژانسدا شوێنەوارێکی لێ کەوتەوە. بەکرێگرتنی پیاوکوژ کارێکی زۆر سووک و سانا نەبوو. هەر کامە و بڕەپارەیەکی زۆر و زەوەندیان دەویست، کە خاتوون سەرەڕای ئەوەی هیواداربوو ببێتە میراتگری مێردەکەی، پێی نەدەدرا.

ئاخری کابرایەکی تازەکاریان پەیدا کرد. ئەویش لە دواساتی جێبەجێکردنەکەدا، کە تیمساری لەگەڵ ژنێکی گەنجدا دی، بەزەیی پێیاندا هات و دڵی نەهات تەقەی لێ بکا. جەرجیسی پیاوکوژ گیرا و دانی بەوەدا نا کە خاتوونی بەڕێوەبەر ناچاری کردووە و هانی داوە ئەو قەتڵە بکا و ئەو نەیویستووە قبووڵی بکا.

میدیاکانی ژنێڤ ئەو هەوڵی کوشتنەکەیان کردە هەرایەک و ناوی تیمسار سەرلەشکر کەوتە سەر زار و زمانان و خاتوونی بەڕێوەبەر رای کردبۆوە ئێران و داوا کرا لە دەوڵەتی ئێران رادەستیانی بکاتەوە. حەزرەتی خاوەنشکۆ داواکەی رەت کردنەوە، چونکە هیچ تاوانێک نەکرابوو و نەدەکرا خاتوونی بەڕێوەبەر تەنیا لەسەر بەکرێگرتنی پیاوکوژێک بە بەرپرسیار بزانن. تیمسار سەرلەشکر نەیدەتوانی لە ژنێڤ بمێنێتەوە. داوایان کردەوە بێتەوە تاران و ئیتر تا ماوەیەکی زۆر لە ئاژانسدا بەرپرسیارەتییەکی گرینگی نەبوو.

بەڕێزیان باروبنەی تێکەوە پێچایەوە بۆ ئەمریکا و ماوەیەکی زۆر لەو وڵاتە ژیا و دیسان خەمی غوربەت هێنایەوە نیشتمان و دیسان بۆ ئاژانسی پان دەکردەوە، بەڵام ئامانجەکەی نەپێکا. پاش شۆڕش جارێکی دیکە چۆوە کالیفۆرنیا و لەوێ مایەوە و من شانازیی ئەوەم پێ بڕاوە جاروبارە نامەی بۆ بنێرم و، جا چونکە ناوی بەڕێزیانم لەهیچ کوێ نەهێناوە و نایهێنم، هەموو نەورۆزان گەورەیی دەکا چەکێکم بۆ دەنێرێتەوە.

بەڵام ئازمایش بە مرازی دڵی گەیشتبوو و مۆنیکا لەگەڵ زۆڵێکی دیکە دەستی تێکەڵ کردبوو و ئەو جووتە پێکەوە لە ئێران و ئەورووپا ئاشقەوماشقەکانیان هەڵدەخەڵەتاند و خۆیان پێ بەخێو دەکردن. دەرسێکی گرینگ کە من لە شێوازەکەی ئازمایش فێری بووم، ئەوە بوو کە پاش حەیاچوونەکەی دکتۆر بیژەن، بڕیارم دا پۆستێک بۆ ئاهاری و دەماوەندی و خانعەلی دابین بکەم کە لە داهاتوودا هەمیشە خزمەتکاری من بن و هەر پشتم بگرن. ئەگەر هەتیوەیەکی وەک ئازمایش بتوانێ ببێتە وەزیر، باشە بۆچی ئاهاری و کەسی وەک وی نەتوانن پاشقولی بدەن. ئەوە قازانجی خاوەن شکۆشە کە ئەو تازەپێگەیشتووە پەروەندەدارانەی وەک سەرۆکی کۆمپانیای نەوت کە ڕۆژێکیان خۆی ئازا کرد و فەمانەکەی خاوەنشکۆی نەخوێندەوە، خیانەت لە خاوەنشکۆ نەکەن. قازانجی ئەو کارە بۆ من لەوەدا بوو کە هەموویان لەبن دەستی خۆمدا دەمانەوە و، ناچار بوون بە ئەمری من بجووڵێنەوە. لەو هەنگەمەیەدا من بوومە مەیداندار.ئیتر پێویست نەبوو بۆ چارەسەری کێشەکان، ملکەچی ئەمر و فەرمانە جۆراوجۆرەکانی کەسانی وەک تیمسار سەرلەشکر بم. پاش ڕێکخستنی کوشتنی بەختیار دڵی سەرۆکی گشتیی ئاژانسم بەدەست هێنابوو و پشتم گەرم بوو. تەنیا ئەگەر زۆر پێویست بوایە، ئەوا کاروبارەکەی خۆم بە باڵیۆزی گەڕۆکی شاهەنشا رادەگەیاند، چونکە ئاگادار بوو و باش دەیزانی من بایی چەندم و زۆر بەرۆکی نەدەگرتم. بێ ڕکابەر بووم و قوڕ بەسەر ئەوەی شانی لە شانم دابایە. دەمترساند و دەمکڕی. ئەو چەند ساڵەی بەر لە شۆڕش دەسەڵاتێکم هەبوو کە دەگمەن مەئموورێک لە ئەورووپا هەیبووە. چێژم وەردەگرت و خەرجم دەکرد، سمێڵی سەرگەورە ئەورووپانیشینەکانم چەور دەکرد. بەخشندەیی و دڵاوابیەکەم ببووە وێردی سەر زمان. لە بوودجەی پێنج ملیۆن مارکی ـ ئەگەرچی تیمسار بەشێکی زۆری خەرج کردبوو ـ هێشتا ئەوەندە دەبوو، کە بەشی دڵاوابیەکەی من بکا. هەندێکیشم بۆخۆم خەرج دەکرد.

دکتۆر بیژەن ئەوەندە لە من دەترسا هەر مەپرسە ـ نازانم کێ تێی گەیاندبوو، کە گیرفانم پڕە ـ خۆی ئەوەندە ژیر نەبوو.

قەت نەبوو ملۆزمێکم نەبێ. شتێکی کە بەردەوام ئازاری دەدام، نامە دڵتەزێنەکانی دایکم بوون کە نەخۆش بوو و لە سۆنگەی دووربوونی لە من و روقیە ئۆقرەی لێ هەڵگیرابوو ـ هیچ خەبەرێکم لە روقیە نەبوو ـ لە سەفەرێکمدا بۆ پاریس شێخۆم دۆزییەوە. ئەو زۆر لەوە بەدفەڕتر بوو من هەڵیخەڵەتێنم. لە بارەی چالاکیی ئێرانییەکانی دانیشتووی فەلەستینەوە دواندم. وای دەنواند کە بەڵێ شتێکی بیستووە. ئەو خۆی ناوی روقیەی هێنا.

"دەنگوباسی روقیە؟"

"هیچ. جاروبارە نامەیەک بۆ دایکم دەنێرێ. ساغ و سلامەتە و لە نامەکانیدا ئایەتی قورئان دێنێتەوە. دڵی دایکم دەداتەوە. من پێم وایە دەزانێ ئەمن لە ئەورووپا دەژیم."

پرسیی:"نامەکان لە کوێوە دەنێردرێن؟"

"نازانم. بەڵام ئەگەر لە دەرەوەڕا بێ، بە دڵنیاییەوە دایکم پێی دەگوتم."

"بۆچی لە دەرەوەی ئێران؟"

"من لە تۆ دەپرسم. ئاخۆ لەوانەیە روقیە لە فەلستین بووبێ؟"

"ئەگەر لەوێ بوایە، لە پەروەندەکەی ئازمایشدا ناوێکی دەهات."

له پەروەندەکەی ئازمایشدا ئەوەی پێوەندیی بە فەلەستینەوە هەیە، راپۆرتێکی تایبەتی تێدا بوو کە ئیتر نەماوە. جارێ ئەو بەڵگانەی پێوەندییان بەوەوە هەیە، هەر لەپڕدا دەبڕێنەوە. منیش نەمتوانی پێ و شوێنیان بگرم."

شێخۆ دیوانێکی گیرفانیی حافزی کردەوە و فاڵێکی گرتەوە و ئەم شیعرەی خوێندەوە:

"ان یار سفر کرده که صد قافله دل همره اوست...... هرکجا هست خدایا به سلامت دارش."

ئەو یارە کە رۆیشتووە و سەد کاروان دڵی لەگەڵە.... لە هەر جێیەکە خوایە گیان ئاگات لێی بێ

ئەرێ بڵێی تووشی ئەو شیعرە بووبێ، یان هەر لەبەری بوو و لەبەر خاتری دڵی من بەو دەنگەی دەیخوێندەوە و لەبەر یەکی دەکێشایەوە.

ئەو وەڵامە دوورەهەند بوو، بەڵام من بۆ دڵنیاکردنەوەی خۆم، پێوەندیم بە مەلیکەوە گرت. بە هەزار فرتوفێڵ چوومە لای. خانەلی رێکی خست. بە راوێژی عەرەبی، بە فارسی قسەی دەکرد. مەراییم لەبەر کرد. باوکی لە لوبنان دەژی و لە کارمەندی دادگایە. لە دادگا بەردەوام بەرگری لە فەلستینییەکان دەکا، بەڵام خۆی قەت ناچێتە ئەوێ. مەلیکە هەر ئاگاشی لەو کەمپە فەلستینییە نییە کە تێیدا شۆڕشگێڕە موسوڵمانەکان رادەهێنرێ. تا ئێستاش نەیبیستووە کچە ئێرانییەک لەوێ بووبێ. هیوابڕاو بووم.

هەر لەو رۆژانەدا، رووداوەکەی دکتۆر بیژەن و چیرۆکی چاوەنترسییەکەی ــ ئەگەر نەشمانەوێ بڵێین کەرێتی و بێپارێزییەکەی ــ لە رۆژنامەکانی بەریتانیادا ئاشکرا بوو، کە تەواو وەزعەکەی منی گۆڕی.

دیسان ئەوەندە گرفتار بووم ەوە، کە ئیتر نەمدەپەرژا سەری خۆم بخورێنم. رۆژنامە لە راست و چەپەوە بەگژماندا هاتن. ئێمەش نەمانتوانی بیکەینە هەرا و بڵێین ئەوە بانگەشەی کۆمۆنیستەکانە. بە کەیفی دڵی خۆیان کوتایانین. هێرش و هرووژمەکەیان بۆ سەر دەوڵەتی ئێران و ساواک و تەنانەت شاهەنشاش، بێسنوور بوو. دژبەرانی رژیمی شاهەنشایی، هاتن گەمژەیی کارمەندێکیان قۆستەوە و کۆمۆنیستەکانی بە کەیفی دڵیان دەهۆڵیان بۆ کوتا. ئەو کۆمەڵانەی بەناوی "لێبوردنی نێودەوڵەتی" و "کۆمەڵەی لایەنگرانی مافی مرۆڤ" و "یەکیەتیی نێودەوڵەتیی دادوەرە دیموکراتەکان" هەر هەموویان پێیان نایە تاکەپێڵاوێکەوە، خەڵکیان دنە دەدا هەڵکوتنە سەر باڵیۆزخانە. حەفتە نەبوو کە یەکێک لە رۆژنامە گرینگەکانی دنیا وەک "لۆمۆند" و "ساند ەی تایمز" کۆمەڵێک کارەساتی نێو ئێران بڵاو نەکەنەوە. تەنانەت جێگری وەزارەتی دەرباریشیان تاوانبار دەکرد کە لە باشترین هۆتێلەکانی ئێراندا ئۆفیسێکی کردووەتەوە و هەموو پسپۆڕ و بازرگانان و کاربەدەستانی دەوڵەتە بیانییەکان و مسافیرە بەناوبانگەکانی لە رێگەی پیاوەکانی خۆیەوە خستووەتە ژێر چاودێرییەوە. یەکێک لە کارمەندەکانی "رێکخراوی لایەنگرانی مافی مرۆڤ" راپۆرتێکی لەبارەی کۆمۆنیستێکی بەناوبانگەوە بڵاو کردەوە، کە مووی لە خەڵکی بێلایەن و شاپەرستیش دەکردە نەشتەر. ئەو هەواڵنێرە پشتڕاستی دەکاتەوە کە پاش وەرگرتنی ئیجازە لە دادئەستێنی سوپا، لە دوو کۆبوونەوەوی دادگادا بەشدار بووە و خۆی لە زمانی تۆمەتبارەوە بیستوویەتی کە چۆنیان ئەشکەنجە داوە و هەواڵنێرەکە توانیوێتی جێی برینەکانی جەستەشی ببینێ. لە بەفرانباری 1348ـدا لە خورەمشار بە رووتوقووتی قەمچییان لێ داوە. بیست سەعات لەسەر یەک. هەر ئەو بەڵایەیان لە ئابادانیش بەسەر هێناوەتەوە. حەفتەیەک لە ئاودەستیان کردووە، ئینجا هێناویانەتە زیندانی ئێڤین لە تاران و دووکەس کە یەکێکیان گوتوویەتی دکتۆرم و ئەویتر ئەندازیار، ئەشکەنجەیان داوە. لەسەر چوارپێچکەیەک بەسەر یەک قاچەوە رایاندەگرت و بە شەق لە کورسییەکەی بن لاقیان دەدا و بە تۆمەتی سیخوڕی بۆ خەڵکی بیانی ئەشکەنجەیان داوە. "ئینجا دوو ئەفسەر هاتن و بە قەمچیی سیمی ئەوەندەیان لێ دام لە هۆش خۆم چووم. پەردەی گوێچکەم دڕان و خوێنیان لێ هات."

بە وتەی نوێنەرانی مافی مرۆڤ هەر ئاواشیان لە خاکسار کرد و گوتیان یەکێک لە تۆمەتباران لە ژێر ئەشکەنجەدا تاقەتی بڕا و مرد. لە و درۆ شاخدارانە لە راگەیاندنی کۆمۆنیستەکاندا لە ئەورووپا زۆر بڵاو دەبوونەوە و رۆژنامەکانی

دیکەش هەر ئەم درۆ و دەلەسانەیان کاوێژ دەکردەوە تا وای لێ دەهات ئاژانس لەو رێگەیانەوە کە خۆی دەیزانین، پێشی دەگرتن.

12ی فێبریوەری 1971، لە رۆژنامەی "لۆمۆند"ـدا دوو پارێزەری دادگا لە چوار کۆبوونەوەی دادگاییدا بەشدار بوون و ئەو برادەرانە رایانگەیاند، کە یەکێک پێی گوتوون، بە دەسکە دەمانچە لە سەریان راکێشاوە و لە ئاکامی خوێنبەربوونی ناوسەریدا، لەهۆش چووە. هەر ئەو تۆمەتبارە "بەچاوی خۆی دیتوویەتی کە دوو کەس لە هاورێکانی ئەویان لەسەر پلێتێکی سوورەوەکراو راکێشاوە. هەواڵدەرەکان دەڵێن، لە ماوەی چەند خولەکێکی داخرانی دادگەدا، شوێنی داغەکەیان لەسەر پشت و سینگی تۆمەتبار دیتووە. هەر ئەو تێکدەرە باسی مردنی هاورێیەکی خۆی کردووە کە لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی دەرچووە. هەر ئەو رۆژنامەیە، نامەی راکردوویەکی بڵاو کردووەتەوە و تێیدا باسی ئەوە دەکا: "پاش کۆتایی ئەشکەنجە، تۆمەتبار دەبێ بنووسێ وەزعی باشە و هیچی لێ نەکراوە." یەکێک لە ئامرازەکانی قسەدەرکێشان لە تۆمەتبار ئەوەیە لە سەر کورسیی کارەبایی دایدەنێن. هەر بە قسەی ئەو خراپکارە، ئەویان چوار سەعات لەسەر ئەو کورسییە داناوە تا لەهۆش خۆی چووە. سووتانەکەی گەیشتە سەر مۆرەکانی پشتی و بۆگەنێکی لێ هەستا کەس خۆی لەبەر نەگرت ـ ئاخۆ شتی وا بۆوەی دەبێ بڕوای پێ بکەی؟ ـ و ئێستاش ئەوە لەسەر دەستان دەتوانێ بڕوا. هەر دوو پێیان بڕیوەتەوە. ئاساییترین ئەشکەنجە بە "ئەلکترۆد" دەکرێ. من بڕوا ناکەم ئەو کارەساتانە راست بن و هەر هەموویان بە رای من بانگەشەی کۆمۆنیستین. من ئەودەم لە ئێران نەبووم و بڕوا ناکەم حەزرەتی شاهەنشا رێگەی دابێ تاوانی ئاوا بکرێ. خۆی جەنابی خاوەنشکۆ هەموو ئەشکەنجەیەکیان وەدرۆ خستووەتەوە و لە وەڵامی یەکێک لەو رۆژنامەنووسە نیمچەکۆمۆنیستانەدا پێی داگرتووەتەوە: "خەتای دژبەرەکانی ئێمە ئەوەیە ئێمەیان بەکەم گرتووە. ئێمە لە زۆر بواردا و یەک لەوان لە لێپرسینەوەدا زۆر پێشکەوتووین.. بۆ وێنە زۆرهێنانی ئەخلاقی هەیە و کەسانی وەک سارتر وا باشترە خۆیان نەکەنە تۆکی نێو هەموو چێشتێکەوە و خەریکی کاروباری خۆیان بن. بۆ بابەتێکی دیکە فەرموویانە، من دەسەڵاتی هەموو شتێکم نییە. یانی لەوانەیە یەکێکی چاونەترس کارێکی وای کردبێ کە نەدەبوایە بیکا، یان بۆ وێنە تیمسار سەرلەشکر و "خاتی"ـی بەردەستی.

من کە لە دەرەوەی وڵات دەژیام، دیارە چاومان بەسەر بەدفەرپیی قوتابییەکان بەتایبەتی کۆنفدراسیۆنییەکانەوە بوو و هەوڵمان دەدا هێندێکیان لە قازانجی سیاسەتی وڵاتدا بێنینە ژێر سێبەری شاهەنشادا. دیارە ئەو شێوازە خەرجی هەبوو و ئێمە بە وادە و بەڵێن و یارمەتیی دارایی هەوڵمان دەدا، هەر نەبێ وایان لێ بکەین دەست لە بەرهەڵستکاری هەڵگرن و جاری واش هەبوو دەستمان لەبنی هەنبانەوە دەردەچوو. پووڵەکەیان لێ دەستاندین و گاڵتەیان پێ دەکردین. بەڵام ئەو بەڵایەی بەسەر دکتۆر بیژەنیان هێنا، پشتی ئەوی شکاند و خواهەڵناگرێ سەلماندی کە هەر حاجی عەلی ساوجییەکە و هیچی دی، نە زیاد و نەکەم. لە بری ئەوە منی سەربەرز کرد.

لە بەهاری ساڵی 1353ـدا بوو کە ئەم هەواڵە لە رۆژنامەی ساندی تایمزدا بڵاو بۆوە و هەرچی کردمان نەمانتوانی بیسەلمێنین بڵێین ئەویش گوێلەمستی کۆمۆنیستانە، هەر بۆیە دکتۆر بیژەن سەرسمی دا و دەوڵەتی ئێران ناچار بوو داواکانی ئەو رۆژنامەیە جێبەجێ بکا و رێکی بخا.

لەسەر مەسەلەکەی خانمی "پ" بوو، ئەو کچە ئێرانییەی شووی بە گەنجێکی ئینگلیزی کردبوو. خاتوو "پ" قوتابیی کۆمەڵناسی و یەکێک بوو لە سەرکردەکانی تاقمێکی قوتابییە چەپەکانی سەر بە کۆنفدراسیۆنییەکان و جاروبارە لە بانگەشەدا یارمەتیی دەدان و، لە گیروگرفتەکانیاندا دەستی دەگرتن و رزگاری دەکردن. خاتوو پ پاش ئەوەی مێردی بە کابرای ئینگلیزی کردبوو، ببووە هاووڵاتیی بەریتانیا و لە کۆمپانیای نەوتی لەندەندا کاری دەکرد. سەرۆکەکەی لە لەندەن رایسپارد سەفەرێکی ئێران بکا و ئەرکێکی پێ ئەسپاردبوو کە رایپەڕێنێ. دوو رۆژ پاش ئەوەی گەیشتەوە ئێران بە تەلەفۆن پێی راگەیەنرا، کە بچێتە خانووەکانی ئاژانس و خۆی بە یەکێک لە ساواکییەکان بناسێنێ. ئەوە شتێکی ئاسایی

بوو. چونکە هەموو کارمەندانی کۆمپانیای نەوت بەتایبەتی ئەوانەی دە چوونە دەرەوەی وڵات دەبوایە لە پێشدا دڵنیایی بدەنە کۆمپانیاکە، دوایی خەریکی کاری خۆیان بن. لەوێ خاتوو "پ"ـیان خستە بەر لێپرسینەوە و تێیان گەیاند کە تەواو ئاگادارن بنەماڵەکەی لە ئێران و لەندەنیش چ دەکەن و دەیانەوێ بزانن خۆی لە بارەی خۆی و بنەماڵەکەی و بنەماڵەی مێردەکەی رای چییە و دەڵێ چی. تەنانەت لێیان نەشاردەوە کە هاوینێ لەگەڵ باوک و دایکی لە "دەریاسەرا" بووە و لەوێ جاروبارە خەڵکی ئاسایی دواندووە و وێنەی لە هەندێ بینای حکوومییش گرتووە. پاش سەعاتێک قسەوباس لەبارەی ئەو شتانەی لە بەریتانیا بەشێکن لە بابەتە ئاساییەکانی ژیانی و هیچ لایەنێکی نهێنی و شاراوەی نییە، بە خێر و خۆشییەوە سواری ترۆمبێلیان کردووە و گەیاندوویانەتەوە ماڵەکەی.

بەو پێشینەوە کە خاتوو "پ" نەیدەویست هیچ شتێک دژی مێردەکەی بکا و پاش ئەوەی ساواکی ناسی، رۆژێکیان دوای گفتوگۆیەکی تەلەفۆنی لەگەڵ دکتۆر بیژەن رازی ببوو لە رستورانتێک چاوی پێی بکەوێ. خاتوو پ لە کاتی دیاریکراودا دەگاتە شوێنی مەبەست و جەنابی دکتۆر بیژەن کە جلوبەرگێکی نیلیی رێکی لەبەردا دەبێ وەژوور دەکەوێ و لە تەنیشت مێزەکە رادەوەستێ و ئیزنی لێ دەخوازێ دانیشێ. قەول و قەراریان وا بووە کە ئەوەی دێ، گۆڤارێکی "خواندنیها"ی بەدەستەوە بێ و خاتوونیش ئەو جانتا چەرمییە رەشەی ساواک پێی دابوو. بە کورتی داوای دکتۆر بیژەن ئەوە بوو کە جاروبار هەندێ وردە زانیاری لە سەر مێردەکەی و ئەو هاوڕێ ئێرانیانەی مێردەکەی کە هاموشۆیان دەکەن، بداتە وی. دکتۆر بیژەن حەزی لێ بوو بزانێ کاری ئەو قوتابییە ئێرانیانەی هاموشۆ‌ێان دەکەن تەنیا ویسکی خواردنەوە نییە. وا باشە کارێکی وا بکەی متمانەت پێ بکەن و ئاژانس لە هەوڵ و تێکدەرییەکانی کۆنفدراسیۆنییەکان ئاگادار بکەیتەوە. ئەو جەنابی دکتۆر بیژەنە لە خۆشیی چێشتەکە، کەوتە نێو مەنجەڵەکەوە. پ ەتەی کەوتە سەر ئاوێ. خاتوو پ تەنیا دەیەویست ئەوەندە بزانێ: چ دەبێ ئەگەر من نەتوانم مەبەست و داخوازییەکەتان جێبەجێ بکەم؟ جەنابی دکتۆر بیژەن وەڵامی داوە:

"کەس نازانی. لەوانەیە هەم من و هەمیش تۆ بکەوینە بەر هەڕەشە و مەترسییەوە."

هەر ئەوەندە و، وایان دانا کۆبوونەوەکەی دیکەیان لە کۆنسولگەریدا بێ.

ئەو دکتۆر بیژەنە کەرە نەیدەزانی جانتاکەی خاتوو پ دەنگهەڵگرێکی تێدایە و ئەو قسانەی پاشکەوت کردووە.

جا خوێنەر لە من دەپرسێ، ئەو زانیارییانەم لە کوێ هێناوە؟ بەشێکیان لە پەروەندەکەدا هەیە و راپۆرتێکی تێروتەسەلەیشی لە "ساندەی تایمزدا" بڵاو بۆتەوە.

چەند رۆژ پاش ئەوە حاجی عەلی ساوجی بانگ کرایە تاران و ئیتر چاوی رەشی کاڵ ببوونەوە و من لە بەریتانیا بوومە هەمەکارەی ئاژانس.

راگوێزرامە ماڵەکەی دکتۆر بیژەن و هەموو کارمەندەکانی باڵیۆز خانە زانییان من چ کارەم. ماڵەکەم بوو بە مەکۆی دۆستان و، تەنانەت باڵیۆز و هاوسەرەکەشی دەهاتنە سەردانم و لەم و لەویشم بیستەوە کە جەنابیشیان پێی ناخۆش نییە کچەکەی لە ملی من قایم بکا. هەمووانم تێگەیاند کە ئیتر من ئەهلی ژنهێنانەوە نیم. هەر لەگەڵ ئەم مۆنیکایەشدا دەتوانم چەند حەفتە بیگوزەرێنم و ئەوجار خۆم بە یەکی دیکە گەرم بکەمەوە. سکرتێری یەکەم و دووەم بوونە هاوڕێم و تەنانەت بەبێ ئاگادارکردنەوەش دەهاتنە ماڵم و هەمیشە شتێکی وام هەبوو میوانداریان بکەم بەبێ ئەوەی زیانێک بە کارەکەم بگا کە لە ژوورێکی دیکەدا دەمکرد. ترۆمبێلی مەرسدێس بێنزم لەبن پێدا بوو و بلیتی فڕۆکەم بۆ هەموو ئەورووپا هەبوو و چەکی بانکیی فەرانکفۆرت و ژنێڤیش لە گیرفانمدا.

تەنیا ئەمری نوێنەری گەڕۆکی خاوەنشکۆ لە ژنێڤم لەگوێ دەگرت و ئەگەر کێشەیەک هاتبایەتە گۆڕێ، پێوەندیم بە خودی سەرۆکی ئاژانسەوە دەکرد کە زۆربەی جاران بە قازانجی من دەشکایەوە.

کارەکەی من گەشەی کرد و هەموو ئێرانی گرتەوە. لە هەموو جێیەکەوە کاغەز و پیرۆزبایی و داوای کار و یارمەتیم بۆ دەهات.

لە میرزاعەلیخانەوە کە ئەو خۆی لە وەزارەتی دارایی دایمەزراندم، کاغەزم بۆ دەهات کە ئێمە خزمەتکارتین و چاوەڕوانیی وای لێم هەبوو کە دیارە لە دەست من نەدەهات، ناڕەحەتم نەدەکرد، بەڵێنم پێ دەدا و دەمزانی ناتوانم هیچی بۆ بکەم.مووساگیان، ئاواڵەکەی سەردەمی منداڵیم کە هەروا جارێ سەرۆکی بانکی ئەردەبیل و جارێ قوم و جارێکی تر لاهیجان بوو، وازی نەدێنا و پێی وابوو دەتوانێ بەردەستیم بکا. تەنانەت دکتۆر بیژەن و جیهانگیریش کیسەیان هەڵدوورییبوو و دوعای بەخێریان بۆ دەکردم.

لە هەمووان سەیرتر، ئاماژەکانی زاوازێڕینە بوو، کە تووشی دڵەڕاوکێی دەکردم و دەینووسی، هێشتاماڵی ئێمەی خۆش دەوێ.

"جاروبار بە لای ماڵتاندا تێدەپەڕم. هەر جارێکی تووشی دایکت دەبم، سڵاوی عەرز دەکەم. روقیە خانم هیچ خەبەرێکی نییە و لەسەر هەستم ئەگەر لە جێیەک سۆراغێکیم زانی، ئاگادارت دەکەمەوە."

ئەرێ دەکرا لەم نامەیە وا تێ بگەی کە ئەو بەردەستەیان راسپاردووە دیسان لە دەوروبەری ماڵی دایکم شوێن پێی روقیە هەڵگرێ؟ بە رەمز و ئاماژەی تەلەفۆنی ئەوەم بۆ دکتۆر بیژەن باس کرد. زۆری نەبرد دیسان هەر ئەو زاوازێڕینەیە نامەیەکی دیکەی هات کە "تۆ وا باشترە لەو بارەیەوە قسەی دڵی خۆت بۆ کەس نەکەی، ئەوانە هاوڕێی نانی نانین."

تۆ بڵێی دیسان باسی روقیە کرابێتەوە؟ یان ئەوەی کە خەڵکی بەخیل، کە سەردەستەکەیان حاجی عەلی ساوجی و تیمسار سەرلەشکرن، دەیانەوێ مەسەلەی روقیە بکەنە کراسەکەی عوسمان و فێڵ و دەهۆ رێک بخەن و سەرموقلاتێکم پێ لێ بدەن. خەیاڵیان خاوە. من دارێک نیم بەو بایانە بلەرزم. دەستە چەکی جۆراوجۆرم لە باخەڵدایە.

مووساگیان وازی نەدێنا. پا و پێلاوی بۆ ماڵی دایکم کرابۆوە. هەر جارێکی دەهاتە تاران، سەرێکی دایکمی دەدا و بەخۆیدا هەڵدەگوت. هەندێ لە قسەکانی دایکم لەسەر تەلەفۆن بۆ منی دەگێڕانەوە و دەیگوت: ئەرێ یانی چی هەندێ کەس رۆژانی چوارشەممە پارەیان لێ بزر بووە و هەندێ کەس دۆزیویانەتەوە؟ بۆ ئەو ژنە داماوەم روون دەکردەوە کە مەبەستی ئەوەیە هەردووکمان پێکەوە دەستمان پێ کردووە و ئێستا من پلەوپایەم بەرز بۆتەوە و ئەو لە قوڕ چەقیوە. چاوەڕوانیی ئەوەی بوو بانگهێشتی بکەمە لەندەن و لەوێ پێکەوە بین و کۆمەڵێک زانیاریی لەبارەی روقیەوە هەیە کە ناتوانێ بیاننوسێ و دەیەوێ بەتایبەتی پێم بڵێ. کە لێی وردبوومەوە سەیرم کرد خراپ نییە بەڵام بنیادەم خۆ نابێ متمانەی بەچاوی خۆیشی هەبێ. ئەی دەکرێ متمانە بە مووسا گیان بکەی کە چەندین ساڵە نەتدیتووە؟ قەت پێم وانەبوو بنیادەمێکی وەک حاجی خان ساوجی کە پێکەوە لە گرتن و بەردانی کۆمۆنیستەکان و بەرتیلوەرگرتندا شەریک بووین و ئێستا پارووی لە رۆن کەوتووە، ئێستا ئەوەندە چەپەڵ بێ پاشقولم بدا و سیخوڕ لەسەر ماڵی دایکم دابنێ بۆ ئەوەی شوێن پێی روقیە هەڵگرێ. ئەم زاوا پلەنزمە لەوە دەستەوستانترە کە بیەوێ جێی من بگرێتەوە. زۆر بلش دەزانێ من لە بیست ساڵیمدا کڵاوم ناوەتە سەر کەسانی وەک شویری و کەعبی و زۆر باشیش باشاری ئەو دەکەم.

هەواڵێکی ترسناک لە پاریسەوە هات. شێخۆ تەلەفۆنی کرد. نیوەی شەوێ بوو. لەخەوی هەستاندم. پرسیم:

"ئەوە بەو نیوە شەوە چیت لە گیانم دەوێ؟"

"هیچ، هەر ویستم ئەحواڵێکت بپرسم. غەرییبم کردبووی."

"جا ئەم وەختی شەوە، کاتی ئەحواڵپرسینە؟"

"ئاخر خۆ بە رۆژ ئەو بەرێزەم لە هیچ کوێ دەست ناکەوێ. بنیادەم ناچارە شەو و نیوەشەو لە جێوبانی خەو بیهێنێتە دەرێ. دەی باشە، ئێستا سەرودڵم گرتووی؟ میوانت هەیە؟"

ژمارەی تەلەفۆنەکەمی لە ناوەندی شەووڕۆژانەی باڵیۆزخانە وەرگرتبوو. قسەکردنەکەمان نیوسەعاتێکی خایاند. شتێکی گرینگم دەست نەکەوت. ئەو سیخوڕە کۆنەکارە دەیزانی هەرچی قسەی شەوانەیە ، هەڵیدەگرمەوە (ڕیکوردی دەکەم) و نەیدەویست شتێک بەدەستەوە بدا. هەر ئەو شەوە شریتی قسەکانمانم دوو سێ جار لێ دایەوە و لە سوعبەتەکانیڕا کە ئێستا زۆرم بیر کردووە، زانیم دەیەوێ شتێکم پێ بڵێ بەڵام لەسەر تەلەفۆن نابێ. مارانگاز لە هەموو پەتێک دەترسێ. دەسبەجێ روقیەم هاتە پێش چاو. لەخەونمدا بوو ئەوە ئەشکەنجەی دەدەن. وەخەبەر هاتم.

کۆتاییەکانی مانگی بەفرانبار بوو. هەوا سارد بوو. لە پەنجەرە بەستووەکانی ژوورەکەمەوە تەنانەت سپیاتیی بەفرەکەش دیار نەبوو. بە کاغەزبڕەکە سەهۆڵی سەر شووشەکەم کڕاند. مانگی چاردە هەموو باخچەکەی رووناک کردبۆوە. ساتێک پەنجەرەکەم کردەوە. تەزووی سەرما چزووی لە دەموچاوم گرت و رووشاندی. پەنجەرەکەم داخستەوە و پەردەم دادانەوە. تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و گوێم لە دەنگی شێخۆ بوو. بە فەرەنسییە شەق و پەقەکەیڕا زانیم خۆیەتی. پێکەنین گرتمی. پرسیم:

"ئەوە کێیە لە سەر تەلەفۆنەکە بەو فەرەنسییە رەوانە قسە دەکا؟"

بە فارسی وەڵامی دامەوە:

"کێیە بەو نیوەشەوە تەلەفۆن دەکا؟"

وەڵامم داوە: "هەر ئەو کەسەی تۆ لە خەوت هەستاند."

"تۆی؟ دەی چیت دەوێ؟"

"منیش بیرم کردووی."

"کەوابوو هەستە وەرە با تاوێک خۆش رابوێرین."

قەول و قەرارمان دانا و چەند رۆژ دواتر لە فرۆکەخانەی ئۆرلی دابەزیم و یەکڕاست بە تەکسی چوومە هوتێلەکەی. بە پێشخانەکەوە تەلەفۆنم کرد بۆ ژوورەکەی. پێداگربوو بچمە لای. قبووڵم نەکرد. چۆن زانیبام چ فێڵێکی لەبن سەریدایە؟ لەو بەڵایەی لە رستوڕانتەکە بەسەر دکتۆر بیژەن هاتبوو، پەندم وەرگرت. نەمدەویست بەڵگە بدەم. گوتم:

"یا شێخ، چۆنی دانیشتووی، ئاوا هەستە وەرە خوارێ پێکەوە چایەک بخۆینەوە. بەڵام بەبێ فرتوفێڵ."

"گزیکار و فێڵاوی تۆی. ئەوە هاتم."

کە لە ئەسانسۆرەکە هاتە دەرێ، لێی ورد بوومەوە. هیچ جانتا و شتی پێ نەبوو. تەنیا لاپەڕەکاغەزێکی بەدەستەوە بوو. چووین و لە گۆشەی تەلارەکە دانیشتین و ماوەیەک هەر قسە و هاتەران پاتەرانمان بوو. ئیتر پرسیم:

"خۆ دەنگهەڵگر و شتی وات پێ نییە؟ گیرفانت هیچی تێدا نییە؟"

گوتی: "پیاوی باش، خۆ من ساواکی نیم. من دوورەپەرێز بوومە. تۆ کارت بە کاری من نەبێ، منیش زیانم بۆ پەز نابێ. دەنگهەڵگرم بۆچییە؟"

وەکی ژیران سەیری گەمژان دەکەن، چاوێکی لێ کردم و گوتی:

"با بچینە سەر باسەکەی خۆمان. رۆژێکیان پێم گوتی ئێوە خاون و هەر ناشزانن دوژمن لە کوێی بۆسە ناوەتەوە و خەریکە رەگ و ریشەتان لە بن دەردێنێ..."

قسەکەیم پێ بڕی:

"یاشێخ، منت هێناوەتە ئێرە ئامۆژگاریم بکەی؟ ئێمەش ئەوانەمان خوێندووەتەوە. چیت لە باراندایە؟"

کاغەزەکەی لەسەر مێزەکە لێک کردەوە. لە پێشدا جگە لە وێنەی چەند گەنجێک هیچ شتێک سەرنجمی رانەکێشا. هەڵمگرت و لە پڕ بەری چاوم رەش بوو. وێنەی دوو کچ لەسەر کاغەزێک کە وەک ئاگادارییەکی دیواری بوو، بەدی دەکرا. یەکێکیان روقیە بوو، پانزە شانزە ساڵ لەوەپێش. کە لێی ورد بوومەوە، هەر ئەو وێنەیە بوو کە بە

دەسگیرانداری گرتبووی. دیار بوو لەو وێنەیان گرتبۆوە کە لەگەڵ دەسگیرانەکەی بووە و گەورەیان کردۆتەوە. وێنەی دووەم دەکرا روقیە بێ، لەچکێکی رەشی لەسەر بوو کە لەبن چەناگەیەوە گرێی دابوو و تەنیا دەموچاوێکی خڕی نیشان دەدا، بەڵام ئەو وێنەی دووەمە هیچ لە روقیە بچکۆلانە و لەبەردڵانەکە نەدەچوو. دەموچاوەکەی وەک جاران دڵڕفێن و جوان نەمابوو. زەبروزەنگ و توندوتیژی و کەللەڕەقی و تووڕەیی و بێبەزەیی لە چاو و لێو و زاری دەباری. لەبەرخۆمەوە گوتم: ئەوە روقیە نییە.. خۆ ژنێک بە زەبر و لێدانێک ئاوای لێ نایە. ئەی کوا لەسەرخۆیی و ناسکی و سادەییەکەی؟ ژنێکی ئازارچێشتووی تاڵی و سوێری چێشتوو سەیری دەکردی.

ماوەیەک هەر وا لێی ورد بوومەوە.

لەبەر خۆمەوە، بەڵام بە ورتەیەک کە شێخۆش گوێی لێ بوو گوتم:

" نا، ئەمە روقیە نییە."

شێخۆ چایەکەی خواردەوە و ﷼مری کرد کۆنیاکیان بۆ هێنا. وەک بڵێی هەر گوێ نەداتە من و خەریکە چەند کات و ساتێکی بێ خەم رادەبوێرێ.

من ئاگادارییەکەم لەبەر رووناکاییەکە راگرت و دیسان لێی وردبوومەوە.

دیارە لە شارەکان بڵاویان کردووەتەوە. سەیرە من تا ئێستا بەوەم نەزانیوە. خەڵکی حەسوود لێیان شاردوومەوە، بۆ ئەوەی لە عەرزم بدەن. پرسیم:

"ئەو ئاگادارییە کەی بڵاو کراوەتەوە؟"

"لەوانەیە دوێنێ یان پێرێ. هەر ئەو شەوەی تەلەفۆنم بۆ کردی، مسافیرێک، یەک دانەی بۆ هێنام."

"دەزگاکانی ئێوە لە هیی ئێمە باشتر کار دەکەن."

"من دامودەزگام نییە. دۆستان چاکەیان بەسەرمەوەیە."

"دەڵێی چی؟"

"جا چیم هەیە بیڵێم. من هەر لە ئەوەڵەوە دەمزانی ئەو کچە سەری بە جێیەکەوە بەندە. بۆ نەگبەتی ئێوە پاکانەتان دەکرد و لە هەموو شوێنێ بە شوێن بێچووە کۆمۆنیستانەوە بوون و خەنیمە سەرسەختەکەشتان بەهیچ دانەدەنا و جاری وابوو هەر حیسابیشتان بۆ نەدەکرد. جا ئەوە ئێستا دەردەکەوێ چەندە بەسەهوو چوون. رووگە لەم لایە و ئێوە چوونەتە تورکستان."

لە هاتەران پاتەران زیاتر، هیچم لەو شێخۆیە دەست نەکەوت. لێم پرسی:

"هیچ پێوەندییەکت لەگەڵ فەرزان هەیە؟"

"پێوەندیم لەگەڵ ئەو نییە. دەزانم هەموو شەوێ لە کافتریایەک لە رووی بالزاک کەوتووە. ژوورەکەی ساردوسڕە و پێی گەرم دانایە و خەرج و مخاریجی گرانە. خراپ نییە سۆراغێکی بگری. بە دڵنیاییەوە زانیاریی لە من زیاترە. سەردەمانێک نێوانی لەگەڵ روقیە زۆر خۆش بوو."

فەرزانم دۆزییەوە، یەکێک لە بەردەستەکانم ناردە لای و لێم راسپارد، کە یەکێک لە کۆنە ناسیارەکانی خۆی حەزی لێیە چاوی پێی بکەوێ. فەرزان پەیامەکەی منی بەهەند وەرنەگرت. سەری لەسەر ئەو کتێبەی بەدەستییەوە بوو هەڵگرت و گوتی:

"هەر کەس کاری بە منە، با بێتە ئێرە."

لەسەر کوتە کاغەزێک بۆیم نووسی: کارم بەتۆ نییە، یارمەتیم لێت دەوێ. چەند دەقەیەک وەرە پێکەوە قسەیەک بکەین. بن نووسینەکەم ئیمزا کرد.

من لە ترۆمبێلی باڵیۆزخانەدا دانیشتبووم. لە دوورەوە دیتم گران و سەنگین و لەسەرخۆ دەڕۆیشت. ئەو پیاوە کەڵەگەتە بەژن زراڤە تۆزێک پیرتر دیار بوو. بەڵام گرانوسەنگینییەکەی لێی کەم نەببۆوە.

لە ترۆمبێلەکە دابەزیم. دەرگاکەم کردەوە. دەستومشتاقم لەگەڵ کرد. لە شانی راستم دامنا و خۆم لە دەرگاکەی دیکەوە چوومەوە پشت سوکان.

"جەنابی سکرتێری باڵیۆزخانەی پاشایەتی لە بەریتانیای مەزن، ئەوە چۆن بوو منت بیر کەوتەوە؟"

"جەنابی فەرزان، لەو قسانە گەڕێ، خەریکە لێم دەقەومێ."

ئاگادارییەکەم پێشان دا. سەیرێکی کرد و تاوێک راوەستا. دایەوە دەستم و چاوی لە چاوم بڕی. ترۆمبێلەکەم لادا و لێی ورد بوومەوە.

"بۆ ئەتۆ چاوەڕانییەکی دیکەت هەبوو؟ تۆ، تووشی ئەوەت کرد. چیت لە گیانی من دەوێ؟ ئەو کاتی هەرا و سەمای مەستانەتان بوو... ئەرێ هیچ خەمی ئەم زستانەتان بوو؟"

من بێدەنگ بووم. پرسیم:

"ئەو ژنە لەچک بەسەرەش روقیەیە؟"

چیی لە دڵیدا بوو و بەزاریدا هات پێی گوتم. فەرزانی بەمشوور و بەپارێز و دڵڕاگر، خۆی پێ نەگیرا. ئاوێکی ساردی بەدەستمدا کرد. جوان و زەریف شوشتمییەوە. نەموێرا نقەم لێوە بێ. ئیتر چیی نەمابوو منیش جنێوباران بکا. خەریک بوو بگریم. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا تەریق بوومەوە. پێی سەیر بوو و گوتی:

"سەیرە! هێشتا تۆزە ئینسانییەتێکت تێدا ماوە؟ وا دیارە ئێستا خەریکە هەست دەکەی خوشکەکەتت خۆش دەوێ."

تێدا مام. نەمدەزانی چیی جواب بدەمەوە. زمانم لە گۆ چوبوو.

"ئەو رۆژەی گوێزت بە کلکان دەشکاند، ئەم رۆژانەت لەبەرچاو نەبوو."

لە ترۆمبێلەکەی باڵۆزخانە دابەزین. منی بردە کافتریایەکی چەپەک لە دەرەوەی پاریس. داوای مینایەک شەرابمان کرد و چاومان بڕییە رەنگی سووری شەرابەکە. زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

"ئێمە لە جامی مەیدا، روخساری یار ئەبینین. منیش ئەوم خۆش دەویست، بەڵام ئەو شێت و شەیدای حەز و خولیاکەی خۆی بوو. نەمتوانی دڵی دەستەمۆ بکەم. نازانم کێ گوناحبارە؟ تۆ و من و هەمووومان."

هەقی بوو. هەرچی دەیگوت راست بوو. قەت لە ژیانمدا ئەوەندە بێدەسەڵات نەبوومە. هەر بەراست تا ئەودەم نەمزانیبوو ئەوەندەم روقیە خۆش دەوێ. ئەو کات دڵنیا بوومەوە کە زەبروزەنگەکەشی لەسەر من، خۆشەویستیی خۆشکانە بووە بۆ براکەی. بەبێ ئەوەی زار بکەمەوە، منیش وێنەی روخساری یارم لە جامی مەیدا دەدی.

"چ بکەم جەنابی فەرزان؟"

"هەستە بچۆوە تاران. هەوڵ بدە روقیە رزگار بکە. ئەگەر تا ئێستا نەیانگرتووە، دەیگرن. بە زیندوویی یان مردوویی، من روقیە باش دەناسم. بە زیندوویی خۆی بەدەستەوە نادا. سەدا یەک ــ نا یەک لە هەزار، هیوام بەوەیە تۆ بتوانی رێی راکردنی لە ئێران بۆ بکەیەوە. هەر ئەوەندە. هیچی دیکەی لەگەڵ ناکرێ. دەزانم کارامەیە و لێهاتووە و لە فەلستین راهێنراوە و بەردەوام ژەهری پێیە بۆ ئەوەی خۆی بە دەستەوە نەدا."

"چۆن بچمەوە تاران؟"

"خەتەرە؟ بۆ ژیان بەبێ خەتەر دەبێ؟ هەر ئێستا کە تۆ لەگەڵ من لێرە دانیشتووی و خەریکی لەگەڵ یەکێک لە نزیکەکانی بەختیار قسە دەکەی و لێی دەکۆڵییەوە، هەست بە مەترسی ناکەی؟ من سات بە سات چاوەڕێی ئەوەم یەکێک لە پشتەوەڕا فیشەکێکم لێ بدا. "یا نەبیتە دۆست و هاوڕێی فیلەوان... یان بینایەک دروست بکە هاوشانی فیل." ئەوە مۆرێکە و چارەنووس لە نێوچاوانی داوین."

هەر گوتی و نەیبڕییەوە. خەریک بوو گیرۆدەی دەکردم. پیاوێکی بەڕێز دیار بوو. ڕاست، بێپێچوپەنا، پێداگر، سادە و ڕاشکاو. هیچ نەدەترسا، دەتگوت لەگەڵ خۆی قسە دەکا، نەک لەگەڵ بەرپرسی ئاژانسی پاراستن و زانیاریی وڵات لە سەرانسەری ئەورووپادا. پیاوێکی لەبەردڵان بوو. هەژار کەوتبۆوە، بەڵام گرانوسەنگینییەکەی گاڵتەی بە من دەکرد. بۆینباغی نەبەستبوو. بۆ ئەوەی سەرمای نەبێ، ملپێچێکی کەسکی لە ملی ئاڵاندبوو. گنجی نێوچاوانی جار بە جار قووڵتر دەبوونەوە و دیسان ڕێک دەبوونەوە. حەزم لێ بوو دەستی بگرم. نەموێرا، تەنانەت نەیهێشت پووڵی مینایەک شەرابیشی بدەمێ.

"جەنابی فەرزان، ئەگەر من کارێکم لەدەست دێ، قسووری ناکەم."

"تۆ لە یارمەتیی روقییە درێخی مەکە. غیرەت بنێ بەرخۆت."

تا لای ترۆمبێلەکە پێکەوە ڕۆیشتین. لێم پرسی:

"جەنابی فەرزان ژیانت باشە؟"

"ئەوەندە هەیە بیخۆین و نەمرین."

"داهاتت لە کوێوەیە؟"

"هەر دەڵێی تۆ ساواکی نیی وا ئاگات لە ژیانی من نییە؟ بە سواڵ و ئەو سەد دینار و سێ شاهییەی لە تەرجەمە و ڕاستکردنەوەی بەرهەمی خەڵکی وەردەگرم. ئەی تۆ خۆت دەماوەندیت نەناردە لای من کە نامەی دکتۆراکەی بۆ بنووسم؟"

کوڕە پیاوی زۆر جوامێر لەم دنیایە هەن. سوبحانەڵا.

بە ترۆمبێلەکەم گەیاندمەوە ئەو کافترییایەی لەوێ دۆزیبوومەوە. کە ماڵاواییم لێ کرد، گوتم:

"جەنابی فەرزان، من کەسم نەناردووەتە لای تۆ. ئەو بوودەڵەپیاوە هەم تۆ پاشقول دەدا و هەمیش من. ئاوای ناخوا. قەول بێ بەڵایەکی بەسەر بێنم بە کەرێ بڵێ خاڵە."

"دەتەوێ ئەم نانەشم ببڕی؟"

وەڵامم داوە:

"نا، دڵنیا بە. دکتۆرێکی سەگباب هەبێ و نەبێ کێشەیەک چارەسەر ناکا."

لە ماڵاواییکردندا دڵم زۆر توند بوو. حەزم لێ بوو ماچی بکەم. ئەو کابرایە سەردەمانێک ئاشقی روقیە بووە. ئەویش ئەودەمەی پاش تەڵاقوەرگرتنی لە مێردکەی، شانی دابووە بەر باری تەڵاقدراوی. توند توند دەستیم گوشی. ئەو دەستی منی نەگوشی.

کە سواری ترۆمبێلەکە بوومەوە و لە نێو ڕێبوارەکانی شەوێدا چاوم بە دوویەوە بوو، فکرێکم بەزەیندا هات و ڕێگەیەکم دۆزییەوە کە یارمەتیی بدەم بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ ئەو نیعمەتەی لەکوێوە بۆ دەبارێ.

لە پاریسەوە چوومە ژنێڤ. لە ڕێگەی ئەو کەسەوە کە جێی مەملووکی گرتبۆوە، چوومە لای باڵیۆزی گەڕۆکی پاشایەتی کە سەرپەرشتیاریی هەموو قوتابیانی لە سەرانسەری ئەورووپادا لە ئەستۆ بوو. دەمویست بزانم بڵاوبوونەوەی وێنەی روقیە لە ریزی تێکدەراندا، ئاخۆ هیچ بارودۆخی سیاسی و ئیداریی منی گۆڕیوە یان نا؟

هەڵسوکەوتی جەنابی سەرباڵیۆز کە دیاربوو پاش حەیاچوونەکەی دکتۆر بیژەن گرینگیی منی هەست پێکردبوو، زۆر خۆمانە بوو و ئەو شەوەمان خۆش ڕابوارد. چووینە دیسکۆیەک و لەوێ لەگەڵ چەند ژنێکی ژیکەڵانە ڕامانبوارد و نیوەشەوێ بە نیوەسەرخۆشی چووینەوە خەوتنگەکانمان. کە لێک دادەبڕاین، جەنابی سەفیر ئەوەندەی هۆش هەبوو پێم بڵێ:

"سبەینێ پێش ئەوەی بچێتە فرۆکەخانە وەرە لای من. نیوسەعاتێک پێکەوە کارمان هەیە. ئەگەر کاتت نەبوو، دەتگەیەنمە فرۆکەخانە."

مەبەستی ئەوە بوو لەسەر بەردەستەکانم ساتوسەودام لەگەڵ بکا. لە نووسینگەکەی لێی پرسیم:

"ئەو دەستپەروەردانەی تۆ کەی دەرسیان تەواو دەبێ؟ چەندە خۆیان دەگنخێنن. کەی دەچنەوە ئێران؟ هەندێ کاروباریان بۆ داناون. ئەی ئاگادار نی، باس باسی مافی مرۆڤە و شاهەنشا دەیەوێ پیروپاتاڵەکان خانەنشین بکا؟ لە بری ئەوان دەبێ گەنجی باوەڕپێکراو و شاپەرست دامەزرێنێ."

چووینەوە سەر پەروەندەی ئاهاری و خانعەلی و دەماوەندی. کە گەیشتە ئەوی سێیەم، گوتی:

"ئاگاتان لێی بێ. چێژ و خۆشی لە دڵی داوە. خەریکە خۆی دەدزێتەوە. هەم خوای دەوێ و هەمیش خورما. لێی گەڕێن با کاری خۆی بکات. وەک چۆنە ئاوا بەکارمان دێ."

پێکەنیم و پرسیم:

"خورماکەی ئێمەین، خواکەی لە کوێیە؟"

بە پێکەنینەوە وەڵامی داوە:

"لەو جێیەی تا ئێستا گەورەکانمان لەوێ رایانبواردووە."

هیچم نەگوت. چونکە دەمزانی خۆشی یەکێکە لەوان.

بە پەروەندەی چەند کەسێکی دیکەشدا چووینەوە. ئەوانە گوێلەمستی خۆیان بوون.

سەعاتی سەفەرەکەمان وەدرەنگی خست. پەروەندەی دەماوەندیم لە ئۆفیسەکەی باڵیۆزی گەڕۆکدا خوێندەوە بۆ ئەوەی بەڵگەکانی خۆم کامڵ بکەم. بەڵێنم دا چاوێکم بکەمە چوار چاو و ئاگام لە هەموویان بێ.

شاگەشکە بووم و دڵم خۆش بوو کە ئەوەندەم سەرنج و متمانەی شاهەنشا راکێشاوە کە رێگەم دەدا قسە لە هەڵبژاردنی پیاوانی پلەبەرزی وڵاتەکەشمدا بکەم. ئیتر دڵنیا بووم لەوەی هیچ گەردێک لە روخساری من نەنیشتووە و ئاوێنەی بەختم پاک و بێگەردە. سەیرێکی پەروەندەی فەرزانیشم کرد. سەیرم کرد زیاتر لەوەی خۆم دەیزانم، لە باریاندایە. بەرەبەری نیوەڕۆ سواری فرۆکە بووم بۆ لەندەن. دەسبەجێ چوومەوە ئۆفیسەکەم، سەر مێزەکەم پڕ بوو لەو نامانەی هاوکار و دوژمن و حەسوودەکان لە بارەی بڵاوبوونەوەی وێنەکەی روقیەوە بۆیان ناردبووم. تەنیا دکتۆر بیژەن و تیمسار سەرلەشکر هیچیان نەناردبوو. ئیتر دووقرانییەکەم کەوت و زانیم ئەوە ئەو دوانەن قوڕەکەم بۆ دەگرنەوە.

دەیانەوێ مۆرکێکم لێ بدەن. ئیرەییبەران لە ناڵیان دەدا و لە بزماریش و بەرتیلیان وەردەگرت و دیار بوو دەبوایە سمێڵیان چەور بکەم. نەدەبوو رێگە بدەم دەهۆڵی ریسوایی بکوتن. پێیان وابوو دەتوانن دەست و پێم لە خەنە بگرن و سواری کەری خۆیان بن. پێویست بوو خۆم بچمەوە تاران و بزانم چ باسە.

نامەیەکی مووسا گیانیشم پێ گەیبوو. پڕ لە دڵسۆزی. باسی دایکمی دەکرد کە خەریکە تێدا دەچێ و پێداگرییەکەی لەسەر ئەوەی تا زووە بچمەوە مەوتەنی خۆم. "هیوادارم دەرگایەکی خێر بکرێتەوە." خۆ نەمدەتوانی قسەی وی بشکێنم. ویستم لە نامەیەکدا دڵی بدەمەوە و بەڵێنی بدەمێ بەم زووانە خۆم دەگەیەنمەوە لای دایکم تا دەگەمەوە، داوا لەو دەکەم کە هاوڕێ و رێنوێن و دەسگرم بووە ئاگای لە دایکم بێ و خواردن و داو و دەرمان و پزیشک و پەرستاری بۆ دابین بکا و دڵنیا بێ چاکەی پیاوەتییەکانی دەدەمەوە. نامەکەم نووسی و دەمەویست بینێرم کە رووداوێکی سەیر قەوما و نەیهێشت بینێرم.

نیوەشەو بوو. سەیری سەعاتم کرد بیست دەقە لە چوار لای دابوو، یەکێک تەلەفۆنی کرد:

"ئەگەر لەماڵێی، کەسێکی نزیکت دەیەوێ دەسبەجێ قسەت لەگەڵ بکا. سەعاتێک دواتر تەلەفۆنەکە زەنگی لێ دا."

له ژووری خەوەکەم تەلەفۆنێکی تایبەتیم هەبوو کە تەنیا ئەوانەی زۆر مەحرەم بوون ژمارەکەیان دەزانی. ئەگەر لە وەخت و بێوەختدا لە تارانەوە بانگیان کردبایەم، تەلەفۆنچییەکەی باڵیۆزخانە بەو ژمارەیە ئاگاداری دەکردمەوە ومن دەمتوانی خۆم تەلەفۆن بۆ تاران بکەمەوە. بەڵام دەنگی تەلەفۆنچیم دەناسی و ئەو پیرەپیاوێک بوو. بەریتانی نەبوو. بەتایبەتی چاوەڕێی نەکرد وەڵامی بدەمەوە و بە فارسی قسەی لەگەڵ کردم. تەلەفۆنەکەی داخستەوە و من سەرم سووڕ ما. ترسم ڕێنیشت. ئەوە کێیە ژمارەکەی من دەزانێ و لەو سەعاتەدا وریاییم دەداتێ؟ ئەمر دەکا و چاوەڕێی ڕەزامەندیی من ناکا. تاوێکی پێ چوو سەرسووڕمانەکە بەری دام و خەیاڵ هەڵیگرتم و هەزار ڕووداوم بەزەیندا هات.

له پێشدا گوتم لەوانەیە ئیرەییبەر و دوژمنان تەلەفۆنیان بۆ کردبێم. دوایی گوتم جا ئەوان ئەم ژمارەیە چۆن دەزانن. ئینجا بە زەینمدا هات، کە سیخوڕێکی بێگانە دزەی کردووەتە نێو دەزگاکەمان و خەریکە گێرەشێوێنی دەکا. ترس دایگرتم. تۆ بڵێی هەڕەشەیەکم لەسەر بێ؟ لە تاران شتێک ڕووی داوە؟ یەکێک لە هاوڕێ و خێرخواکان ویستوویەتی و دەیەوێ بمگێڕێتەوە؟ تەلەفۆنم بۆ تەلەفۆنچیەکەی باڵیۆزخانە کرد.

"ئەرێ ئێوە ژمارەی منتان بەکەس داوە؟ ئێوە تەلەفۆنتان بۆ من کرد؟ تۆ بڵێی ئەم ژمارەیە کەوتبێتە دەست نامەحرەمێک؟"

وەڵامی هەموو پرسیارەکانم، نەخێر بوو. خەوەکەم زڕا. هەستام. پەنجەرەکەم کردەوە. هەواکەی سارد بوو. دامخستەوە. بە ژوورەکەدا هاتم و چووم. لەم ژوورەوە بۆ ئەو ژوور. لە سەر تەختەکەم ڕاکشام. نیو سەعاتێکی پێ نەچوو کە تەلەفۆنەکە دیسان لێی دا. هەڵمگرت. دەنگەکەی پێشوو نەبوو. کەسێکی دیکە قسەی لەگەڵ دەکردم. بەڵام دەنگەکە ئەوەندە لاواز بوو کە من نەمدەبیست. نەڕاندم. چەند جارێک هاوارم کرد.

"دەنگت نابیسرێ. دەنگ هەڵێنە. گوێم لێ نییە. دایخەوە، ژمارەی تەلەفۆن و کۆدی شارەکەتانم پێ بڵێ خۆم تەلەفۆنت بۆ دەکەمەوە..."

هەوڵەکانم هیچیان لێ شین نەبۆوە. تەلەفۆنەکەم توند داخستەوە و دیسان لە ژوورەکاندا کەوتمەوە پیاسەکردن. ئیتر خەوم لێ نەکەوتەوە. دەمەویست زووتر بچمەوە ئۆفیسەکەم و لەوێ بە شوێن سیخوڕ و تێکدەرەکەدا بگەڕێم و لە هەموو ئەو کەسانەی ئەم ژمارەیەم پێ دابوون بپرسم ئاخۆ کارێکیان بە من بووە. وەبیرم هاتەوە کە تمیسار سەرلەشکر ئەم ژمارەیەی هەبووە. سەعات خەریکبوو دەبووە شەش. ردێنم تاشی و دەمەویست لە ماڵێ وەدەر بکەوم کە دیسان تەلەفۆنەکە زەنگی لێ دا. هەر دەنگەکەی یەکەم جار بوو، گوتی:

"یەکێک لە خزمەکانت بوو. دەیەویست پێت بڵێ تا درەنگ نەبووە لە کەری شەیتان دابەزن و بەرەی خۆتان لە ئاوێ دەرکێشن."

تەلەفۆنەکەم داخستەوە و ئیتر لە بێدەنگییەکی قورس بەولاوە هیچ نەدەبیسرا. تۆ بڵێی بیانەوێ قەشمەریم پێ بکەن؟ ئەمجارە دەنگەکەم هەڵگرتبۆوە. شریتەکەم لێ دایەوە و ورد ورد هەموو وشەکانم لە زەینمدا ڕاگرت. "یەکێک لە خزمەکانت..." دەیەویست بڵێ "لە کەری شەیتان..." چ قەوم اوە؟ چیم کردووە کە نەدەبوو بیکەم؟ خزمەکان! روقیە، دایکم، مووسا گیان؟ ئیتر من کەسم نییە. لەوانەیە دایکم بووبێ. ئەو ژمارە تەلەفۆنەی لەکوێوە دەست کەوتووە؟ روقیە بووە؟ دەیەویست تێم بگەیەنێ کە نەگیراوە؟ لە کوێ؟ لە تاران؟ لە شارێکی دیکە؟ لە فەلستین؟ لە لای تیمسار سەرلەشکر یان دکتۆر بیژەن؟

بەوپەڕی ترس و دڵەڕاوکێ و دڕدۆنگییەوە چوومەوە نووسینگەکەم. سەیری روخسار و قەڵافەتی هەموو ئاشنا و ناسیارەکانم دەکرد. ئاخۆ ئەوان ئاگادارن؟ هیچیان بیستووە؟ هەڕەشەیەکم لەسەرە؟ تەلەفۆنم بۆ شێخۆ کرد. جگە لەوەی کۆمەڵێک تەوس و پلارم پێدا بدا هیچی دیکەی نەبوو پێمی بڵێ. وازم لێ هێنا. بە بیانوویەک چوومە لای باڵیۆز. هەڵسوکەوتی ئاسایی بوو. ئەمری کرد چایان بۆ هێنام. نیوسەعاتێک قسەمان کرد. باسی بارودۆخەکە و ڕۆیشتنی

نیکسۆن و زۆر قسەی پووچ. ئەو خۆخەریککردنانە لەو چەند سەعاتەدا هیچ دڵەڕاوکێکەیان نەدەڕەواندمەوە. هەر کەس لە دەرگای ئۆفیسەکەمی دەدا، بەندی جەرگ و دڵم دەپسا. پاش نیوەڕۆ چوومەوە ماڵەکەم. نیوسەعاتێک نوستم و لەخەو هەستام و بڕیارم دا بچمەوە تاران تا بنج و بناوانی شتەکە بێنمە دەرێ.

لە ماوەی دوو سێ ڕۆژاندا کەرەستەی سەفەرم ئامادە کرد. بۆ سبەینێ هەر سێکیانم بانگ کردە نووسینگەکەم. خانعەلی و ئاهاری پێکەوە و دەماوەندی بەتەنێ. ئاهاری کە زەبرێکی منی بەرکەوتبوو، وەک سەگ لێم دەترسا. تەنانەت لە ساڵەکانی دواتریشدا کە بووە بەرپرس، هەر وا لەگەڵم وەک گوێی کەرێ جووت بوو و خۆی لەبەرم دەمراند و کلکەسووتەی بۆ دەکردم.

کۆبوونەوە لەگەڵ خانعەلی و ئاهاری زۆر ئەستەم نەبوو. بە شاتەشات دەستم پێ کرد، کە ئەرێ بۆچی ئەوەندە لێرە کیرەخۆڵەی دەکەن؟ ئەگەر هەر ئاوا بەرەڵا و حەرەڵا بخولێنەوە، هەموو شتێک ئاشکرا دەبێ. بۆ ئێوە نازانن هەموو ئەو چەپییانە، کۆنفدراسیۆنییەکان، دوژمنتانن؟ ئێوە نابێ بیانوویان بدەنە دەست بۆ ئەوەی حەیاتان بەرن.
پاساوهێنانەوەیان کە ئێمە خەریکین نامەی دکتۆراکەمان دەنووسین و ئەو کارە هەمیشە چوار تا پێنج ساڵ دەخایەنێ و خۆ ئێمە دوو ساڵێک پتر نییە گەیشتووینە ئەم قۆناغە و هەوڵ دەدەین نامیلکەکانمان تا ساڵێکی دیکە بدەینە مامۆستاو، بەو قسانە دڵم دانەکەوت و قایل نەبووم. دواتر نەرمتر بوومەوە و هانم دان هەرچی زووترە سەروبەری مەسەلەکە وێک بێننەوە و گوتیشم:

"ئێرانی ئازیزمان بە پڕتاو بەرەو پێشکەوتن هەنگاو دەنێ. فەرموودەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆتان خۆ بیستووە، کە ئێمە لە ماوەی چەند ساڵێکدا دەبێ بکەوینە پێش هەر پێنج وڵاتە زەبەلاحەکەوە. کێ دەبێ ئەم کارە بکا؟ دەبێ بە دەستی کەسانی وەک ئێوە بکرێ. ئەی پیاو لە کوێ بێنین؟ بۆ نابینن شاهەنشا چەندە هیوای بە ئێوە دەرسخوێندووەکانە؟ جەنابی ئاغای ئازمایش ببینن. چەند ساڵ لەوەپێش ئەویش وەک ئێوە قوتابی بوو، ئێستا یەکێکە لە ڕاوێژکارەکانی شاهەنشا، پارێزگارێکی گەورەی وڵات هەڵدەسووڕێنێ و هەموو خەڵکی ئێران قەرزباری لێوەشاوەیی و فرەزانایی ئەون. ئەوە چۆنە دەماوەندی لە ئێوە باشترە و پێشتان دەکەوێ؟ ڕاستە ئێوە لە کاروباری سیاسیدا لەو چالاکترن، بەڵام ئەوەندە بەس نییە. دەبێ تا زووە دەرسەکانتان تەواو بکەن و لە کەسانی وەک دەماوەندی جێ نەمێنن.
هەردووکیان بە زمانێک گوتیان:

"قوربان ئەو هەر دەرسی نەخوێندووە. نامەکەشی ئەوە یەکێکی دیکە بۆی دەنووسێ."

"دەی ئێوەش ئەگەر دەزانن زمانەکەتان ئەوەندە ڕەوان نییە یارمەتی لەو کەسانە وەرگرن کە لە پاریس دەژین و ئامادەن یارمەتیتان بدەن."

مەبەستم ئەوە بوو، فەرزانیان بێنمە پێش چاو. دەرفەتم نەدانێ چەلەحانێ و قسەوباسەکە بەردەوام بێ. هەستام. ئەوانیش بڵێی و نەڵێی بەدووی مندا هەستان.

"من ئێستا کاتم نییە. ئەمشەو سەعات پێنج و نیو وەرنە ماڵەکەی من، با پیاڵە چایەک پێکەوە بخۆینەوە. جوان و زەریف بیری لێ بکەنەوە و بەڵێنم بدەنێ کەی بە دکتۆراکەتانەوە دەگەڕێنەوە ئێران."

مەبەستم ئەوە بوو بچنە لای فەرزان و داوای لێ بکەن ئەو نامەکەیان بۆ بنووسێ و ئەگەر بە نازناوێکی ساختەش بووە بیاننێرمەوە ئێران.

پاش نیوەڕۆ کە هاتنە ماڵەکەی من، ڕاشکاوانەتر قسەم لەگەڵ کردن.

بە زمانی بێزمانی تێم گەیاندن کە لە دۆست و ئاشناکانی خۆیان بپرسن بزانن کێ لەم شارەدا ئەم کارانە دەکا و لەو بوارەوە دەتوانێ یارمەتیدەریان بێ. بێ و نەبێ لێم تێگەیشتن. ئەگەر خەرجێکیشی هەبێ، دیارە وەزارەتی زانست ڕێگەی

پێدراوە دەست بە باڵیانەوە بگرێ. ئاهاری و هاوپێڕەکەی بەڵێنیان دا تا چەند مانگێکی دیکە بە نامەکەیانەوە یەکێکیان لە یاسا و ئەویدیکەدا لە یاسای سیاسیدا بێنەوە لای من.

چەنەلێدان لەگەڵ دەماوەندی ئەوەندە سووک و سانا نەبوو. هەر لە پێشدا کە بە تەوس و توانجەوە لێی وەژوور کەوتم، سوور هەڵگەڕا و تانەی لێ دام و گوتی من پیاوی زانست نیم و POLITOLOGIE و SEIENCE هەر نازانی چییە و زۆر سەخت و دژوارن بۆ ئەو بیانییانەی دەیانەوێ لەم وڵاتەدا نامەی دکتۆری بنووسن. چەنەلێدان لەگەڵ ئەو هەتیوە قەشمەرە خاڵێکی بەزەیندا هێنام کە تا ئەودەمیش بەسەریدا کەوتبووم بەڵام بە کردەوە خۆم لێ نەدابوو. وەبیر هەڵسوکەوتی دکتۆر بیژەن و دکتۆر جیهانگیر و ئەوانی دیکە کەوتمەوە کە چۆن لەگەڵ شێخۆ دەجووڵانەوە. هەر لەگەڵ تووشی سیخوڕی ئاژانسەکانی دیکە دەبوون، تۆزێک بە پارێزەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد و وایان دەنواند کە بەڵێ گوێدرێژەکەیان هەر زگماک کلکی نەبووە. بەڵام ئەو قەشمەرە تازە کەوتبووە نێو بازنەکەوە و پێم قبووڵ نەکرا کە بەخۆی و بستێک باڵایەوە من پاشقول بدا. لێی راستەوە بووم و لەدەمیم دا و قسەکەیم پێ بڕی و گوتم:

"جەنابی دەماوەندی، بچۆ ئەو قسانە بۆ بابت بکە. ئێمەش ئەو شێوازانە دەزانین و کردوومانە. لێرە هەق و مز لە ئێمە وەردەگری و دەبێ کاریش هەر بۆ ئێمە بکەی. پۆلیۆلۆژی و سا ئینس بەکاری من نایە. پێت وایە نازانم کێ خەریکە نامەکەت بۆ دەنووسێ؟"

وام خستە مەنگەنەوە، کە ناچار بوو کلکی لە گەڵۆزی بنێ و بڕوا. دەرم کردە دەرێ و گوتم:

"من چەند رۆژێکی دیکە دەچمەوە تاران. کە هاتمەوە دەبێ پێم بڵێی کەی کارەکەت تەواو دەبێ. کڵاو لەسەر من و هاورێکانت مەنێ. پێکەوە بن. واتان باشترە. شاهەنشا فەرموویانە، گەنجە دەرسخوێندووەکان تا زووە بگەڕێنەوە وڵات و جڵەوی کاروبارەکان بەدەستەوە بگرن."

جۆرێک لە لمبۆزی درا، خۆیشی بڕوای نەدەکرد. وەک سەگی ترۆ کراو سەری بەرداوە و رۆیشت.

کەلوپەلی سەفەرم ئامادە کرد. کاروباری قوتابییەکانم بە سکرتێرێکی باڵیۆزخانە ئەسپارد. بە تەلەفۆن باڵیۆزم ئاگادار کردەوە کە دەچمەوە تاران. هەر پێی سەیر بوو. پرسیی:

"شتێکی تازە قەوماوە؟"

"هیچ شتێک نەبووە. دەمەوێ بچمەوە کارو پیشە بۆ دەرچووەکان دابین بکەم بۆ ئەوەی لە ئێران سەریان لێ نەشێوێ و زووتر دەستیان لە کارێک گیر بێ."

بە پەلەپەل بلیتی فرۆکەم کڕی. هەندێ خرتوپرتم بۆ دۆست و ناسیاران کڕی. جێ میوەیەکی کریستاڵیم بۆ سەرۆکی ئاژانس کڕی بایی 750 پاوند و دوو سێ قوتووە جگەرەی ئاڵتوون و ئاوەزێڕکراو و چەند کاتژمێر و ئەموستیلە و شتی دیکەم بۆ کارمەندەکانی خوارەوە کڕی. جانتاکەم پڕ بوو لە دیاری.

لە کۆتایی رێبەندانی ساڵی 1353ـدا گەیشتمەوە تاران و راستەورێ چوومەوە ماڵی دایکم، هەر لەو خانووە بچکۆلانەیەدا دەژیا کە من تێیدا لەدایک ببووم. شوێنەواری هەژاری و داماوی و کاولبوون بە دار و دیوارییەوە دیار بوو. بێبایەخی و کاولبوونەکە، منی راچڵەکاند کە خووم بە خۆشڕابواردن و شکۆوە گرتبوو. چەند جاران لە دەرگام دا، تا دایکم توانیی خۆی بگەیەنێتە پلیکانەکان و دەرگام لێ بکاتەوە. گرمۆڵە ببوو. چنگێک پێست و ئێسقانی لێ مابۆوە. وا لەڕ و لاواز ببوو کە من نەمدەوێرا بە سینگمییەوە بگوشم. زمانی لە گۆ چوو. لاڵ ببوو. هەر قسەی بۆ نەدەهات. دەتگوت چاوی نابینێ. دەنگمی ناسییەوە. قامکە بێهەستەکانی بە روومەتمدا هێنا. دەستی بەسەرمدا هێنا. هەڵمگرت. باسکی لە ملم کرد. خەریک بوو پشووی راوەستێ. بردمەوە ژوورێ و لەسەر تەختی خەوەکەی رامکێشا و لە تەنیشتی دانیشتم و بە هەر دوو دەستم قامکە درێژ و رەقەڵەکانیم گرت و ماچم کردن و پرسیم:

"دایە گیان چۆنی؟"

"ڕۆڵە، خۆ نەهاتبایەوە دیدارەوئاخر دەبووی."

چەند دەقەیەک لە تەنیشتی دانیشتم. پێخەفەکەم پێدا دا. دەستە وشکە قالۆرەکانیم گرت:

"دایە گیان چیتە؟"

بە هانکەهانک و نیوەنووزە وە**ڵامی دامەوە:**

هیچم نییە. زۆر باشم. هەر خەم دەخۆم و زووخاو دەرێژم نەکا تۆ و ڕوقیە ببینمەوە."

ئینجا سەری لەسەر بالیفەکە هەڵگرت. دەیەویست لە گوێم نزیک بێتەوە. گوێم بردە بەر دەمی و دەتگوت دەیەوێ بە سرتە سوڕ و نهێنییەکی وام پێ بڵێ کەس نابێ بیزانێ.

"وێنەکەیت دی؟"

سەرم بۆ لەقاند.

خۆیەتی. من چاوم باش نابینێ. خۆیەتی؟"

لە بن دۆشەگەکەوە وێنەکەی هێنا دەرێ. سەیرێکی دەوروپشتی کرد و دوو وێنەکەی ڕوقیەی، یەکێکیان هیی دەسگیرانداری و ئەوی دیکە ژنەلەچک بەسەرەکەی پێشانم دا. نەمپرسی لە کوێی هێناون.

چاوی لێک نان. لێوی لەرینەوە:

"گوتوویەتی بەکەس نەڵێم. دەسگیرانەکەی هێناوێتی. دەڵێ لەچک بەسەرەکە ڕوقیە نییە."

دەستم بەسەر دایکمدا هێنا. ڕوومەتیم ماچ کرد. وەک بیەوێ بنوێ. تاوێک هەردووکمان بێدەنگ بووین. جاروبار چاوم لە چاوی دەبڕی. جارجار لە پەنجەرەکەوە سەیری حەوشەکەم دەکرد، کە زۆر بچووکتر دەهاتە پێش چاوم.

دایکە دەستی کرد بە ورتەورت. دەیەویست گۆرانی بڵێ، هەر ئەو گۆرانییەی من و ڕوقیە لە تەمەنی چوارپێنج ساڵاندا دەمانگوتەوە. تازە باوکمان مردبوو. دایکە گیان دەیگوت و ئێمە سەمامان دەکرد.

دڵ حەزی لە دەشت و شینایی نییە... مەیلی گوڵ و گەشت و سەیرانی نییە

باقییەکەی نەدەزانی. لەخۆیەوە دەیهۆنییەوە.

ڕۆژگار بە دڵی ئێمە ناگەڕێ.. چونکە باوکمان نییە، هیچمان نییە

ئەوی دیکەی کەس نە ئەزانی دەڵێ چی. گوێم لە لێوییەوە نووساند، گوێم لە ئاخهەڵکێشانی بوو. دەنگێکی دیکە نەدەهات.

هەزاران خەیاڵ لە تاریکایی بیرەوەرییەکانمەوە هاتنە دەرێ و گەشەیان کرد و ڕابوون و پچڕان و ڕایان کرد. لە چاوترووکانێکدا هەموو ژیانم هاتەوە پێش چاو.

لە دنیای خەیاڵی خۆمدا بە شوێن ژوورێکدا گەڕام کە لەوێدا دارتاشیم دەکرد. لە پشت شووشەکەوە دار شمشادەکە دیار بوو و لەوبەری هەسێڵەکەوە دارێکی قۆخی لێ بوو کە لەگەڵ ئاواڵەکانم قۆخەکانیمان هەر بە کاڵی لێ دەکردەوە و دەمانخوارد و تفمان دەکردەوە دەرێ. ژوورەکەی من دیار نەبوو. دیوارێکی بەرز هێندەی دوو مەتر شاردبوویەوە.

بیستبووم کە دایکم بۆ بژیوی خۆی بە کرێی دابوو و دواییش فرۆشتبووی. هەستم کرد ئاژانس کرێیوێتی بۆ ئەوەی بزانێ کێ هاموشۆی ئەو ماڵە دەکا. هێشتا مافوورە تیسکنەکەی سەردەمی منداڵیم هەر لە ژوورەکەدا ڕاخرابوو. کورسییەک بەرانبەر دەرگاکە دانرابوو. مێزێک ڕووبەڕووی دەرگاکە دانرابوو، ئەو قوماشە تورمەیەی پێدادرابوو کە من لە لەنگە هێنابووم و، مۆمدانێکی دوو لک و ئاوێنەیەک، تاقە ئاسەواری ئەو سەردەمانەی هێشتا خەم باڵی بەسەر ئەم ماڵەدا نەکێشابوو و دایکە دڵسۆزەکەم بە قەرزوقۆڵە باربووی کچە دەسگیراندارەکەی وەسەریەک نابوو. لە بەر مۆمدانەکەوە قورئانێک دانرابوو، دیاریی ڕوقیە بۆ دایکی.

ئەو هێمنی و خۆشییە چەند ساتێک بوو. بەڵام بۆ من عومرێک بوو.. وردە وردە دایکم هاتەوە سەرخۆی. گوتی:

"با هەستم چایەکت بۆ دەم بکەم. بچم خواردنێکت بۆ نیوەڕۆیە بۆ دروست بکەم."

پرسیم: "دایە کێ یارمەتیت دەدا؟"

"مووسای داماو. چەند حەفتە ئیجازەی وەرگرتووە و هەموو ڕۆژێ دێ سەرم لێ دەدا هەر شتێکم بوێ بۆمی دەکڕێ و بۆم دێنێ. لە بابەت دکتۆر و داودەرمانیشەوە درێخیی نەکردووە. ژنەکەشی چەند جارێکی پێی بکرێ دێ سەرم دەدا. ئەو دووانە منیان زۆر خۆش دەوێ، خوا خێریان بنووسێ. دەی ڕۆڵە تۆ باسی خۆتم بۆ بکە. تۆ باشی؟ تێر و پڕی؟"

دیسان دەنگی کز کردەوە بۆ ئەوەی کەس گوێی لێ نەبێ.

"هیچ ئاگات لە خوشکەکەت هەیە؟ دەڵێن بووەتە چریک؟"

نەمدەزانی چیی جواب بدەمەوە. گوتم: "ئیشەڵا سڵامەت و بێ وەی دەبێ."

"خوایە شوکرانەبژێرم."

پرسیم: "دایە گیان، چتە؟"

"هیچ هیچ. لەوەتەی خەبەری هاتەنەوەتیان داومەتێ، ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەبم. دوێ شەوێ لە خەونمدا بوو پیاوێکی مێزەر کەسک دەستی گرتووی و دەیخاتە نێو دەستی من. کە لەبەر دەرگا وام لێ هات، لە تاوان بوو. ئێستا باشم. ئێستا هەموو شتێکت بۆ دروست دەکەم. ئەگەر حەز بکەی، شەوێ لێرە بخەوی، پێم خۆشە. ژوورەکانی ئەوبەرەوەم فرۆشت. حەوجێم پێی بوو. ئێستا باشم."

دایکم وەقسە هاتبۆوە. هەستا، چارشێوێکی مۆری بەخۆیدا دا و دەستی کرد بە هەڵوەژاردنی ماڵێ. چێشتخانە و ژێرزەمین هەر ئەو ژوورە بوو. لەگەڵی چووم و لەبەر بەلووعەکە دەموچاومم شوشت. بەداخ بووم کە جانتاکەمم لەگەڵ خۆم نەهێنابوو، ئەگینا ئەمشەو لێرە لەلای دەمامەوە. دەبێ دایکم بەرمە لای خۆم.

هەستم کرد، هاتنەوەی من، گیانێکی وەبەر ئەو ژنە هێنابۆوە کە دوا ڕۆژەکانی تەمەنی خۆی لەم ماڵەدا بەسەر دەبرد و، ئەگەر بۆ ماوەیەکی زۆر کورتیش بێ، بەختەوەری دەکا. دەبێ شتێکی وا بکەم ماوەیەک هەردووکمان پێکەوە بین. هەردووکمان خۆمان لە باسی ڕوقیە دەدزییەوە.

دایکم گۆشتاو و کفتەیەکی خۆشی بۆ لێ نابووم. مووسا گیان نانی تازەی هێنابوو. کە منی دیت سەری سووڕ ما. لە هیچ کوێ و تەنانەت لە زاوا زێڕینەشی ــ کە جارجار بەم لایانەدا ڕادەبرد ــ نەبیستبوو من دێمەوە. هەر هەلم بۆ ڕەخسا کە پێکەوە بین، وەبەر پرسیارانم دا. لە حاڵ و ئەحواڵ و کاروباریم پرسی، لەوەی کە چ چاوەڕوانییەکی لە من هەیە، لە دایکم و ئەو خەرج و مخاریجەی بۆ تەندروستیی دایکم وەئەستۆی خۆی گرتووە و، دواییش لێم پرسی بزانم چ خەبەرێکی لە ڕوقیە هەیە؟ ئاگای لە مەحموودی بێزەواد نەبوو. ئەو ئاگادارییانەی بە دار و دیوارییانەوە دابوو، ئەویش دیتوویەتی. ئاگادارە کە خزمی یەکێک لە هاوکارەکانی ئەویان لە قۆمشە گرتووە و دواییش هەڵیانکوتاوەتە سەر ماڵەکەی و هەرچی هەیبووە و نەیبووە بەسەر یەکیاندا داوە و هەندێ کتێب و کاغەزیان لەگەڵ خۆیان بردووە. هاوکارەکەی ئەویان سێ ڕۆژ ڕفاندووەو دوایی بەریان داوە. یەکێک لە خزمەکانی ئەو برادەرە هێشتا لە بەندی خانەیە و هیچ کەس بەسۆراغی نازانێ. جارجار کاکی زاوای دیتووە و چووەتە ئەو ماڵە یەک ژوورەی دایکم فرۆشتوویەتی. لەوە زیاتر هیچی لێ نەدەزانی.

پێم گوت:

"من لە چەند ڕۆژێک پتر ناتوانم لە تاران بمێنمەوە. تۆ دەتەوێ هەر لەم تارانە کارێکی باشترت دەست بکەوێ. ڕێگەیەکم دۆزیوەتەوە لێرە ڕاتگرم. تکایەکی زۆر گرنگم لێت هەیە، ئەویش ئەوەیە، دایکم قایل بکەی بێتە ماڵەکەی من. بۆ من باش نییە هاموشۆی ئێرە بکەم. ئێرە یان بە کرێ دەدەین، یان دەیفرۆشین."

دەستم لە گیرفانم نا پارەی بدەمێ. قبووڵی نەکرد. نەیدەویست وەریگرێ. پێم گوت:

"له خۆوه دەستم مەگێڕەوە. خێرت پێ ناکەم. بە قەرز دەتدەمێ. هەر وەختێ کارێکی باشترت لە بانکی ناوەندی دەست کەوت، دەمدەیتەوە. دەزانم پارەیەکیشت بۆ داودەرمانی دایکم خەرج کردووە. ئەوی دیکەی قەرز بێ لەسەرت و هەر کات هەتبوو بمدەوە."

دوو هەزار تمەنم دایێ. ئیتر قسەی نەکرد. لە گیرفانی نا و ماچی کردم. وای تێگەیشتم، کە پێی وانەبوو ئەوەندەی پارە بدەمێ.

ئەو رۆژە تا ئێوارێ لەگەڵ مووساگیان بووم. سەیرم کرد هیچ زانیارییەکی لە سەر دنیای دەرەوە نییە. جگە لەوەی لە ئەردەبیل و قوم و لاهیجان دیتوویەتی، سەرەدەر لە هیچ شتێکی تر دەرناکا.

دەمەویست لە بن زمانی دەرکێشم بزانم کێ بوو ئەو تەلەفۆنەی بۆ من کردووە. کێ ژمارەی منی داوەتە نامەحرەمان؟ زۆر زوو گومانەکەم رەوییەوە کە ناکرێ دایکم و مووسا گیان بن. کەوابوو دەمێنێتەوە روقیە و هاوکار و پشتیوانەکانی. ئەو تاقمە بەو شتانەی لەبەر دەستیانە کاری وایان لەدەست دێ. جا تۆ بڵێی وابێ؟ لەوانەشە هەر برادەرانی ئاژانس بن. دەکرێ هەر ئەوان فیتنەیان نابێتەوە. بۆ ئەوان ئەستەم نەبوو. چووزانی رووسەکان دزەیان نەکردۆتە نێو ئاژانسیشەوە و ژمارەکەیان نەدابێتە یەکێک لە دوژمنە قەستەسەرەکانی من؟ کەسانێک هەن دەزانن کە کارەکەی من چ قازانجێکی زۆری بۆ ئەوان هەیە. هەر ئەوانن دەیانەوێ پاشقولم بدەن. هەزار خەیاڵی بێسەروبەری دیکە بەربینگیان دەگرتم. رێی دەربازبوونم نەبوو. لە هیچ لایەکەوە ئامانجم نەدەپێکا. دیسان قەڵافەتی نالەباری تیمسار و داورودەستەکەی دەهاتنەوە پێش چاوم. لەبەریان دانانوێنم. مادام عەلی سارەوانە، دەشزانێ وشترەکەی لەکوێ ئیخ بدا.

ماڵاواییم لە مووسا گیان کرد و قەول و قەرامان وا دانا زۆر زوو لە ماڵەکەی من چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە. پێنجی دوانیوەڕۆ ماڵاواییم لە دایکم کرد و تەلەفۆنم کرد بۆ سەرۆکی ئاژانس و پێم راگەیاند هەر ئەمڕۆ لە لەندەنەوە گەیشتوومەتەوە و حەز دەکەم بەر لە هەر کارێکی تایبەتی، بچمە خزمەتیان.

"ئەگەر ئیجازەم بدەی، ئەمڕۆ یان ئەمشەو یان هەر کاتێکی جەنابت بفەرمووی لە "تەلاری حوکمەت" دەمەوێ بێمە خزمەتت."

دەیزانی. دەسبەجێ تێگەیشت بە دەستی بەتاڵ نەهاتوومەوە. بۆ نانی ئێوارێ بانگی کردم و دڵنیا بوومەوە کە هیچ پیلانێک لە گۆڕێ نییە.

چەپکێ گوڵم کڕی و بە تەکسی چوومە ماڵەکەی.

لە سەر نان، هەر من و ئەو بووین. چیم لە دڵدا بوو بۆم هەڵڕشت. پیاوێکی بێ فرتوفێڵ بوو. بەناوبانگ بوو. لەوەتەی هاتبووە سەر کار، ئیتر لە زیندانی ئێڤین و باقی زیندانەکانی ساواکدا، قەسابی نەمابوو.

من بێ پێچوپەنا پرێسکەی دڵم بۆ کردەوە. هەموو کێشە و گرفتارییەکانی خۆمم بۆ باس کرد، هەر لە بڵاوبوونەوەی وێنەکەی روقیەوە و دوو تەلەفۆنە نەناسراوەکە و هەوڵدان و کێشەم لەگەڵ پیاوەکانی بەردەستم و یەک لەوان دەماوەندی. ئەویش گوێی راگرتبوو و جار نە جارێکیش خولکی دەکردم بۆ نانخواردنەکە و خواردنەوەی ساردی و زەردەیەکی دەهاتێ. من چیم لەدڵدا بوو هەڵمرشت و ئەویش هەستی کرد راپۆرتی نادەمێ بەڵکو داوای رێگەچارەی لێ دەکەم. پاش نانخواردن، چەپکە گوڵەکەم خستە نێو جێ میوە کریستاڵییەکە و لەسەر مێزەکەم دانا. تاوێک هەر بە پێوە سەیری کرد و گوتی:

"پیاوێکی بە سەلیقەی."

ئینجا لەسەر مۆبلەکە دانیشت و منیش کەوتمە رووبەرووی.

"کاکە گیان، تۆ کاری خۆت بکە و کارت بەو مارمێلکانەوە نەبێ. ئاژانس هیچ زانیارییەکی لەسەر خوشکەکەی تۆ نییە. کەس نازانێ ئەو وێنەیەی دیکە ئەوە یان نا. یەکەمیان هیی کاتی دەسگیرانداریەکەیەتی. من دیارە ئاگام لە

وردەکاریی پەروەندەکەی نییە و نازانم بە چ هۆیەک ناوی لە لیستی چریکەکاندا هاتووە. ئەگەر هەڵەم نەکردبێ، باسی بازنەیەک دەکرا کە لە ماڵی مارکسیست ئیسلامییەک دۆزراوەتەوە و یەکێک گوتوویەتی ئەوە بازنەی خوشکەکەی تۆ بووە. جا پێش ئەوەی داواکانت جێبەجێ بکەم و قەراری چاوپێکەوتنەکەمان دابنێم، پەروەندەکەتم خوێندبۆوە. تۆ ئێستا ئەوە شانزە ساڵێکە لە ئاژانسدا کار دەکەی و هەمووشیان ئاگایان لە وەزعی خۆت و خوشکەکەت بووە. هیچ خەوشێک لە کارەکەت نەکەوتووە. بگرە هەمیشە دەسپێشخەر بووی و هەوڵت داوە و لە پلەیەکی خوارەوە گەیشتوویەتە ئەو ئاستە. بە راستی نازانم کێ لە خۆوە دەست لەو کارانە وەردەدات. هەبێ و نەبێ لە بن سەری ئەو سەلەشکرە هیچوپووچەدایە کە ئەقڵی بەهیچ ناشکێ و دەیەوێ جڵەوی هەموو کارەکانی ئاژانس بگرێتە دەست خۆی. ئەو هێشتا نەیدووریوە، دڕاندوویەتی."

پرسیم: "فەرمووت بازنەیەک لە بنکەی شاراوەی مارکسیستەکاندا دۆزراوەتەوە؟"

"دەڵێن هیی خوشکەکەی تۆ بووە. گوێی مەدەیە. ئەوە شتێکی تازە نییە. لە دەوروبەری کارمەندەکان کەسانێک هەن گێرەشێوێنی دەکەن. دەتوانم چەند دانەیەکیانت پێشان بدەم. لە بارەی بازنەکەوە سەردانی ئەو لقی پێوەندیدار بکە. بزانە بازنەکەت دیتووە پێشتر یان نا؟ دەیناسیتەوە؟ بزانە هیی خوشکەکەی تۆیە؟"

" لە هۆڵە گەورەکەدا خەریک بوو ماڵاواییم لە هاوسەرەکەی دەکرد، کە جارێکی دیکە بانگی کردمەوە و گوتی:

"راوەستە. فەرموو تاوێک دانیشە. یادداشتێکم هەبوو بەکاری تۆ دێ. مادام هەر هاتوویەوە چەند رۆژێک سەفەرەکەت وەدرەنگی بخە و لە کۆبوونەوەیەکدا کە لە وەزارەتی ناوخۆ و بە ئەمری شایانە پێک دێ، بۆ چاوخشاندنەوەیەک بە شێوەی بەڕێوەبردنی وڵاتدا، بەشدار بە. دەرفەتت هەیە چەند رۆژێک درەنگتر بگەڕێیتەوە شوێنی کارەکەت؟"

عەرزم کرد: "هەرچی تۆ بفەرمووی دەیکەم. ئەرکی من لە باڵیۆزخانە، هەر لەسەر رەوتی ئاسایی خۆیەتی و هەموو رۆژێ لە شتەکانم ئاگادار دەکەنەوە. ئەگەر شتێک پێویست بوو، دەچم و دێمەوە."

"زۆر باشە." ئەوەی گوت و سەرێکی لەقاند و من هەستام.

بۆ بەیانی، بەبێ ئاگادارکردنەوە چوومەوە بەشەکەی خۆم. دکتۆر جیهانگیر هەر دیتمی سەری سووڕ ما. بەو خەیاڵەی نان و رسقی منی سواری بای شەماڵ کردووە. هەر کە دیتی قیت و قنج هاتوومەوە و ئەمر دەکەم پەروەندەی چریکەکانم بۆ بێنن، گنجی نێوچاوانی رەوینەوە. تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و نەمزانی ئاخۆ ئیجازەی لە بەرپرسەکەی وەرگرت یان ئەمری کرد پەروەندەکان بێنن. کەس پەروەندەکانی نەهێنا و ساواکێکی تازەکار و نەناس هات و رێزی گرتم و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ لقی لێکۆڵینەوە و لەوێ وێنەی پێنج ژن بە دیوارەوە هەڵواسرابوون. هەر ئەوانەی لە شارەکاندا بڵاو ببوونەوە و من لە پاریس بە دەستی شێخۆوە دیتبوومن. لە پەروەندەکەدا وێنەی دەسگیرانداریی روقیەم بەرچاو کەوت و ئەو وێنەیەی دیکە کە پاش دە دوازدە ساڵان دەکرا هیی خوشکەکەم بێ، بەڵام بەو لەچکە رەشەوە کە هەموو دەموچاوی داپۆشیبوو و تەنیا دەموچاوێکی خڕی نیشان دەدام، نەمناسیەوە و نەمزانی ئاخۆ خوشکەکەمە یان نا. چاویلکە رەشەکەش لە چاویدا دەردی سەرباری دەردان بوو. دیارە دەکرا روقیە بێ، بەڵام نەک بەو دڵنیاییەشەوە، کە من، براکەی لە ئەسڵ و نائەسڵەکەی دڕدۆنگ بم.

فەرمانم دا هەرچی لە بنکەی ژنان و کچانی چریکدا دەستیان بەسەردا گرتووە، پێشانمی بدەن. تاوتوێم کردن. هەندێ کتێب بوو و چەند فیشەک و خرتوپرتی دیکە، کە دەکرا لە رێگەیانەوە شوێنی پێی خاوەنیان هەڵگری.

بازنەکە لە نایلۆنێکدا بوو، کە خۆم لە بەندەری لەنگەوە هێنابووم. وەرووی خۆمم نەهێنا. پرسیم:

"ئەم بازنەیە هیی کامەیانە؟"

وەڵامیان داوە:

"لەو پێنج کەسە تا ئێستا تەنیا یەکێکیان کە لەو خانووەدا دەژیا، گیراوە، ئەوانی دیکە رایان کردووە. ئەو ژنە دەڵێ ئاگای لە هیچ شتێ نییە. ئەو ژوورە، خوالێخۆشبووی دایکی بە کرێ داوێتی بەکەسێک کە ناوەکەی نازانێ و لەو ژوورەدا جاری وابووە چەند ژنی دیکەش دەهاتن کۆ دەبوونەوە کە دەڵێ ناوەکەیان نازانێ. پێدەچێ تێکدەرەکان ئەو داماوە ساویلکەیەیان خەڵەتاندووە و ژوورەکەیان لێ بەکرێ گرتووە. هیچی دیکەمان دەست نەکەوتووە."

پرسیم:

"ئەی وێنەی روقیە لە کوێوە هاتووە؟"

"بازنەکە هیی روقیە بووە. ئەوەیان ناسیارێکی روقیە پشتڕاستی کردووەتەوە."

دووقڕانییەکەم کەوت. شوێن پێی دکتۆر بیژەن و جەنابی زاوام دۆزییەوە.

چوومە لای دکتۆر بیژەن. بنج و بناوانی مەسلەکەم کۆڵییەوە. دەسگیرانە کەی گوتبووی بەڵێ لە سەردەمی دڵدارییەکەیدا ئەم بازنەیەی لە دەستی روقیەدا دیتووە و بێ و نەبێ هیی ئەوە یان هیی ئەو بووە. چوومە بنج و بناوانی شتەکەوە. ئێستا وای دانێین ئەو بازنەیە سەردەمانێک هیی روقیە بووە. کێ چووزانێ روقیە یەکێک بووە لەو پێنج ژنەی لەو خانووەدا دەژیان؟ لەوانەیە روقیە بازنەکەی فرۆشتبێ و دوایی کەوتبێتە دەست تێکدەران و ئەوانیش ویستبێتیان بیفرۆشنەوە و لە دەردێکی خۆیانی بدەن. یەکەم وێنەی روقیە هەر ئەوەیە کە لەگەڵ زاوا گرتوویەتی. بەڵام ئەوی دووەمیان لە کوێوە هێناوە؟ ئەو خۆی برایەتی نایناسێتەوە. هیچ بەڵگەیەک نییە کە روقیە پێوەندیی بەو چوار ژنە بێسەروشوێنەوە هەبووبێ. دیارە بازنەکە دەکرا دەسکەلایەک بێ، بەڵام بەڵگە نییە.

بەرۆکی دکتۆر بیژەنم گرت. چوومە ماڵەکەی. هێشتا پلاکی خانووەکەی هەر بەناوی دکتۆر بیژەن بوو. ژنەکەیم بە بیانووەک ناردە دەرێ. خەڵەتاندم و حاجی عەلی ساوجیم بە تاقی تەنێ لە ماڵەکەیدا کە ئیتر هەڕوگیڤی دەوڵەمەندی و رواڵەتی ماڵی وەکیل باشیی پێوە نەمابوو، گرت. هەر لەگەڵی تەنیا کەوتمەوە گوتم:

"حاجی عەلی ساوجی، ئەوە ملە لەگەڵ کێ دەکەی؟ پێت وایە دەتوانی لە پشتەوەڕا خەنجەر لە من بدەی؟ بە پشتیوانیی تیمسار کە سەردەمانێک کارەکەری ماڵێی بووی و ئاودەستت بۆ خاوێن دەکردەوە، دەتەوێ من لە عەرز بدەی؟ ئیتر ئەو زەمان بەسەرچوو. سەرلەشکر چیت پێ دەدا کە من ناتوانم بتدەمێ؟ لە کەری شەیتان وەرە خوارێ. وەرە لەگەڵ من رێک بکەوە. ئەگەر ئەقڵت بوایە تا ئێستا تێدەگەیشتی کە من هەمیشە پشت و پەنای تۆ بوومە. ئەوەندەش وەستای، کە بزانی من ئێستا چەندە بەدەسەڵاتم."

هەرچی هەوڵی دا قسەم پێ ببڕێ، نەمهێشت. دەمکوتم کرد. قسەی قۆڕی وەک ئەوەی "من هەمیشە خزمەتکاری تۆ بوومە، بێ ئەدەبییەکی وام نەکردووە، ئێستاش هەرچی تۆ بفەرمووی لەسەر چاومە"، نەدەچووە گوێمەوە. گوتم:

"ئەوە چۆنە لە پڕێکا روقیەت وەبیر هاتووەتەوە؟ دەتەوێ من پاشقول بدەی؟ لەبەرچی؟ من گیرفانتم باشتر پێ پڕ دەکرێ یان ئەو تیمسار سەلەشکرە خوێڕیلەیەت کە ئێستا کەوتووەتە بەر رق و غەزەبی خاوەنشکۆش؟"

هەم لە ناڵی دەدا و هەم لە بزماریش "وا نییە" "بلێی و نەڵێی ئەوە سەرەداوێکمان دەست کەوتووە، دەبێ شوێنی بکەوین." منیش شووم زیاتر لێ دەکێشا ــ دەماریم گرت. مەسەلەی مەرزیەم هێنا گۆڕێ. گوتم:

"دوژمنێکی شاهەنشات ئازاد کردووە و بەرتیلت وەرگرتووە، کە دەستی لە کوشتنی عەقیدێکی ناوەندی بڕیاردانەدا هەبووە."

وەک فیشەکە شێتە دەرپەڕی.

"لەسەر خۆبە، دەزانی یانی چی؟"

ویستی بڵێ" ئەوە من بووم..." لە دەمیم دا.

"جا کێ قسەی ئەتۆی بارکەوتوو قبووڵ دەکا و قسەی من لە عەرز دەدا؟"

ناچار بوو دانوێنێ. نەیدەزانی چ بکا. زمانی تەتەڵەی کرد. ترسا، ئەو دا ڕەزگایەی بە فێڵ و تەڵەکە بەسەر یەکییەوە ناوە، بڕمێ و لەکیسی بچێ. ئەمجارە تۆزێک نەرم بوومەوە. گوتم:

"ئێوە ناتوانن وا سووک و سانا من بەلاوە بنێن. سەردەستەی دوژمنەکانی حەزرەتی خاوەنشکۆ، واتە کۆنفدراسیۆنییەکان لە بن ڕکێفی مندان. خەریکم دەستەمۆیان دەکەم. خەریکن خۆیان کۆ دەکەنەوە. ڕێکخراوی مەلاکانم لە ئەورووپاش خستووەتە ژێر چاوەدێرییەوە. زۆرم لە باراندایە. تۆ و سەرلەشکر باشارم ناکەن. پێی بڵێ با لەگەڵ مۆنیکا مەکربازەکەی رابوێرێ و نقەی نەیە. لاکەوە و کارت بە شتی ماقووڵەوە نەبێ. مزی خۆت لە من وەردەگری."

قوتووە جگەرەیەکی زێڕ و ئەموستیلەیەکی نقێم پیرۆزەییم لە گیرفانم دەرهێنا و گوتم:

"ئەوەم بە دیاری بۆ خۆت و هاوسەرەکەت هێناوە. بەڵام حاجی عەلی، بەو مەرجەی ئیتر ئاو لە ئاشی دوژمنان نەکەی، ئەگینا دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەم ها."

شەوێ چوومەوەماڵی دایکم. ژوورەکەی هەڵوەژاردبوو. سفرەیەکی سپیی لە نێوەڕاستی ژوورێ ڕاخستبوو. ئاوێنە و مۆمدانەکان دەدرەوشانەوە و چرایەکی بەرزیش لە نێوەڕاستی سفرەکە داییسا و گڵۆپێکی سەدی بنمیچەکەی ڕووناک دەکردەوە. پرسیم:

"دایە، هەم شۆلەچرا و هەمیش کارەبا؟ بۆ چما میوانیی حەوت لەشکرە؟"

"ئاخر جاری وایە کارەبای گەڕەکەکەمان دەبڕێ. ئێمە ڕاهاتووین. هەم شۆلەچرا و هەمیش کارەبا.

پرسیم: "ئەی ئەو هەمووە زەحمەت و دامودەستوورەی بۆ چ بوو؟"

"ئەمشە و مووسا و ژنەکەشیم بانگهێشت کردووە ـ لەبەر ئەوانە."

هەر بەراستی دایکم گیانێکی بەبەردا هاتبۆوە. دایکە بێتاقەتەکەی بەیانی نەبوو.

هەر تەقەی دەرگا هات، دایکم بە سرتە پێی گوتم:

"هیچ باسی ڕوقیە مەکە. ژنەکەی نامەحرەمە."

میوان گەیشتنێ. مەنیژە خانی ژنی مووسا گیان زۆر جوان و لەبەردڵان بوو. ئارایشتێکی خەستی کردبوو. هەر قسەت لەگەڵ دەکرد، پێدەکەنی. نەمزانی لێم تێگەیشتووە یان نا. کە زۆری پێخۆش دەبوو، قاقای دەکێشا. دیار بوو هیچ ئاگای لە کاروباری من نییە و پێی وابوو نەجیمزادەیەکی ماقووڵ و بیرمەندم کە لە بەهەشتی بەرینەوە کەوتوومەتە ئەم کاولاشەکۆنە.

مووسا گیان دیسان گلەیی کاروبارەکەی هێناوە گۆڕێ. بۆی هەڵنەدەسووڕا. لە شارە چکۆلەکان خەرج قورس نییە. هەندێکیش پاشەکەوت دەکرێ. بەڵام بنیادەم بێتاقەت دەبێ. ژنەکەی هەموو مانگان دەبێ بێتەوە ماڵی بابی و ئەویش بەتەنێ دەمێنێتەوە. خەڵکی فەسا، خەڵکێکی باش و بێزەڕن، بەڵام کورتبین و کەمئەزموون. هێشتا زۆربەی پیرەژنەکان، سامانەکەی خۆیان لە گۆرەوییەکانیاندا دەشارنەوە. ژنەکەی دتوانێ لەگەڵ ژنی سەرۆکی ئیدارەکان کە هەر کامە و گرفتاریی خۆیان هەیە ببێتە دەستەخوشک و ئیتر خۆی لە میوانیی ئەوان دەدزێتەوە. ئەو گلەیی و گازندانە هەموو سەرەداوێک بوون و دەچوونەوە سەر ئەوە، کە مووسا گیان لە بەرچاوی ژنەکەی ڕێگە بۆ ڕاگوێزرانی خۆی بۆ تاران خۆش بکا. من ئەو هەقایەتەم هەموو دەزانی و دەمزانی دەیەوێ ژنەکەی قایل بکا.

دایکم کە سەرەڕای پیری و بێتاقەتییەکەی وەختێ دەیدی ئەو مووسا گیانەی سەردەمانێک بە شانوباڵی خۆی هەڵدەگوت و بەخۆی دەنازی، ئێستا چۆن کلکەسووتەم لەبەر دەکا، کەیفخۆش ببوو. بەڵام وەڕووی خۆی نەدێنا و هەر هەوڵی دەدا میوانەکان دڵیان خۆش بێ. شەوێکی خۆشیش بوو. ڕۆحی پەرێشانی ڕوقیە بە ژوور سەرمانەوە فڕکەی بوو. دڵم خۆش بوو کە بڵاوبوونەوەی وێنەکەی ئەو داوێنی من ناگرێتەوە. دایکم بەلەمی برنجەکەی لە نێوەندی سفرەکە دادەنا، کە لە پڕ خرمەی شکانی شووشەی پەنجەرەکەمان هەموومانی ڕاچڵەکاند. من کە پشتم لە پەنجەرەکەوە بوو،

خڕکەبەردێک وە پشتم کەوت. وەک بزووت دەرپەڕیم. لەو جانتایەدا کە بە ملمەوە هەڵواسیبوو، دەمانچەکەم دەرهێنا. بە مووسا گیانم گوت:

"ئاگات لەو دوانە بێ. دەچم بزانم چ قەوماوە."

ئەوان هیچ گومانیان نەدەبرد کە بۆچی وا بە هەڵەداوان دەچمە بەردەرگا. دڵنیا بووم کە ئەگەر مەبەستیان کوشتنیشم نەبووبێ، لانیکەم ترساندنم بووە. ئەوە خەت و نیشانی هاوڕێیانی روقیەیە کە لە لەندەن و رێی بەردەم ئاسایش و لە هەموو جێیەک چاویان بەسەرمەوەیە. لە کۆڵانێ دەروجیران هاتبوونە دەرێ.

پرسیم:

"ئەوە بەردیان بە ماڵی ئێوەشدا داوە؟"

هەموویان وێکڕا گوتیان:

"نا، وردە کاغەزیان بڵاو کردووەتەوە."

زاوام دی، کە بە پەلەپڕووزێ کاغەزەکانی لە چنگی خەڵکی دەردەکێشا و کۆی دەکردنەوە. یەکێکیانم لێ وەرگرت و خوێندمەوە. هەر ئەو رستەیە بوو کە ماوەیەک لەوەپێش لەسەر تەلەفۆن گوێم لێ بوو.

"تا درەنگ نەبووە لە کەری شەیتان وەرە خوارێ. ئیمزا: کۆمەڵەی رێنوێنیکەر."

ئەمجارە رستەکە بە راناوی تاک بوو. دڵنیا بوومەوە مەبەستەکە من بوومە. لە زاوام پرسی:

"ئەوە تۆ لێرە چ دەکەی؟"

"ئاگام لە تۆ بوو."

"جا چۆن دەتزانی من ئەمشەو لێرەم؟"

"پێیان گوتبووم تۆ لێرەی و منیش ئاگادار بووم کە مارکسیست ئیسلامییەکان دەیانەوێ بتکوژن. جگە لەوەش، من هەر لەو دەوروبەرانەم و هەر لەو حەوشە بچووکەی لە دایکتم کڕیوە، زۆر جار لەم ژوورەدا دەژیم. هەندێ شەوان ئەگەر یەکێکی دیکە ببێتە چاودێر، ئەوە من دەچمەوە ماڵەکەی خۆم."

"نامەرد، ئاگات لە منە، یان چاودێری هەموو ماڵەکەی؟"

"پیاوەتی بکە و مەپرسە."

"وێنەکەی روقیە تۆ دابووتە ئاژانس؟"

"بۆ دەمتوانی بیشارمەوە؟ دەسپەروەردەی خۆتم."

"ئەی وێنەکەی دیکەیان لە کوێوە هێناوە؟"

"وێنەکەی دووەم هیی روقیە نییە."

"چووزانی؟"

"قوربان تکایە نانبڕاوم مەکە."

"هەر ئەم وەڵامەم بدەوە. دەست بە باڵتەوە دەگرم و ناهێڵم نانت ببڕدرێ."

"ئەوەی دیکە، ئەو سەگبابە دروستی کردووە بۆ ئەوەی حەیای تۆ بەرێ."

"کام سەگباب؟"

"هەر ئەوەی ئیتر نەماوە و خەریکن دەری دەکەن؟"

"دکتۆر بیژەن؟"

"من ناوی کەسم نەهێنا."

دوو سێ دراوی سەد تمەنیم لە گیرفانم دەرهێنا و لە گیرفانی چاکەتەکەیم نا. دەستم لەسەر شانی دا و دەستێکم بە پشتەسەریدا هێنا. زاوا داهاتەوە دەستم ماچ بکا. نەمهێشت.

"برۆ کاکی من خەریکی کاروباری خۆت بە. هەر بەراست، ئەمشەو ئاگات لە من و دایکم بێ. لێرە دەڕۆین، بەڵام ئیتر دڵنیام هەمیشە گیانی دایکم دەپارێزی."

"من خزمەتکاری تۆم."

"ئەی خەبەری روقیە؟"

"هیچ خەبەرێکم لێی نییە."

"راست بڵێ."

"بە تاجەکەی خاوەنشکۆ، کەس بە سەروسۆراغی نازانێ."

"برۆ خەریکی کاری خۆت بە."

"من تا زەردەی تاوهەڵات لێرە دەبم و وریا دەبم کەس تێکدەری نەکا. ئەگەر یەکێک لەو "ئیرشاد"ییانە بگرم، بۆ بابی ئاقڵ دەکەم."

لەو نیوسەعاتەدا کە من لە کۆڵانێ لەگەڵ زاوا و دەروجیران قسەم دەکرد، مووسا گیان چەند جاران دەرگای کردەوە و ملی دەکێشا. هێورم کردەوە و گوتم:

"هیچ نەبووە، ژنەکان هێور بکەوە و بڵێ منداڵ شەڕە بەردیان کردووە و یەکێکیان وەشووشەکەی ئێمە کەوتووە."

مووسا گیان لەوە بەئەزموونتر بوو بڕوا بەو درۆیە بکا. دیسان کە لەسەر کورسییەکەوە بەسەردیوارەکەدا ملی کێشا، پێم گوت:

"ماڵەکە تۆزێک هەڵوەژێرم. ئەمشەو لێرە دەڕۆین. دایکیشم ئامادە بکەن پێکەوە دەچینە خانووەکەی خۆم."

کە لەگەڵ دایکم لە خانووەکەی خۆمدا لە نیاوەران تەنیا مامەوە، لێی پرسیم:

"ئەوانەی بەردەکەیان بە ماڵمان دادا، دوژمنی روقیە بوون؟"

گوتم: "نا دایکە، هاوڕێی روقیە بوون."

"چۆن؟"

"دایە گیان، لە شەڕدا چەپکە گوڵ بەیەکتردا نادەن."

بەیانی کە چوومە ئاژانس، دەرکەوت کە لە گەڕەکەکانی پاچنار و شەقامی ماشێن و سەنگلەج و تەجریش و نیاوەران بەردباران بووە و دەیان کەسیش گیراون. هێشتا نەببووە سەعات دە، کە سکرتێری سەرۆکی ئاژانس بە تەلەفۆن ئەمری کرد:

ئەمشەو سەعات 8 کۆبوونەوەی "چاوپێداخشاندنەوە" دەبێ. پەروەندەی هەمووان بخوێنەوە تا هەموویان بناسی. فەرموویان خراپ نییە.

هێشتا تەلەفۆنەکەی دانەنابۆوە، کە هەر ئەو ساواکییە تازەکارە هاتە نووسینگەی دکتۆر جیهانگیر و منی بردە لقێکی دیکە. لەوێ کۆڵێکم کاغەز و نووسراو دیت و چەند سەعاتان هەڵم دانەوە بۆ ئەوەی کارمەندەکانی کۆمسیۆن بناسم. هەندێکیانم هەر لە وێنەکانیانەوە و هەندێکیشیانم بە ناوەکەیان ناسی. لە بارەی هەندێ کەسی دی، وردە یادداشتم هەڵگرتەوە و خۆمم ئامادە کرد. هەمووان شاپەرستی تۆخ تۆخ بوون و کێ دەیوێرا بە ئاماژە و توێکڵەوە بڵێ پشتی چاوی خاوەنشکۆ برۆیە. هەر کامە و خەتێکی خواری لەبن سەریدا هەبوو، بەڵام شاخۆشەویستییەکەیان خەتاپۆش بوو. بەر لەوەی کۆبوونەوەکە دەست پێ بکا، خۆم گەیاندە هۆڵەکە و لەگەڵ چەند کەسێک کە لە ئەورووپاوە دەمناسین تۆقەم کرد و وەڕووی خۆمم نەهێنا کە ئاگام لە گزە و فێڵ و تەڵەکەی ئەوانە و دەزانم لە سایەی چ شتێکەوە

گەیشتوونەتە ئەو پلەیە. ئەوانە لەگەڵ هاوڕێکانیان پێکیان ناساندین و زۆر زوو هەمووان بۆیان دەرکەوت چ کارەم.
سەرۆکی ئاژانس کۆبوونەوەکەی خستە گەڕ. ئەمبەرەوبەر دانیشتبوون. سەربەرێوەبەرەکان، سەرۆکی دایرە سەربەخۆکان و بانکەکان و کۆمپانیا حوکمییەکان و پێشنوێژەکان و ئامۆژگاریکەرە بەناوبانگەکان و نوێنەرانی بنکەی گشتیی سوپا و پۆلیس و ئاسایش و کەسێکیش کە چاودێری شوێنەگشتییەکان بوو. کۆڕگێڕەکە منی ــ کە هەموو قوتابییە ئێرانییەکانی ئەورووپام بە ئاوات و ئارەزووەکانیشیانەوە دەناسی ـ ناساند و بە دەربڕینی ئەو رایە کە داهاتووی وڵات بە دەست خوێندەوارە نیشتمانپەروەرەکانەوەیە جا چ لە دەرێ و چ لە ناوخۆ و دەبێ بەردەوام بن و گوتیشی وا باشە کە لێک لە ئەزموونەکانیان وەرگیرێ. ئەوەشی لێ زیاد کرد:

"ئەگەرچی ئەو پێی ناکرێ بەشداری هەموو کۆبوونەوەکان بێ، بەڵام هەر کات پێویست بێ، بەشدار دەبێت."

هەمووان خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕی و سەرێکیان بۆ لەقاندم و زەردەیەکیان هاتێ و هەمووشیان ئەوەندە بەمشوور بوون، کە بزانن کێ بە کێیە. هەموو پێیان باش بوو لەگەڵ من خۆ رێک بخەن.

باسی ئەوە بوو دەبێ چ بکەن و چ رێیەک بگرنە بەر تا دەسەڵات و مەزنیی شاهەنشا و رێنوێنییەکانی دەوڵەت کەم نەبێتەوە و دەسەڵاتەکان وردەوردە بدرێنە دەست خەڵکی لێوەشاوە و کارزان؟ دیارە مەرجی یەکەم ئەوەیە کە بنەمای دین و کولتوور و نەتەوە لە ژێر سێبەری دروشمی شایانەی خوایە شای نیشتمان پایەدارتر بێ. لە کاروباری خێرا و زۆرپێویستدا کە بەرژەوەندییە باڵاکانی نیشتمان لەگۆڕێن و خەڵک لێیان تێناگەن، جۆرێک تەگبیر بە خەڵک بکرێ، کە هەمووان لێیان سوور بێ و دڵنیا بن، ئەوە خۆیانن ئەو بڕیارە ناخەڵکیانەیان داوە.

وتاری زۆر خەست و تێر و تەسەل دران، یەک لە یەکێ خەستتر، کە منی کرچوکاڵیان وا هێنایە جۆش، بە ئاواتەوە بووم هەموو ئەو ئامانجانە وەدی بێن. ئینجا وتارێکی دیکە رەخنەی دەگرت و قبووڵی نەبوو و وای دەنواند کە ئەو بەرێزە نیازپاکانە کەوتوونە ژێر کاریگەریی هزری وڵاتانی لاساییکەرەوەی رۆژئاوا و خەریکن ئەورووپا و ئەمریکاش تووشی هەڵدێری نەمان دەکەن. جاری وابوو ئەوەندەیان قسەی فەلسەفی و بەکەشم و نەشم دەکرد و شیعریان دەخستە نێو قسەکانیانەوە، کە هەر نەمدەزانی سەروبەری ئەو قسە پووچانە چییە و هەر نەمدەبیستن و لە پشت تانوپۆی جۆڵاتەنەی قسەکانەوە، ئەو بیچم و سەروسەکتەی کابرام دەدی، کە لە پەروەندەکەیدا خوێندبوومەوە و هاتبووە پێش چاوم.

سەرۆکی پۆلیس چەند ساڵی پێش، بە تۆمەتی فرۆشتنی چەکوچۆڵ بە "بویرئەحمەدییەکان" چەند مانگێک لە زیندانی "دژبانی" دەستبەسەر کرابوو. پارێزەرەکەی لە دادگا توانیی بیسەلمێنێ بەرگریتەکەی هیچ تاوانێکی نەکردووە و ئەو ئاغایانەی چاویان پێی هەڵنایە ئەم تۆمەتانەیان بۆ هەڵبەستووە و بەتایبەتی پێی لەسەر ئەم خاڵە داگرتبۆوە کە لەسەردەمی سەرۆکایەتیی ئەودا لە فارس هەموو کێڵ و عەشیرەتەکان لە پێشوازیی خاوەنشکۆ شاهەنشادا گاوگەردوونیان کردبوو و کەسیش گلەییەکی نەبووە. ئەویشیان ئەستۆپاک کرد.

دەستت بۆ هیزەی هەرکام بردبایە کرمێ ببوو. نوێنەری ناوەندی بڕیاردرانی هێزەچەکدارەکان، عەقیدێکی تریاککێش بوو. لە بەربەرەکانێی مادەسڕکەرەکاندا، مەئموورە ناشی و کرچوکاڵەکان خۆیان بە ماڵەکەیدا کرد و هەندێ کۆکایینیان دۆزییەوە. ئەودەم نەقیب بوو. کە لێیان کۆڵییەوە گوتیان: سەربازەکان خۆیان کۆکایینەکەیان خستووەتە ماڵەکەیەوە و نەیانزانیوە کابرا نەقیبێکی ئەرتەشە. خەریک بوو حەیاچوونەکەی دەنگی دەداوە، کە خزم و کەسەکەی فریای کەوتن. ئاخرییەکەی کارمەندێکی سادەیان ناچار کرد دان بەوەدا بنێ کە ئەو کۆکایینەی لە قاچاخچییەکانیان شاردووەتەوە بە هەڵە هێناویێتی و لە ماڵی جەنابی نەقیبی داناوە و لەبیری کردووە لەگەڵ خۆی بیباتەوە. ئەو داماوەیان چەند مانگێک گرت و دوایی جەنابی نەقیب پشتیوانیی لێ کرد و زیندانییەکەی بۆ کڕییەوە.

لە هەموان خۆشتر، چیرۆکی بەرپرسی شوێنەگشتییەکان بوو، کە رەچەڵەکی خۆی دەگەیاندەوە شا تەهماسبی سەفەوی. خۆی لە هەموو شتێک هەڵقورتاندبوو. ماوەیەک بوو بە رۆژنامەنووس و دوایی ماستاوچی. پاشان "ئەنجومەنی بەربەرەکانێی مادەهۆشبەرەکان"ی دامەزراند و کەوتە گیانی ژنە لەشفرۆش و گاندەرەکان و هەمووانی کۆ کردنەوە و کار گەیشتە دادگا و خەریک بوو لە هەڵبژاردنەکاندا حەیای بچێ، کە ئیتر لایەنگرەکانی وەخۆ کەوتن و بە پشتیوانیی یەکێک لە وەزیرەکان مەسەلەکەیان دیزەبەدەرخۆنە کرد و بەرەکەیان بۆ لە ئاوێ دەرکێشا. ناوەکەی ئەویان لە سندووقی هەڵبژاردنەکانی یاسووج دەرهێنا و ئیتر چاری نەبوو دەبوایە دەمی دابخا و جگە لە پەسن و چاکەی رێبەری پایەبەرز، هیچ فزەی لێوە نەیە. شەیتان هەڵیخەڵەتاند و رۆژێکیان لە مەجلیسی شورای نیشتمانی ئاماژەیەکی بە وەزیرەکە کرد، کە لە نەگبەتی و حەیاچوونەکە رزگاری کردبوو، ئەویش رێک ئەودەمەی شاهەنشا حیزبی "ئێرانی نوێی" دامەزراندبوو و جا چونکە لە هەموو کۆڵانێک پەیڤ و فەرموودەی شاهانەیان کاوێژ دەکردەوە، هەر خۆی فەرمووی و ئیجازەی دا، بە مەبەستی چەواشەکردنی هەندێ نوێنەری بەناوبانگ کە هەم لە ناڵیان دەدا و هەمیش لە بزمار، وا بنوێنن ئێران وڵاتێکی دیموکراتە و بەو فێڵە مستێک بدەن لە دەمی کۆمۆنیستەکان و هاورێکانیان لە ئەورووپای رۆژئاوا.

ئەو نەیدەزانی شا، داوای بەرگدرووەکانی کردووە، نەک جەواڵدروو. نوێنەرە نەگبەتەکەی یاسووج گێرەی لە جێیەکی دیکە دەگەڕا و ئیتر هەڵیان نەبژاردەوە و خانەنشین کرا. چ بکا، جگە لەوەی سەرۆکایەتیی شوێنەگشتییەکان بگرێتە ئەستۆ بۆ ئەوەی نان و رسقی نەبڕێ؟

خۆ ئەگەر ویستبایەم باسی هەمووان بکەم کە چۆن پێگەیون، نە خۆم تاقەتی نووسینم دەما و نە خوێنەریش تاقەتی خوێندنەوەی و ئەو سەد دینار و سێ شاهییەیش کە وەریدەگرم، دەفەوتا.

بەڵام دەبێ باسی یەکێک لەو گزیکەرانە بکەم. چونکە زۆر ناڕەسەن و مست قووچاوە. ئەو کابرایە سەرۆکی "کۆمپانیایەکی رستن و چنینە" و یەکێکە لە هەرە بێ چاوڕووەکانی سەر ئەم دنیایە. لە پێشدا پێشنوێژی بازاڕی تەنەکەسازەکان بوو. جارجار شەوانە لە بازاڕی ئاسنگەرەکان و لە ماڵی دووکاندارەکاندا رەوزەی دەخوێند و شینی ئیمامانی دەگێڕا. سواری کەرێک دەبوو و لەم کۆڵانەوە بۆ ئەو کۆڵان هەر کەرسوار بوو و ئەگەر نەڵێین سواڵی دەکرد، لانیکەم دڵی بەوەندە خۆش بوو کە سەدەقەی لەخەڵکی وەردەگرت و بۆ نەخۆشان دەپاڕایەوە و چاکی دەکردنەوە. دواتر کە ئەو نەخۆشانەی حەکیمی گەڕەک جوابی کردبوون ئەو چاکی کردنەوە، ئیدی پارووی لە رۆن کەوت و بوو بە بەربێژ. دەیزانی فڵانە مشتەری بەو زووانە دەچێتە سەفەر و دەوڵەمەند دەبێ و دەگاتە ریزی خواپێداوان و خوا منداڵێکی دەداتێ و تووشی نەگبەتییەکی گەورە دەبێ و ئیمامی زەمان بەهانایەوە دێ و دیسان بەختەوەری دەکاتەوە. فاڵی دەگرتەوە، رەمڵی لێ دەدا و بەردەمۆرەی هەڵدەدا و دەژیا. لەپڕ خۆی لێ گۆڕا و بێوەژنێکی دەوڵەمەندی هێنا. کۆنەژنەکەی سیحر و جادووی لێ کرد و دەیویست ژەهری بداتێ، ئیتر رای کردە ماڵی بێوەژنە و لەوێ گیرسایەوە. مەندیلی فڕێ دا و کڵاوی لەسەر نا و حوجرەیەکی لە بازاڕی تورکاندا کردەوە و شاگرد و میرزا (سکرتێر)ی گرت و مایەپووچ دەرچوو. بێوەژنە تەڵاقی لێ وەرگرت و ناچار چۆوە بن باڵی کۆنەژنەکەی.

ئینجا کڵاوەکەی دانا و کاکۆڵ و بۆینباخی لێ رێک خست و پانتۆڵی ئوتووکراوی لەپێ کرد و ویستی نانی دەڵاڵی بخوا. دەبوو بە دەڵاڵ و نێوبژیوانی نێوان خەڵکی بازاڕ و کارمەندانی دەوڵەتی و کێشەی بۆ چارەسەر دەکردن و لەو رێگەیەوە سامانێکی پێکەوە نا و کۆمپانیایەکی "کڕین و فرۆشتنەوەی کاڵا نیشتمانییەکان"ی دامەزراند و توانیی پارەیەکی زۆروزەوەند لە بانکی بازرگانی بە قەرز وەرگرێ و کاڵا دەرەکییەکان بە کۆمپانیایەکی خۆماڵی ب فرۆشێتەوە و ببێتە یەکێک لە مەزنانی ئابووریی ئێران. دیسان لەگەڵ ژنە تەڵاقدراوەکەی بەینی خۆش کردەوە و خەڵەتاندی و ژنە پێی گوت سەروەت و سامانەکەی لەبەردەستی دەنێ. "کۆمپانیای کڕین و فرۆشتنەوەی کاڵا نیشتمانییەکان" برەوی پەیدا

کردەوە و ئێستا یەکێکە لە دەوڵەمەندە سەرگەورەکانی ئێران و بەو پێگەیەوە مافی خۆیەتی لە کۆبوونەوەی "چاوپێداخشاندنەوە"دا بەشدار بێ.

وتارەکەی ئەم سەرۆک کۆمپانیایە باسی هەمووانیکردنی ئابووریی وڵات و گەمەکردن بوو بە وردیلەسەرمایەدارەکان و هاندانیان بۆ کردنەوەی کۆمپانیا و هەڵوەشاندنەوەی پاوانە حکوومییەکان لەگەڵ کورتە ئاماژەیەک بەوەی کە رێگە لە دەربارییەکان و خزم و کەسیان بگرن و نەهێڵن دەستیان بگاتە ساتوسەودا گەورەکانی دەرەوەی وڵات بەتایبەتی کڕینی چەک و کەلوپەلی پیشەساز و تەکنیکیی سەربازی و دەریاداری و فڕۆکەوانی و، ئەو شتانە بدرێنە دەست کۆمپانیا نیشتمانییەکان. ئەم قسانە کاریان کردە سەر هەموو ئەندامانی کۆبوونەوەکە و پێی شاگەشکە بوون، دەتگوت هەر کامە و بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانی خۆی لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گشتیدا دەبینێتەوە. با ئەوەیشی لێ زیاد بکەین، کە نوێنەری وەزارەتی فەرهەنگ و هونەر، کە مامۆستایەکی زانکۆ و دۆستی وەزیری شاهەنشا بوو، لایەنگریی لەو بیرۆکە لیبرالیستیە ئابوورییە کرد. تەنانەت سەرۆکی ئاژانس پێی وابوو شیاوی ئەوەیە شاهەنشا پەسندی بکا و کار گەیشتە ئەوەی لەبیری کرد، کە هەر ئەم مامۆستایەی زانکۆ پاش راوێژێکی تایبەت لەبارەی دامەزراندنی زانکۆی هەمەدان و دەسنیشانکردنی شوێنی بیناکە بە ترۆمبێلی خۆی، بەر لەوەی خەڵکەکەی ئاگایان لەو بڕیارە بێ و نرخەکان بچنە سەرێ، چەند هەزار مەتر زەویی بەناوی خۆی و وەزارەتی فەرهەنگ و وەزیر کڕی و لە قەباڵەی کردن.

لەودەمەوە وشەی "لیبرالیزم" کەوتە سەر زار و زمانان و بە یەکەم هەنگاوی دابینکردنی "کەشی ئازاد" لە وڵاتدا دانرا.

من تەنیا توانیم لە چەند کۆبوونەوەیەکیاندا بەشدار بم و لەسەر ئیزنی سەرۆکی ئاژانس، سێ رۆژ دواتر گەڕامەوە لەندەن و قەول و قەرار دانرا، هەر کات بڕیارێک بدرێ و پێویستی بە من بێ، ئاگادارم بکەنەوە.

گەڕامەوە لەندەن و ویستم یەک بە یەکی ئەو قوتابییانەی لایەنگری رژیمەکە بوون و سیخوڕییان دەکرد و لە شارە جیاجیاکانی ئەورووپا ئەنجومەنی جۆراوجۆریان کردبۆوە، ئاگادار بکەمەوە کە ئێران لە ژێر چاودێریی حەزرەتی شاهەنشادا بەرەو گۆڕان و گۆڕانکاری هەنگاو دەنێ و دەبێ خۆیان ئامادە بکەن و قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵن بۆ وەئەستۆ ئەگرتنی ئەو ئەرکە قورسانەی دەکەونە سەرشانیان وەک کارخانەی ناوەکی و دروستکردنی ژێردەریایی و بواری کۆمپیوتەر و دروستکردنی ئاسمانگەڕ. پێوستییەکی زۆرمان بە قوتابیی فیداکار و نیشتمانپەروەر و شاپەرست هەیە و دەبێ هەمووان قۆڵی هیممەتی لێ هەڵماڵن بۆ ئەوەی بەپێی مزگێنیەکەی شاهەنشا مەملەکەتەکەمان لە ماوەی پێنج ساڵاندا لە بواری پیشەسازی و ئابووری و زانست و رووناکبیری و هونەرەوە بچێتە ریزی وڵاتە هەرە مەزنەکانی جیهانەوە. ئەم بەرنامەیە دەبێ جێبەجێ بکرێ. ئاهاری هەواڵی هێنا، کە تا چەند مانگێکی دیکە نامەی کۆتاییەکەی خۆی ئامادە دەکا. خانعەلی ساڵێکی کات دەویست و دەماوەندی کە ئیتر بەئەدەب و بەگوێ ببوو، گوتی، نامەکەی خۆی پێشکەش کردووە و حەفتە بە حەفتە چاوەڕێیە مامۆستای سەرپەرشتیار وەڵامی دەرچوونەکەی بداتەوە و بتوانێ نازناوی دکتۆرا لە پێش ناوەکەی خۆیەوە دابنێ. پاش لێبوونەوە لە کاروباری ئەوان، دیسان چوومەوە سەر بەدواداچوونی روقیە. سۆراغێکی فەرزانم کرد. بلیتێکی چوون و گەڕانەوەی پاریس ـ لەندەنم بۆ نارد. ناردییەوە بەڵام بە ئەدەبەوە تێی گەیاندم کە ناتوانێ کەلکی لێ وەرگرێ و ــ دیارە لە خۆڕا ــ پارەی ئەوەی نییە سەفەرێکی پێ بکا. نەیدەویست هیچ خێروبێرێکی ساواکی تەنانەت بە سوودی منیش پێ بگا. کە بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵ کرد، بە لەبزە نەرمونیانەکەیڕا زانیم پێی خۆش بووە سەری تارانم داوە و حەزی لێیە پێوەندییەکەشمان هەر بمێنێ. لەوانەشە سۆسەی ئەوەی کردبێ، کە من قوتابییە دەرسنەخوێنەکانم ناردووەتە لای ئەو تا نامەی کۆتاییان بۆ بنووسێت. ئەی چ بکا داماوە؟ کاری خۆی دەکرد و نانی لێ دەخوارد.

دوو سێ مانگێک بەسەر سەفەرەکەی تارانمدا نەهاتبوو، کە بڕیارنامەی "چاوپێداخشاندنەوە" گەیشتە لەندەن. قسەی وا قۆڕی تێدابوو، نە سەری هەبوو نە بەر. خۆشیان بڕوایان پێی نەبوو، چ بگا خەڵک باوەڕ بکەن. هەر لەو بڕیارنامانە بوو کە پاش راوێژ و تەگبیر بە پسپۆڕە ئەمریکاییەکان ئامادە کرابوو و بەکاری بووژاندنەوەی بیابانی نێڤلدا دەهات نەک شارەکانی ئێمە. ئاکامەکەی وا بوو کە ئاژانس خۆی بەپەلە هەنگاو بنێ بۆ ئەوەی چەرخەکە بخاتە گەڕ.

قازانجی ئەو کۆبوونەوەیە بۆ من هەر ئەوەندە بوو، کە کارێکی وام کرد سەرۆکی ئاژانس متمانەم پ ێ بکا. جگە لەوەی لە سۆنگەی ناسینی سەرۆکی بانکەوە کاری مووسا گیانیشم رێک خست.

سەرۆک لە تەلەفۆنەکاندا و پێداگرتنەوەی لەسەر هەڵبژاردنی قوتابییەکان و وردبوونەوە لە لێوەشاوەیی و نیشتمانپەروەری و شاپەرستییەکانیان و زۆر شتی دیکەدا، جارجار راسپاردەی تایبەتیشی هەبوو. بۆ وێنە کچەکەی کە لە لۆس ئانجلێسەوە دەهاتە لەندەن، پێی باش بوو ئاگام لێی بێ و تووشی کێشەیەک نەبێ. جارێکیان زۆر خۆمانە پێی گوتم، شتومەک لە بەریتانیا گران بووە و ژنەکەی زۆری خەفەت خواردووە لەوەی پارەی پێ نەبووە پاڵتۆ دڵخوازەکەی خۆی بکڕێ. دیارە من تێی گەیشتم و پارەکەیم بۆ دابین کرد. سەیرم کرد ئەهلی ساتوسەوداشە و تەنیا بە قاپێکی کریستاڵیی میوە دڵی داناکەوێ و چاوی تێر نابێ. دڵنیا بوومەوە کە منی کەوتووەتە بەر دڵی و ئیتر خەڵکی وەک تیمسار و حاجی عەلی ساوجی چ گوویەکن بە من هەڵشاخێن و بیانەوێ پاشقولم بدەن.

بیرم لەوە دەکردەوە کارێکی وا بکەم قازانجێکی باش بکا بۆ ئەوەی وای پەت بکەم، بۆ کوێم حەز لێ بێ وەدووی خۆمی بدەم و ئەو کارەش لە رادەبەدەر هەستیار بوو. ئەگەرچی گومانم لە پارەپەرستییەکەی نەبوو و دەمزانی ئەویش وەک خەڵکی تر بیر لە داهاتوو و رۆژانی تەنگانەی خۆی دەکاتەوە، بەڵام ناوبانگەکەی وای لێ دەکردم بەبێ تاقیکردنەوەی دەراوەکە خۆی لێ نەدەم.

چونکە بە پێی ئەزموون دەمزانی ناوبانگ نیشانەی پاکی و تێروپڕی نییە، بەڵکو ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی بە پارێزەوە دەست بۆ نیعمەتەکان بەرێ، نەکا بۆنەکەی لووتی بەرچاوتەنگان ببرژێنێتەوە.

چەند مانگان بیرم لێ کردەوە و لە لایەکیشەوە فکر و زکرم هەر بە دوای شوێنەوارێکی روقیەوە بوو، هەر بۆیە هەوڵم دەدا پێوەندییەکەم لەگەڵ ئەو نەپسێنم و لەلایەکیشەوە قازانجێکی زۆر بۆ سەرۆکی ئاژانس دەستەبەر بکەم.

ناردنەوەی دەرچووەکانی زانکۆ بۆ ئێران و دابینکردنی کار بۆ ئەوان لە پلە و پێگە هەستیارەکاندا و، سەفەرەی بەردەوام بۆ وڵاتانی ئەورووپا و پێوەندی لەگەڵ ئیدارەی پۆلیسی ئەو وڵاتانە و مامۆستاکانی زانکۆ و ئەو ساواکییانەی لەو وڵاتانەدا دەژین، کار و پیشەی من بوو. ئەگەر راستیتان دەوێ لە سۆنگەی ناسین و تەنانەت دۆستایەتیمەوە لەگەڵ سەرۆکە بەناوبانگەکەدا، من ببوومە هەمەکارە و دەمڕاستی ئاژانسی پاراستن و زانیاریی ئێران لە خۆرهەڵات و خۆراوای ئەورووپا.

شەش مانگ پاش هاتنەوەم لە تاران و چاوپێکەوتنم لەگەڵ سەرۆکی ئاژانس، ئاهاری هەر لەگەڵ ئاگاداری کردمەوە کە نامەی دکتۆراکەی قەبووڵ کراوە، بەبێ ئەوەی کارنامەکەیم پێشان بدا، ناردمەوە ئێران و لە وەزارەتی دەربارذا دیارە بە راسپاردەی جەنابی سەرۆک، جێگەم بۆ دابین کرد. تێم گەیاند کە ئیتر رێگە ئاوەڵایە. پێگەیشتن و هەڵکشانی ئەو پێوەندیی بە زیرەکی و لێوەشاوەیی و تێگەیشتوویی و چالاکیی خۆیەوە هەیە. دەبێ وا هەڵسوکەوت بکا، کە سەرنجی جەنابی شاهەنشا رابکێشێ و خەڵکی دەربارێش لەخۆی زویر نەکا. لەوێشەوە ئیتر نوێنەرایەتی و سەرۆکایەتی و وەزارەتی لەبەر چاوە. دڵنیا بووم بەو ئەزموونەی لە دزینی یارمەتیی رۆژانەی حیزبییەکان و راکردنی بۆ پاریس و خزمەتکاری لە ساواکدا زۆر باش شارەزای هەوراز و نشێو و کون و کاژێرەکان بووە و، زۆر زوو دەگاتە مرازی خۆی و قازانجی شاهەنشا و منیشی لەبەرچاو دەبێ.

چەند مانگان فەرمانم بە کارمەندە سادەکەی باڵیۆزخانە دا، کە ماوەیەک تەلەفۆن بۆ دەماوەندی بکا و لێی ببێتە مێمڵ و هانی بدا بۆ کارکردن. یەک دوو جار خۆم چوومە سەردانی فەرزان و نەمویست وەڕووی بدەمەوە کە هەتیومەتیوی ئاژانسم هان داوە نامەکەیان بەرنە لای ئەو بۆ ئەوەی بۆیان بکاتە فەرەنسییەکی رەوان. کە بە گلەییەوە گوتی: "جا خۆ من تۆ ێژەر و نامیلکەنووس نیم. من تەنیا دەتوانم ئەو شتەی ئەوان بە بێسەروبەری نووسیویانە، بە فەرەنسییەکی رەوان بۆیان رێک بخەمەوە. بەڵام یەکێکیان کە هەڕەی لە بەڕەی هیچ شتێک نەدەکردەوە، دەیەویست نامیلکەکەشی بۆ بنووسم." ئیتر زانیم مەبەستی دەماوەندییە  و لە خۆوە دەیەویست خۆیمان لێ بکاتە بەشەر.

دەماوەندیم بانگ کرد و وای بەگژدا هاتم رەنگی بە رووەوە نەما و تاسا. پێم گوت:

"جەنابی دەماوەندی، من تۆ زۆر باش دەناسم. شەش حەوت ساڵان پووڵت لە ئێمە وەرگرتووە و دیارە هەندێ کاریشت کردووە. بەڵام تۆمان نەهێناوەتە ئێرە بۆ سیخوڕی. قەول وابوو دەرس بخوێنی و ببیتە پێشەنگی وڵات. دەست لەو یاری و گەمانە هەڵگرە کە بە دزیی ئێمەوە دەیانکەی و بۆ باوکتیان هەڵگرە. یان لە سبەینێڕا کارت بە کاری ئێمەوە نەبێ، یان برۆ هەر سیخوڕی بۆ بێگانان بکە. تۆ بە رێی خۆت و ئێمەش بە رێی خۆمان. تەواو، هەستە لێرە وەدەر کەوە و ئیتر چاوم پێت نەکەوێتەوە."

گریان ئەوکی گرت. سەیرم کرد دەماریم گرتووە. ئاوێکی ساردم بەسەر بەرزەفڕییەکەیدا کرد. چوومە دەرێ و پاش سێ خولەک گەڕامەوە. کە هاتمەوە فرمێسکی سڕیبوونەوە و سەری داخستبوو.

"خۆ جوان و زەریف سەیری کاغەزەکانی سەر مێزەکەمت کرد! چییان تێدایە بۆ بێگانانی بەرە. پیاو ناکرێ نۆکەری دوو ئاغا بێ."

دیسان دایە گریان.

"قوربان تۆ چیت لە گیانی من دەوێ؟ باشە من چیم کردووە ئاوا هەڵمدەچزێنی؟"

"من تۆ هەڵناچزێنم. تۆ خەریکی فێڵ لە ئێمە دەکەی. ئیتر بەسە."

"من چ شتێکی خراپم کردووە. سەهووم کرد، گووم خوارد. بمبوورن. لەمەودوا بەڵێن دەدەم و سوێند دەخۆم بە گۆڕی باوکم، لە پێناوی خاوەنشکۆدا نەبێ، هیچ کارێک نەکەم."

"بەڵێنەکەتم قەبووڵە. سوێندەکەشت بۆ خۆت."

"من کابرایەکی بە بەزەییم و دەتوانم و دەمەوێ لە هەموو گوناحەکانت خۆش بم، بەو مەرجەی وەشوێن دەرسەکەت بکەوی و تا زووە دکتۆراکەت وەرگری. دیسان هەمان تاس و حەمام. بێگانە وەک زەروو خوێنت دەمژن و تووڕت دەدەن. نیشتمان، نیشتمانە. شاهەنشا قەت پشت ناکاتە وەفادارانی خۆیەوە."

ئەو ئامۆژگاری و هەڕەشانە بێ ئاکام نەمانەوە. خۆی کۆ کردەوە. لە راپۆرتەکانی خانعەلی و ئەوانی دیکەوە دەرکەوت کە پاش ئەو دیدارەی لەگەڵ من لە ماڵەکەی خۆم لە لەندەن، ئیتر نەچووەتە سەفەر و بەردەوام دیتوویانە کە لەو کافترییایەوە هاتووەتەوە وا فەرزان لەوێ شتی دەخوێندەوە و دەینووسی و، ئەمجارە هەوڵی دەدا شێلگیرانە بە یارمەتیی فەرزان نامەی کۆتاییەکەی بنووسێ. ئیتر لای من و خەڵکی دیکەش هەڕوگیڤی بە دژواری و سەختیی پۆلیتۆلۆژی و سایەسەوە لێ نەدەدا.

هەر پار بوو، پاش رۆیشتنی ئاهاری لە رۆژنامەکاندا بڵاو بۆوە، کە کراوەتە سەرۆکی کتێبخانەی پاشایەتی و، ئەویش بەرنامەیەکی نوێی بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەو بنکەیە داڕشتووە و شاهەنشاش قایل بووە بینایەکی تازە لە سەر شێوەی کتێبخانەکانی ئەمریکا دروست بکرێ. هەندێ خەبەروباس لەسەر زیرەکی و وردبینیی ئازمایش لە پارێزگای فارس بڵاو دەبوونەوە و ئەوەی کە لەوانەیە ببێتە سەرۆکوەزیر و زۆر دەنگۆی دیکەی لەو جۆرە، دەماوەندییشیان هان دا تا زووە خۆی بگەیەنێتەوە تاران، بۆ ئەوەی لە کاروانێ جێ نەمێنێ. ئاخری ساڵێک و بڕێک پاش ئاهاری چۆوە تاران و پاش

ئەوەی دوو سێ جار لەگەڵ سەرۆکی ئاژانس لە تاران و لەندەن و پاریس قسەم کرد، لە وەزارەتی زانست کارێکیان بەویش سپارد و ئەویشیان هێنایە مەیدان.

ئەوە مۆرەی دووەمی من بوو، کە جێی خۆی گرت.

زۆر جوان لەبیرمە کە لە لەندەن تووشی سەرۆکی ئاژانس بووم، کاتێ باسی هەڵبژاردنی قوتابییە دەرچووەکان و دانانی ئەوانمان لە شوێنە هەستیارەکان دەکرد، پرسیاری دەماوەندییان لێ کردم:

"ئەرێ تۆ متمانەت بەو گەنجە هەیە؟ باوکی، لاپرەسەنێکی بێ چاوڕووە."

گوتم: "قوربان، خۆت باش دەزانی کە پیاو نابێ متمانەی بە گلێنەی چاوی خۆشی هەبێ. بەڵام شریتی قسەکانم لەگەڵ ئەودا ماون و دەنگەکەش باش هەڵگیراوە. هەر کات پێویست بێ، دەکرێ کە لێکیان لێ وەرگری. بەتایبەتی ئەو بەشەی کە بەڵێنی داوە و.. ئینجا کێ دەوێرێ بە بلوێری ئێمە نەبێ، بە زوڕنای یەکێکی تر هەڵپەڕێ؟"

سەرۆکی ئاژانس پێکەنی و گوتی:

"کارقایمییەکەت قسەی لەسەر نییە."

هەر لەو سەفەرەی لەندەندا بوو کە ئیتر لە هەموو شتێکم دڵنیا کردەوە. پێکەوە چووینە پاریس و کارەکانم یەکلا کردەوە. چەند مانگان نەخشەم بۆ کێشابوو کە بۆ قایلکردنی قوتابییە بێلایەنەکان و شاپەرستەکان و دژبەرانی کۆنفدراسیۆن دەبێ بینایەکی شیاو لە یەکێک لە گەڕەکەکانی نێوەندی پاریس و لە شەقامێکی گرینگ و بەناوبانگ دروست بکرێ، کە ناوەندە ئابووری و کولتووری و رۆشنبیرییەکانی وەک بانکی نیشتمانی و بانکی پیشەسازی و کۆمپانیای فرۆکەوانی و کۆمپانیایی نیشتمانیی نەوت و کۆمپانیای فەرش لەوێ لک و بەشی خۆیان بکەنەوە و خەرجی کرینی زەوی و نەخشە و بینا و رازاندنەوە و جوانکارییەکەشی بگرنە ئەستۆ. ئەو نەخشەیە نزیکەی هەشت ملیۆن فرانکی سویسریی تێ چوو. دەی دیارە ئاژانس سەرەڕای ئەو بوودجە زۆرەی بەدەستییەوە بوو، هەر نەیدەتوانی ئەو گەڵاڵەیە جێبەجێ بکا. دەبوایە ئەو ناوەندانەی باسمان کردن دابینی بکەن. لە جێی ئەوە کرێ و ماڵیاتی زۆریان بە مڵکدارە فەرەنسییەکان نەدەدرا و لێیان خۆش دەبوون. کرینی زەوییەکە بەلایەنی کەمەوە دووسێ ملیۆنێکی دەویست. وەزارەتی دەربار و ئاژانس و سەخشی خاوەنشکۆش بیرۆکەکەیان پەسند کرد. چەند مانگان لە بانکی نیشتمانی و ناوەندە ئابوورییەکان لەسەر ئەو مەسەلەیە مشتومڕ کرا و ئاخری بوودجەکەی دابین کرا.

کۆتایی ساڵی 1353 ئەو بیرۆکەیەی من جێبەجێ کرا و من جۆرێک فێڵ و گزییەکەم رێک خست، کە مڵکەکە بە ناوی سەرۆکی ئاژانسەوە بکرێ، بەڵام نەک وەک سەرۆکی ئاژانس، بگرە بەناوی خۆیەوە. یانی خاوەنی زەوییەکە و ئەو بینایەی هەرگیز دروست نەکرا، جەنابی ... بوو، کە ئێستاش پاش شۆڕش هەر هیی خۆیەتی.

کە پارێزەرەکانی دادگای فەرەنسا تاپۆکەیان پێشان دا، لە پێشدا راچڵەکی و نەیویست ئیمزای بکا. شەوێ پرسی بە من کرد. تێم گەیاند کە وا باشترە بەڕێوەبردن و هەڵسووڕاندنی ئەو بیناجە بەدەست ئاژانسەوە بێ و باش نییە بۆ ئێمە، بیدەینە کۆمپانیا کرێنشینەکان. هەر کات بیناکە تەواو کرا، بە ناوی دەوڵەتی ئێرانی دەکەین. بەڵام ئێستا بە لەبەرچاوگرتنی یاسا و رێساکانی ئەو وڵاتە، بە رواڵەت هەندێ شت رەچاو دەکەین و وەک گرێبەستێکی شەخسیی نێوان فرۆشیار و کڕیاری دادەنێین. تا ئەو بینایە دروست نەکرێ، من وام پێ باشە ناوی جەنابت لە تاپۆکەیدا بنووسرێ. چەند حەفتەیەک ئیمزاکردنەکەی دوا کەوت. هەر رۆژە و چەندهەزار فرانکێک گرانتر دەبوو. سەرۆک چۆوە تاران و هاتەوە لەندەن و پێکەوە چووینە پاریس و بن تاپۆکەم پێ ئیمزا کرد.

بە پێی فەرمانی حەزرەتی شاهەنشا، نامەیەکی فەرمی لە لایەن ئاژانسەوە گەیشتە بەڕێوەبەری ئەو بینایە واتە من، نامەکە هەر ماوە، کە خاوەنی بیناکە دەوڵەتی ئێرانە. لە هیچ دەفتەرێکدا تۆمارم نەکردووە و روونووسەکەشی لەبەر ئەوەی بەشێکە لە نهێنییە زۆر پارێزراوە دەوڵەتییەکان، بە دەست هیچ کەسەوە نییە و خاوەنی زەوییەکە جەنابی ...ـە،

بەو مەرجەی من نهێنییەکە ئاشکرا نەکەم. ئەوە سێیەمین مۆرەی من بوو و، ئەگەر ئەم روقیەیەم لێ نەبوایەتە گونی قۆڕ و ئەو هەمووە بەڵایەم بەسەر نەهاتبایە، هەر خوا دەزانێ چ ژیانێکم دەبوو.

کاری خانعەلی زۆر ئەستەم نەبوو. کوڕێکی بەگوێ بوو. هەر جارێکی بانگم دەکرد، دەسبەجێ و لەکاتی خۆیدا دەگەیشتێ و چیم پێ دەسپارد ورد ورد جێبەجێی دەکرد. جارێکیان داوام لێ کرد هەرچۆنێکی بووە، بەشداری کۆنفرانسی قوتابییەکانی نیشتەجێی ئەڵمان بێ لە دۆسلدۆرف. دوو سێ حەفتە پێش گیرانی کۆنفرانسەکە ئاگاداری کردمەوە کە وەک نوێنەر هەڵیاننەبژاردووە و، ئیتر ناتوانێ بچێتە دۆسلدۆرف. تەوسێکم پێدا دا:

"ئەوە تۆ چ جۆرە قوتابییەکی، کە بەهیچت دانانێن؟ دەبێ هەر بچێتە دۆسلدۆرف."

سێ رۆژ دواتر ئاگاداری کردمەوە کە سەفەر دەکا و رازی بوون بەوەی بەبێ مافی دەنگدان وەکوو میوانێک لە کۆبوونەوەکەیاندا بەشدار بێ. زۆر باش دەرسی خوێندبوو و کاردۆزینەوە بۆ ئەو کێشە نەبوو. ئیدارەی تاپۆ و مڵکەکانیش پشتیوانیی لێ دەکرد. بەبێ رەچاوکردنی رێسا ئاساییەکان، هەڵبەت بە راسپاردەی ئاژانس، کرا بە مامۆستای زانکۆی تەورێز.

لە ماڵاواییکردندا، رێک ئەو یاسینەی بۆ هاوکارەکەیم خوێندبوو، بە گوێی ئەویشمدا دا:

"ئەمە سەکۆی قەڵەمبازی تۆیە. جوان و زەریف چاو و گوێی خۆت بکەوە و بزانە هاوکارەکانت چیان کرد وا جێگە و پێگەیان بەرز بۆوە. هەوڵ بدە بگەیە ئەوان و بگرە بۆڕپیشیان بدەی. ئازمایش و ئاهاری بکە بە سەرباشقەی خۆت. ئاژانس و زاتی پیرۆزی حەزرەتی خاوەنشکۆ هەر هەموو پشتیوانتانن. هەر کات تووشی کێشەیەک بووی، ئاگادارم بکەوە. دەتوانم زۆر کۆسپی سەر رێگەت لابەرم."

هەر باشە، ئەوەش مۆرەیەک بوو، بەڵام نەک وەک ئەوانی دیکە توندوتۆڵ. ئیتر دڵنیا بوومەوە کە بە مرازی خۆم گەیوم. نایشارمەوە، وردە وردە بەسەر ئەو خەم و خەفەتەشدا زاڵ بووم کە لە سۆنگەی روقیەوە بەرۆکیان گرتبووم. پێم وابوو کەس ئیتر ناتوانێ چزووم لێ بدا.

ئەگەر شەوێکی خەونێکم دیتبایە کە ئەوە دەمامکداران لە بیچمی روقیەدا خەریکن وەک دۆڵپا سواری شانم دەبن و وردوپردم دەکەن و شەڵاڵی ئارەقە لە خەو رادەپەڕیم، هەڵدەستام و هەوڵم دەدا بەسەر خۆمدا زاڵ بم. دەچووم سەعاتێک بەو یاداشتانەدا دەچوومەوە کە لەسەر خوشکەکەم بوون و پاش بیرکردنەوە و تێڕامان دەهاتمە سەر ئەوەی لەو لایەنەوە نەک بەرژەوەندییەکانی من هیچ ناکەونە مەترسییەوە، بگرە ئەو لە هیچ کوێ تاوانێکی وای نەکردووە شیاوی راوەدوونان بێ. ماڵی دایکی خۆی بەجێ هێشتووە و رۆیشتووە. چیی تر؟ جارێک ناوی مەرزیەی هێناوە و بازنەیەکیان لە ماڵێکدا دۆزیوەتەوە، وێنەیەکی گوماناوییان بە دیواری شارەوە داوە. جا ئەوە هەر کەس لە قوماشی حاجی عەلی ساوجی بێ، دەتوانێ وێنەی درۆیینە دروست بکا و خەڵکی پێ بخاتە تەڵە و داوەوە. بازنەیەکی هەبووە و فرۆشتوویەتی و دوایی کەوتووەتە دەست تێکدەران. لە هیچ کوێ نەگوتراوە کە روقیە هەوڵێکی دژی بەرژەوەندییە بەرزەکانی وڵات داوە، یان دەستی لە کوشتنی یەکێکدا بووە و دەستوخەتەکەی لەو شەونامانەدا لە دژی شا و دەوڵەت بڵاو کراونەوە، ناسراوەتەوە یان لە نێو گرووپ و تاقمە کۆمۆنیستییەکاندا ناویان هێناوە، یان لە شانە نهێنییەکاندا لەگەڵ یەکێک لە مجاهدین و فیداییان و "جانباختگان" و مارکسیستە ئیسلامییەکاندا ژیاوە. هاموشۆی کۆنفدراسیۆنییەکانی کردبووە و لەگەڵ فەلستینییەکان ساتوسەودای هەبووە. ئاخر چ گوناهێکی کردووە تا من سزاکەی بچێژم؟ بۆچی من دەبێ بترسم؟ لە چی؟ گەورەترین تاوانەکەی ئەوە بووە ناوی مەرزیەی هێناوە، کە گۆیا لە کوشتنی عەقیدەکەی بنکەی سەرکردایەتیدا بەشدار بووە. یانی ئەو بە تەنێ بەزەیی پێیدا هاتووەتەوە؟ ئەو خەیاڵانە بوون ئازاریان دەدام و منیش بە چنگ و ددان بەرەنگاریان دەبوومەوە.

کەواتە، ئەگەر وایە بۆچی خۆی دەرناخا و خۆی نیشانی من نادا و داوای یارمەتی لە من ناکا بۆ ئەوەی ببمە پشتیوانی؟

لەو دوو سێ ساڵەدا کە پاش دیدار لەگەڵ سەرۆکی ئاژانس لە ماڵەکەی بووم و نانی ئێوارەم لەگەڵ خواردووە و لە لەندەن گیروگرفتی جۆراوجۆر بەرۆکیان دەگرتم، چەند جاران بە سەفەرێکی یەک دوو رۆژ، بە دزی و زۆر جاریش بە ئاشکرا دەچوومەوە ئێران و ئەگەر بە پێویستم زانیبایە سەرێکی دایکمم دەدا. پێوەندیی خۆمم لەگەڵ مووسا گیان و لە رێگەی ئەویشەوە لەگەڵ زاوا هەر راگرتبوو. لەو چەند ساڵەدا هیچ سەرەداوێک م دەست نەکەوتبوو کە بکرایە لەوێوە بگەیە ئەو ئاکامەی، ئەوە مەسەلەکەی روقیە خەریکە خەستتر دەبێتەوە و بناغەی ژیانی من هەڵدەتەکێنێ. پاش رێکخستنی کاروباری مۆرەکانم لە ناکاو لە لای مووساگیانەوە کە بەردەوام پووڵم بۆ دەناردەوە بۆ ئەوەی ژیانی دایکم لە خانووەکەی خۆمدا لە نیاوەران دابین بکا، هەواڵێکم بۆ هات، کە زراوی بردم. زاواش، ئەو دەمەی ئاژانس ئەرکێکی پێ نەسپاردبایە ئەوە چاوی بەسەر ئەو ماڵەوە بوو و شەوانە هەر کات بۆی لوابایە لەوێ دەخەوت. مووسا گیان بە تەلەفۆن پێی گوتم: رۆژێکیان چووەتە خانووەکەی من لە نیاوەران و سەیر دەکا دایکم لەوێ نەماوە. زاوا گوتبووی، نیوەشەو دیتوومە پرێسکەیەک و بەرماڵەکەی بەدەستەوە بووە و رای کردووە. کە مووسا گیان چووە لێی پرسیوە، باشە بۆچی خانووەکی ئاوا گەورە و کراوە و خۆشی بەجێ هێشتووە و چووەتەوە ئەو کونەگورگە! گوتوویەتی: وەڵا ئەو خانووە بێ نوێژە و بە پووڵی حەرام کڕدراوە. مووسا گیان دەیگوت: "تەنانەت پێشی نەگوتم کێ ئەو فیتنەیەی ناوەتەوە و لەو باخ و خانووە خۆشەی دەرپەڕاندووە."

مارانگاز لە پەتی رەش و سپی دەترسێ. دیسان خەیاڵات هەڵیگرتمەوە. هەزار فکرم بە مێشکیدا هات. ئەوەشم دەخستە ئەستۆی دژبەران و دوژمنان و ناحەزانی خۆم. دەیانەوێ هەرچۆنێکی بێ ژیانم لێ تاڵ بکەن. ئەو هەواڵ و دەنگۆیانە وایان لێ کردم شەوانە خەونی ناخۆش و ترسناکم دەدی و لە بن بارستایی دۆڵپادا رادەپەڕیم و سەرلێشێواوانە بە ژوورەکەدا دەگەڕام.

بەڵام دەرپەڕاندنی دایکم لە کۆشک و تەلارەکەی نیاوەران تەنیا پێشەنگی ئەو ب ەڵایانە بوو کە بۆسەیان بۆ نابوومەوە. چەند حەفتە دواتر لە پڕدا شێخۆ و چەند سەعات دواتریش فەرزان تەلەفۆنی بۆ کردم کە هەرگیز بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ نەدەکردم. چاوەڕێی بەڵا و مسیبەتێک بووم.

سەرەتاکانی ساڵی 1355 بوو ــ هەموو غیرەتیان وەبەر هاتبوو. دەتگوت مێروو، بە هەتاوی بەهارانە بووژاونەوە و سەر دەردێنن و داوای خواردن دەکەن. لە هەموو شتێک خراپتر، قوتابی غیرەتیان وەبەر هاتبوو ــ هەموو رۆژێ هەواڵی ناخۆش لە سەر بەدفەڕیی کۆمۆنستەکان دەهات و هاودەستەکانیان لە ئەورووپای رۆژئاوادا هەڕوگیڤەکانی ئەوانیان سەد ئەوەندە گەورەتر دەکردەوە و دەرخواردی پیرەپیاو و پیرەژنانیان دەدان و ترسیان وەبەر دەنان. ئەو تەلەفۆنانە تەواو تۆقاندیانم.

هەر ئەوێ رۆژێ کۆنفدراسیۆنییەکان هەڵیانکوتایە سەر کونسولگەریی میونیخ و چەند کارمەندێکیان بە بارمتە گرت و بەڵگەنامەکانیان بردن و وێنەی شاهەنشایان لە دیوار کردەوە دڕاندیانن. رووداوێکی رێک ئاوا لە ئۆفیسەکەی ژنێڤیش قەوما ـ لە واشنگتن هەر حەیاچوون بوو ـ لە بەزم و ئاهەنگێکدا کە باڵیۆزخانە بە بۆنەی جێژنی نەورۆزەوە رێکی خستبوو و تێیدا کۆمڵێک بەرپرسی ئەمریکایی و جێگری چەند وەزارەتخانەیەک بانگهێشت کرابوون، قوتابییەک دەچێتە نێوەندی سفرەی حەوت سینەکە و جنێوی بە هەموو پیرۆزایەتی و بنەماڵەی پاشایەتی دا و نوێنەرانی ئێرانی لە باڵیۆزخانەکاندا بە دەلاڵی بنکە و ناوەندەکانی ئابووری و کارخانەکانی چەکوچۆل ناوبرد و چیی لە زاری هاتە دەرێ پێی گوتن. قوتابییەکی دیکە پەردەی بێشەرمیی پتر لادا و ئابڕووی یەکێک لە ئەکتەرە بەناوبانگەکانی جیهانی کە دەیانگوت کەینەوبەینەیەکی لەگەڵ باڵیۆزی ئێران هەبووە، برد. لە سۆنگەی هەرای قوتابییەکانەوە، میوانەکان کۆڕی خۆشڕابواردنەکەیان بەجێ هێشت و، کە پۆلیسی واشنگتن گەیشتێ، زۆربەی گێرەشێوێنەکان بە یارمەتیی دۆستە رۆژنامەنووسەکانیان بە دەرگای پشتەوەی باڵیۆزخانەدا فیزماڵکیان دایە و بۆی دەرچوون.

هیچ شتێکیش بەسەر قوتابییەکاندا نەشکایەوە. تەنیا بیانووەکی دایە دەست رۆژنامە چەپڕە و راستڕەوەکانی وڵاتانی هاوپەیمان کە رووداوەکانی ئێران بە دڵی کۆمۆنیستەکان بنووسنەوە، بەتایبەتی کە لەو کاتەدا دوو پسپۆڕی ئەمریکاییان لە ئێران کوشتبوو و هەرایەکی نابۆوە هەر مەپرسە.

ئەو رووداوانە و هاندانی رۆژنامەنووسەکان، کۆمۆنیستەکانیشی رۆژ بە رۆژ ئازاتر دەکرد. لە تاران کۆمەڵێک نووسەر و ئەکتەر بیریان لەوە کردەوە رێکخراوێک بۆخۆیان دامەزرێنن و نەچنە ژێر سێبەری کۆمەڵەی نووسەرانەوە، کە دەوڵەت بە یارمەتیی ساواک دایمەزراندبوو و، ئەوانەش بێشەرمیەکەیان گەیاندە ئەو جێیە، کە چەند نوێنەرێکی خۆیانیان ناردە لای سەرۆکوەزیر و داوای ئازادیی رۆژنامەگەری و هەڵوەشاندنەوەی سانسۆریان کرد. لە راپۆرتێکی نهێنییەوە کە سەرۆکی رێکخراو بۆمی ناردبوو، وا تێگەیشتم کە مەلاکانیش کەوتوونەتە جموجۆڵ و لێرە و لەوێ لە قوم و مەشهەد فەقێکانیان دنە داوە بۆ ئەوەی ئەو دروشمانە دووبارە بکەنەوە وا لە جۆزەردانی 1342ـدا دەبیسران. ئاژانس چەند کەسێکیانی گرتبوو و لە زیندانی توند کردبوون. ئەوانە لە تەویلەش هەر وازیان نەهێنابوو و هەموو رۆژێ لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا خەریکی چالاکی بوون. بە دنەدانی ئەوان، کرێکاران لە پاڵاوگەکانی تەورێز و چیمەنتۆسازیی سوفیان و کارخانەی ترۆمبێلسازیی ئێران ناسیۆناڵ، مانیان دەگرت. هێرشکردنە سەر پسپۆڕە سەربازییەکانی ئەمریکا لە ئێراندا خەریک بوو

دەبووە شتێکی باو. زانیاریمان هەبوو کە خەریکە هاوکاری دژبەران و مجاهدین و "جانباختگان" و مارکسیستە ئیسلامییەکان لەگەڵ فەلستینییەکاندا خۆمانەتر دەبێتەوە.

بە کورتی لەو هەرا و هەنگەمەیەدا کە بنیادەم چرکەیەکیش بێ بەڵا و ملۆزم نەدەژیا، تەلەفۆنەکانی شێخۆ و فەرزان موویان لێ کردمە نەشتەر. لەبەرخۆمەوە دەمگوت، دیسان روقیە کەتنێکی کردووە و ئەو جووتەش پێیان زانیوە. یان ئەوەی کە داروەدەستەکەی تیمسار سەرلەشکر گەڵاڵەیەکی تازەیان داڕشتووە تەقڵە بە من لێ بدەن و، ئەوەندەش کەرانەیە کە ئەم پاریسییانەش بیستوویانەتەوە. خۆ فەرزان تەلەفۆنی نەبوو و نەمدەتوانی پێوەندیی پێوە بگرم. پاش دوو سێ رۆژان شێخۆم دۆزییەوە و تاقە زانیارییەکی وەرمگرت ئەوە بوو، کە فەرزانی پەیامێکی بۆ تۆ پێیە و وا باشە خۆت بچی و بیدۆزیتەوە و بزانی چ نوقڵ و نەباتێکی دەست کەوتووە کە ددانی تۆش دەیکا. ئاگادارم کردەوە و تکام لێ کرد کە چونکە من نازانم چۆن پێوەندی بە فەرزانەوە بکەم، کارێکی وا بکا ئەو، جەنابی ملازم ئەمشەو یان سبەی شەوێ درەنگانی شەو تەلەفۆنم بۆ بکا بۆ ئەوەی قەول و قەراری چاوپێکەوتن دابنێین.

سبەی شەوێ لە ناوەندی تەلەفۆنخانەی باڵیۆزخانەوە ئاگاداریان کردمەوە کە ئەفسەرێکی خانەنشینکراوی شارەوانی لە ئەورووپای ناوەندییەوە دەیەوێ دەسبەجێ قسەم لەگەڵ بکا. فەرمانم دا بیخەنە سەر خەتەکەی ماڵەوەم.

لە تەلەفۆنەکەدا دەنگی فەرزانم نەبیست.

گوێم لە دەنگی ژنێک بوو کە دەیەویست لە لایەن یەکێکی دیکەوە قسەم لەگەڵ بکا. پرسیم: "خانم جەنابت کێی و چیت دەوێ؟"

"کاکە، من نازانم جەنابت کێی و پێویستیش نییە تۆ بزانی من کێم. تەنیا پەیامێکە و دەمەوێ پێتی رابگەیەنم. ئیتر من کێم و چیم، پێوەندیی بەتۆوە نییە."

رانەهاتبووم بە تەلەفۆن ئاوام قسە لەگەڵ بکەن. راچڵەکیم. بەڵام ئەوەندە دڵ لەدوا بووم، تووڕەیییەکەمم خواردەوە و بەوپەڕی دانبەخۆداگرییەوە گوتم:

"ببوورە خاتوون. ژمارە تەلەفۆنەکەی خۆتم پێ بدە با من تەلەفۆنت بۆ بکەم."

"ژمارەی خۆم بە کەس نادەم، بۆ بەتۆی بدەم."

لەبەرخۆمەوە گوتم، نەکا ئەوە روقیە بێ. هەر نەبێ یەکێکە لە هاوڕێکانی وی. دیسان بەسەرخۆمدا زاڵ بوومەوە و گوتم:

"زۆر باشە، پەیامەکەت بڵێ."

"ئەوە بوو بە قسە."

چیی نەمابوو دەرهەڵبم. چەند چرکەیەک بێدەنگییەک زاڵ بوو. پێم وابوو ژنە لەگەڵ یەکێک قسە دەکا.

"دەتفەرموو."

"یەکێک لە هاوڕێیانی من، ئەفسەرێکی شارەوانییە و دەیەوێ زۆر خێرا بچیتە لای. پەیامێکی بۆ هێناوی."

"گوتم، ناونیشانی ئەو ئەفسەرە نازانم. چۆن بزانم کێیە و لە کوێ دەتوانم بیدۆزمەوە؟"

وەڵامەکە روون بوو.

"وەرەوە هەر ئەو قاوەخانەیەی ماوەیەک لەوپێش لەوێ چاوت پێی کەوت."

دووقڕانییەکەم کەوت. قسە بڕایەوە. ژنە بەر لە من تەلەفۆنەکەی داخستەوە. فەرزان بوو. بۆ سبەینێ خۆمم گەیاندە پاریس.

خاکەلێوەی 1356 بوو، هێشتا سەهۆڵی هەسێڵەکان لە پاریس نەشکابوو. چوومە باڵیۆزخانە. چەند سەعاتێک پەروەندەی ئێرانییە بەناوبانگەکانم دیواودیو کرد. بە رووی ساواکییەکانمدا نەدا کە خەریکم لە وەزعی فەرزان دەکۆڵمەوە.

هەواڵێکی گرینگ لە پەروەندەکەیدا نەبوو. گۆشەگیرە. هاموشۆی کەس ناکا. زۆربەی شەوان لە کافترییایەکدا دادەنیشێ و کتێب دەخوێنێتەوە و دەنووسێ. ئەگەر یەکێک سەری لێ بدا و جگەرەکێش بێ و خوڵقی بکا، لێی وەردەگرێ. کافترییایەک لەو شەوانەی زستاندا، تا ئەو دەمەی هەوا سارده رێی دەدا. ژنێکی ئێران کافترییاکەی بە ئیجارە گرتووە و خزمی خۆیەتی. کافترییاکە مەکۆی ئێرانییەکانە. سەروسڵاوی لەگەڵ زۆربەیان هەیە، بەڵام برادەریان نییە. شێخۆش دێتە ئەم کافترییایە. هەمیشە خەڵکێکی بە دەورەوەن قسە دەکەن و پێدەکەنن. بە دەنگی بەرز و بەفارسی قسە دەکەن. قسەی قۆڕ و بێتام ناکەن.

پاش نیوەڕۆ تەلەفۆنم بۆ شێخۆ کرد. نەمدۆزییەوە. سەرلەئێوارێ، لە نزیک شەقامی دۆپۆند لە پشت جامخانەی کافترییایەک دانیشتم و، چاوم بڕییە ئەو شوێنەی فەرزانی لێ دادەنیشێ. سەیری سەعاتەکەمم کرد، سەعات حەوت و چارەگ بوو. بە شۆفێرەکەی باڵیۆزخانەم گوت لەگەڵم دابنیشێ و هەر دیتم فەرزان هات، ناردمە شوێنی.

"بەو بەڕێزە بڵێ، ئەو کەسەی چاوەڕێی دەکەی، لەم رستورانتەیە."

سەیرم کرد شۆفێرەکە و فەرزان پێکەوە قسە دەکەن. پێکەوە هاتنە لای من و یەکێکیان ئەویتریانی نیشانم دا. هەوڵم دا هێور بم. لەجێی خۆم هەستام. بە شۆفێرەکەم گوت بڕوا. ت ەوقەم لەگەڵ فەرزان کرد و داوام لێ کرد لەسەر مێزەکەم دابنیشێ پێکەوە نان بخۆین. گوتی:

"وەرە بچین کارەکەمان راپەڕێنین."

"چ کارێک؟"

"پەیامێکم بۆ هێناوی، دەبێ پێتی بدەم."

"لە لایەن کێوە؟"

"جەنابی.. هەڵم مەپێچە. وەڵامی هیچ پرسیارێکت نادەمەوە. من قسە لەگەڵ برای روقیە دەکەم نەک کارمەندێکی دەستڕۆیشتووی ئاژانسی زانیاری و پاراستنی وڵات و سەرۆکی ساواک لە بەریتانیا و ئەورووپا و سەرپەرشتی کاروباری رۆشنبیری و کولتووریی قوتابیان و هەر پۆستێکی دیکەی هەتە کەیفی خۆتە."

سەیرم کرد زۆر بە تڕ و منەتە. کە ناوی روقیەی هێنا، دەتگوت هەم خاترجەمی لە دەنگیدایە و هەمیش دڵەڕاوکێ.

"ناکرێ لێرە دابنیشین و تۆش پەیامەکەت بگەیەنی؟"

لە رستورانت هاتینە دەرێ. لە گۆشەی شەقامەکەی دۆپۆنت و مارۆیوس راوەستاین تا تەکسییەک هات. سوار بووین. ناوی شەقامێکی هێنا کە لە بیرم نەما و گوتی:

"زەحمەت نەبێ تۆ پارەی تەکسییەکە بدە. ئەگەر پارەشت نییە من دەیدەم و دوایی دەبێ بمدەیتەوە."

"خەمت نەبێ پارەم پێیە."

نزیکەی سەعات و نیوێک بە رێوە بووین. جار جار دەمەویست ناوی شەقامەکە لە مێشکمدا راگرم. ناوی شەقامەکان ئەوەندە نامۆ بوون، کە نەمتوانی لە زەینمدا رایانگرم. تەکسییەکە لە جادەیەکی پانوبەریندا کە ناوەکەیم نەدۆزییەوە، راوەستا.

فەرزان لە بەردەم هۆتێلێکی بەشکۆ دابەزی، کە قولەڕەشێک بە جلوبەرگی ئاسایی دەرکەوانانەوە و، بە قایش و قرووش و یەخە و خەتی شینی تۆخ تۆخەوە لەبەردەمی راوەستابوو. قولەڕەشەکە رێزی گرتین و ئەسانسۆرەکە ئێمەی بردە نهۆمی پێنجەم. فەرزان لە دەرگای ژمارە سێزدەی دا. ژنێکی چارشێوبەسەر، کە توند دەموچاوی خۆی داپۆشیبوو،

ئێمەی لە ژوورەکەوە بردە هۆڵێکی گەورە. ژنە کەڵەگەت بوو و دڵنیا بوومەوە کە روقیە نییە. خەیاڵێکی خاو بوو کە پێم وابوایە ئەوە روقیەیە لە بن چارشێوەکەیە. هۆڵەکە تاریک بوو و لە گۆشەیەکەوە چرایەکی کز تیشکی دەپژاند. دوو مۆبل یەک مەترونیوێک لە یەکتر دوور بوون و لەبەردەم چراکە دانرابوون. لە پێشمانەوە تارمایی تەلەفزیۆنێک و شتێکی تر کە دوایی دەرکەوت ڤیدیۆیە، دەبینرا. هەردووکمان لەسەر مۆبلەکان دانیشتین. ژنە چارشێوبەسەرەکە تەلەفزیۆنەکەی داگیرساند. فەرزان بێدەنگییەکەی شکاند.

"جەنابی.. دەبێ بەڵێنم بدەیتێ، هەرگیز نەپرسی ئەم هوتێلە ناوی چییە و کوێیە و هەوڵیش نەدەی ئەو خانمە خانەخوێیەش بناسیت و ئەوەی دەیبینی بە کەسی بڵێی کە چیت دیتووە و چیت بیستووە، نە بە نووسین و نە زارەکییش نابێ هیچ راپۆرتێک بدەیەوە ئاژانسی زانیاری و پاراستنی وڵات. من و ئێمە، بەڵێنی ساواکییەکمان ناوێ، ئێمە تەنیا گفت و بەڵێنی برای روقیەمان قەبووڵە."

"دەتانەوێ چیم نیشان بدەن و چ بڵێن؟"

"قەول وا بوو تۆ پرسیار نەکەی."

"جەنابی فەرزان، من تۆ بە پیاوێکی باش دەزانم و بەڵێنت دەدەمێ."

"زۆر باشە. ئێستا کە بەڵێنت دا، دەبێ شتێکت پێ بڵێم. ئەوەی پێتی دەڵێم هەڕەشە نییە و حەقیقەتە. ئەگەر پێچەوانەی ئەوە بجووڵێیتەوە، نەک من دەکەومە مەترسییەوە، تۆش لە من زیاتر دەکەویتە مەترسییەوە. دڵنیا بە ماڵ و سامان و پۆست و پلەوپایەکەتان، بۆ ئەو کەسانەی ئەم دیمەنەت نیشان دەدەن، بایی پووشێکە. ئەوەش بزانە من تەنیا لەبەر خاتری روقیە لەم کارەدا بەشدار بووم و هیچ پێوەندییەکم لەگەڵ ئەو کەسانە نییە کە ئەم کۆڕەیان پێک هێناوە. هەر بۆ ئاگاداریشت، من لە پێناو بیروباوەڕ و ئیماندا خۆم نەداوەتە بەر تیری ساواک."

لە خۆمم پرسی، ئەی لەبەر چی؟

چیم هەبوو بیڵێم؟ بێدەنگ بووم.

ئەو ژنە چارشێوبەسەرەی تا ئێستا لە پشت سەرمانەوە و لەلای چرا کزەکەوە راوەستابوو، هاتە پێشێ. تەلەفزیۆنەکەی هەڵکرد. ئینجا دەستێکی بە ڤیدیۆکەدا هێنا و دوگمەیەکی دیکەی لێ دا. چەند وێنەیەکی رەش هاتنە سەر شاشەی تەلەفزیۆنە رەنگییەکە و، ئینجا ژوورێک دەرکەوت و لە پڕ قەڵافەتی خوشکەکەم هاتە سەر شاشەکە. خۆی بوو. روقیە بوو. نەک روقیە ئەو روقیە بچکۆلانەی من خۆشم دەویست. واقم وڕ ما. قەت بیرم لە شتێکی وا نەکردبۆوە. دڵم داخورپا. دەستم لەرزی. تەزووەک بە پشتمدا هات...

من کە پێم وابوو سارد و گەرمی رۆژگارم چەشتووە و خاراوم، وەک منداڵێکی ترسنۆک سەرم لێ شێوا. زانیم سەرەڕای سامان و ئابڕوو و دەسترۆیشتنم بەسەر سەدا ساواکیدا و هەستان و دانیشتن لەگەڵ سەرگەورەکان، هەر بەردەستەکەی لای دکتۆر بیژەن و خاتیم. لە هەمبەر گەورەیی و دەسەڵاتی ئەو ژنەدا کە ئێستا چاوی تێوەبڕیوم، بوومەتە کرمێک. سەروقژی خۆی لە لەچکێکدا هەتا تەختی نێوچاوانی داپۆشیبوو و تەنیا بازنەی دەموچاوی دیار بوو. رێک وەک ئەو وێنەیەی بە دیوارەکانی شاریانەوە دابوو. بەڵام ئەویان روقیە نەبوو. چاوی تیژ و درەوشاوە بوون و کاریان لە بەردیش دەکرد. بەژن و باڵا زراڤەکەی لە کراسێکی درێژ و کەمەربارێکدا حەیابەخۆتری دەکرد. دەستی لە پشتەوە لێک هەڵپێکابوو. سینگی هێنابووە پێش وەک بڵێی خۆی بۆ زۆرانبازی یان چەلەحانێیەک ئامادە کردووە، دەتگوت دەیەوێ دەوری گوردئافەرید* بگێڕێ. روخسارێکی گرژی هەبوو نەک بڵێی خۆ دەنوێنێ.

یەکەم قسەی لە زاری دەرهات "براکەم" بوو.

---

- گوردئافەرید: ژنێکی سنوورپارێز لە شانامەی فیردەوسیدا، کە پێش بە زۆراب و سوپاکەی دەگرێ و شەڕێکی ئازایانە لەگەڵ زۆراب دەکا و دواجار کە زۆراب لە عەرزی دەدا و خودەکەی بەردەبێتەوە، جا دەزانێ ئەو پاڵەوانە ژنە، ئیتر نایکوژێ. (و.ک)

"براکەم، چەندەم پێخۆش بوو پێکەوە قسەمان کردبایە. بەداخەوە هاوڕێکانم پێیان باش نەبوو چاوم بە چاوت بکەوێ. تەنیا ڕێگەیان دا خوشکانە یارمەتیت بدەم و لەو مەرگەساتە ڕزگارت بکەم. گوناحت زۆرە، گوناحی وا نەکرێ لێی خۆش بی. خوا لێت نابوورێ. بەڵام خوا ڕەحیمە. هێشتا ڕێگەیەک هەیە بۆ داوای لێبوردن..."

نەمتوانی هەرچی دەیڵێ پاتەی بکەمەوە. دەمویست خاڵە گرینگەکانی یاداشت بکەم. فەرزان کە لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، نەیهێشت. هەوڵمدا لە زەینمدا خەزنیان بکەم. دەکرا سەعات و نیوێک لۆمە و سەرکۆنەی ئەو بە زەینم بسپێرم؟ ئەوەی لە بیرم ماوە ئەوە دەگێڕمەوە:

"گفتوگۆمان پێکەوە نییە. من قسە دەکەم و تۆیش دەبیسی. ئەگەر کار کەوتە دادگا، گوێمان لە هەموو قسەکانت دەبێ. خوا ئەو ڕۆژە بە نەسیبی من و تۆ نەکا. من نایەمە ئەو دادگایەی تۆ مەحکووم دەکات. هەر قسەیەکی لەم ژوورەدا بیکەیت تۆمار دەکرێ و لەوانەیە ڕۆژێک بەسەرتیدا بدەنەوە. کەوابوو من قسە دەکەم و تۆیش بیسەریت."

بەردەوام دەهاتەوە سەر ئەوەی کە دەست لەو ئیشە شەیتانییەت هەڵگرە.. ئەوە سەروبنی قسەی بوو.

"داوای لێبوردن بکە. لەگەڵ ئێمە بە. دەبێ سزای خراپەکانت ببینی. تا زووتر بێ باشتر..."

ئەوە ڕوقەیە نەبوو کە تەوس و توانجی لێ دەدام و ئەمری دەکرد. دەتگوت کەسێکی دیکە ئەم قسانە دەخاتە زاری خوشکەکەمەوە.

چەندیان بوختان بۆ هەڵبەستم؟

"دەیان کوڕ و کچ و پیاوماقووڵ و پیرەپیاوی موسوڵمان لەبەردەستی تۆدا ئەشکەنجە کراون. سەدان کەس خۆیان لەبەر ئەشکەنجەکانتان ڕانەگرت و مردن."

دەمویست هاوار بکەم "درۆیە. من کەسم ئەشکەنجە نەداوە."

فەرزان ئاماژەی کرد بێدەنگ بم. "گوێ بدەیە بزانە دەڵێ چی."

دەوڵەمەندییەکەمی بەچاومدا دەدایەوە. پووڵ و سامانەکەم لە بانکەکاندا.

"چەند جارانم ئاماژە پێدای کە ئاگام لێتە. گوێت نەدامێ. بنەماڵەکەتت چارەڕەش کرد. منداڵەکانت ئاوارە بوون. دایکمان عومرێک لە ترس و دڵەڕاوکێ و خەم و خەفەتدا ژیا. تۆ قاتڵی ئەوی. بۆچی خانووەکەیت لە سەر ڕێی کەلانتەر کاول کرد؟ بۆچی دەربەدەرت کرد؟"

"ئینجا دیسان ئامۆژگاری و هەڕەشە، کە لە کەری شەیتان وەرە خوارێ و قسەی ئاوا. وەرەوە سەر ڕێی ڕاست. هێشتا درەنگ نەبووە و هاوکاریمان بکە."

"چیی بەدبەختی و ئاوارەیی و دەربەدەریی منە، خەتای تۆیە. ئەوە ئێستا دەرفەتت دەدەمێ پەشیمان ببیتەوە."

ئاگاداری هەموو خراپەکارییەکانمە. دەزانێ لە دادگای مجاهدین و فیداییەکان و مەلاکاندا چ دەورێکم گێڕاوە. دەزانێ چۆن لە ئەورووپا لاوانم لە خوێندن گێڕاوە. پاسپۆرتەکانیانم ڕاگرت و بە پارە چەواشەم کردن. باش دەزانێ چۆن جەنایەت و تاوانەکانی شا و دەربار و تاڵانی زەوی و زاری ڕەعیەتەکانم لە مازەندەران و گیلان و نیاوەران دیزەبەدەرخۆنە کرد.

باشە تۆ نازانی و بەچاوی خۆت نەتدی کە سە رلەشکر لە کاتی ئەتککردنی کچە پاکیزەکاندا خۆی ڕادەوەستا و ئەو کارە قێزەونانە لە بەردەمی ئەو ئاسایی و ڕێگەپێدراو بوون؟"

دەیگوت ئاگاداری کەینەوبەینی نێوان من و دەسەڵاتدارانی وڵاتیشە.

"ئەو ژنە بیستوپێنجساڵانەت لەبیرە لە زیندان ڕای کرد؟ چەندیان ئەشکەنجە دا، سووکایەتیان پێ کرد. براکەیان کوشت و ئاخرییەکەی کە جەلادەکان باشاریان نەکرد، تۆ چوویە لای کە ئامۆژگاریی بکەی. مەبەستت ئەوە بوو خۆی بەدەستەوە بدا."

کوشتنی گەنجێکیان دەخستە ئەستۆی من، کە جەلادەکان کوشتیان و وایان بڵاو کردەوە کە لە کاتی راکردندا کوژراوە.

"باشە ئەو سەید موحسینە مجاهیدەتان بۆچی کوشت؟"

درۆی شاخداریان دەرخوارد دابوو و ئەویش بەبێ ئەوەی بزانێ، بڕوای کردبوو و پاتەی دەکردنەوە.

"هەمووتان باش دەتانزانی کە شا و وەزیرەکەی بەبێ ئیجازەی ئەمریکییەکان ناتوانن ئاویش بخۆنەوە و ناویشیان ناوە ناسیۆنالیزمی باش. نەیاندەزانی ئەوە ملیۆنان دۆلاری بەرهەمی رەنجی ئەو خەڵکە لە ئەمریکا و ئەفریکا بۆ بانگەشەکردن بۆ شا بەفیڕۆ دەچێ. ئاخر لە ئەفریکا گەڕەکتان بۆچی و بۆ کێ دروست دەکرد؟"

چیی لە زاری دەرهات پێی گوتم. شتی وای دەدامە پاڵ، هەر رۆحیشم ئاگای لێیان نەبوو. باشە کوژرانی کوڕی مەلاکەی لە ئێراق بۆ دەخستە ئەستۆی من؟

چارەگی کۆتایی، سزاکانمی باس کرد. دەست لەو کارەم هەڵگرم. ئەوەی لەو 17 ساڵەدا ئەزموونم کردووە بینووسمەوە و بیخەمە بەردستی کۆنفدراسیۆن. لە ئەورووپا و ئەمریکا نەمێنمەوە. بچمە یەکێک لە وڵاتانی باشوور یان هیندوستان. ئەم وڵاتە هەر لە کۆنەوە پەناگەی ئێرانییە راکردووەکانە. هەموو سامانەکەی خۆم پێشکەشی موستەحەقەکان بکەم. تا زووە سەدهەزار پاوند بدەمە "جانباختگان".

"سامانەکەشت لە ئێران، خۆمان دەستی بەسەردا دەگرین."

پێیان وابوو من ملیۆنەرم و هەر دەست لە گیرفانم بنێم دەتوانم سەدهەزار پاوندیان بدەمێ. لە ئەمریکای باشوور یان لە هیندستان "جانباختگان" ژیانی من دابین دەکەن.

"بەو مەرجەی بەگوێ بم و خزمەتکاری خەڵکی موسوڵمان."

دوایین رستەکانم باش لە بیر ماون:

"من روقیەم و تۆش برامی. خۆشم دەوێی. خۆشم دەویستی و ئەم پەیامەشم بە خوشک و برایەتی بۆ هێناوی. بەڵام تۆ دوژمنایەتیت لەگەڵ ئێران و ئیسلام هەیە. ئەگەر بە قسەمان نەکەی، دەبێ سزاکەی وەرگرییەوە. لە ئاگری دۆزەخدا دەبێ بسووتێی. هەر لەم دنیایەدا زەجرت دەدەن و ئیتر من هیچم لە دەست نایە، ئەوەی پێویست بوو پێتی بڵێم ئەوە گوتم..."

تەلەفزیۆنەکە کوژاوە. بە عەرزەکەوە رەق ببووم. لاقم تەزی بوون. نەمدەتوانی باسک و پیلم بجووڵێنم. ژوورەکە هێشتا تاریک بوو. ژنە چارشێوبەسەرەکە شریتی ڤیدیۆکەی دەرهێنا. خستییەوە نێو ئەو توورەکە چەرمینەی بەدەستییەوە بوو و چووە دەرێ.

فەرزان هەستا و چراکانی هەڵکرد. من سەرم داخستبوو. نەمدەزانی چ بکەم.

تەنیا شتێک لە مێشکمدا دەهات و دەچوو. لەگەڵ کێ تێکەوتووم؟ لەگەڵ ژنێکی نەزانی دەمارگرژ کە سەردەمانێک خوشکم بووە؟ کە ئەویش نەک هەر داوای ماڵ و سامانەکەم دەکا، بگرە دوژمنی گیانیشمە؟"

فەرزان بن پیلمی گرت. هەڵیساندم و بەرەو دەرگای ژوورەکەی بردم. چراکەی کوژاندەوە و دەرگاکەی پێوە دا. هیچ قسەیەکمان نەکرد. چووینە ئەسانسۆرەکەوە و لە هوتێلەکە هاتینە دەرێ.

لەبەردەم هەیوانی هوتێلەکەدا چەند تەکسییەک چاوەڕێی مسافیر بوون. فەرزان پرسیی:

"دەتەوێ بتگەیەنمە کوێ؟ ئەی دەتەوێ بەتەنێ بڕۆی؟ ئەگەر وابێ ماڵاواییت لێ دەکەم."

سەیرێکیم کرد، نیگایەکی پڕ لە پاڕانەوە و تکا، کە یانی لەو وەزعەدا دەتەوێ بەجێم بێڵی؟

دیتم زۆر مات و ناڕەحەتە. غیرەتم هاتە بەر و پرسیم:

"جەنابی فەرزان، با بچینەوە کافتریاکەی شەقامی دوپۆنت و نانی ئێوارە پێکەوە بخۆین. هەر وای دانێ کە من هێشتا برای روقیەم."

چیی نەمابوو فرمێسکم بێنە خوار. دانم بە جەرگی خۆمدا گرت و نەمهێشت هەست و سۆز بەسەرمدا زاڵ بێ. دیار بوو بەزەیی پێمدا هات.

سواری تەکسی بووین و چووینەوە کافتریاکەی دەمەوئێوارە. لە گۆشەیەک دانیشتین. داوای خواردنمان کرد. پرسیم: "حەزت لێیە پێکێک شەراب پێکەوە هەڵدەین؟"

فەرزان سەری داخست. بێدەنگ بووین. یانی هیچ قسەیەکمان نەبوو پێکەوە بیکەین؟ خەیاڵێکم لە زەینی گەڕا. وەختانێکم وەبیر هاتەوە کە لەگەڵ روقی ە و دایکم لە شەقامی کەلانتەر پێکەوە دەژیاین و تازە لە سەفەری لەنگەی هاتبوومەوە و بێکار بووم و روقیە لەگەڵ ئەم کابرایەی ئێستا لە تەنیشتمەوە دانیشتووە لە فرۆشگا کاری دەکرد. دایکم دەیگوت، ئەو کابرایە روقیەی دەوێ، بەڵام کچەتیوە خۆی مل نادا.. پاش مێردکردنەکەی یان دووگیانبوونی روقیە بوو.. لەپڕ نەخش و وێنەکان رەوینەوە.. خزمەتکارەکە مینایەکی نیوەی هێنا و شەرابی لە پیاڵەکانمان کرد و من پێکی خۆم هەڵێنا و چاوم لە چاوی فەرزان بڕی، بە پاڕانەوە و تکاوە. ئەو تکا و داوایە چەند چرکەیەکی خایاند. ئەویش پیاڵەکەی خۆی بەرز کردەوە و من گوێم لە زرینگەی دوو جام و دەنگی هاوڕێکەم بوو کە دەیگوت: "بە خۆشیی روقیە." و لە پڕ لە خەوێکی قووڵی پڕ لە خەونی شیرین بەخەبەر هاتم.

"چ بکەم جەنابی فەرزان؟"

"هەر کەسە و خۆی قیبلەی ماڵی خۆی دەزانێ."

"من دەستم لە کوشتنی کەسدا نەبووە."

"من قازیی تۆ نیم. قازی تۆ ئەو کەسانەن کە لە شاشەکەدا یەکێکیانت دی. دەبێ وەڵامی ئەوان بدەیتەوە."

"من کەسم ئەشکەنجە نەداوە."

"بەڵام کە ئەوانی دیکە لەبەرچاوت بێتاوانەکانیان ئەشکەنجە دەدا، هیچ هەوڵت نەدا پێشیان بگری."

"ئەتۆش خەریکە شیعرەکانی ئەوان دەخوێنیتەوە. ئەی نەتگوت تۆ هاوڕێی ئەوان نی؟"

"بەڵام وەختێک غیرەت و ئازایەتیی ئەوانم دیت، ئیتر چۆن بتوانم بێلایەن بم؟"

"ئەی هیچ بارودۆخی من لەبەرچاو دەگرن؟"

"ئیتر."

"ئیتر چی؟"

"پارە و دەسەڵاتت پێ شیرین و خۆش بوو و رۆژ بە رۆژ پتر رۆچووی."

"ژیان لە شەقامی کەلانتەر ئەستەم بوو و حەزم لێ بوو لە هەوایەکی ئازاددا بفڕم."

"جا ئەلێرەوە دەست پێ دەکا."

"چ لێرەوە دەست پێ دەکا؟"

"هەرچی بەسەرت هاتووە و دێ."

"تۆ دەڵێی قازیی من نی و خەریکیشی دادگاییم دەکەی."

"تۆ خۆت خەریکی خۆت دادگایی دەکەی. ئەی نەتگوت حەزت لێ بوو لە کەشێکی ئازاددا بفڕێت؟"

"ئەگەر بەختیار هاتبایەتە سەر کار، تۆ بۆ دژبەرەکانی لە ئێمەمانان باشتر دەبووی؟"

"لەوانەیە؟"

"تۆش هەر ئەو رێیەت دەگرتە بەر، کە من گرتم؟"

"نازانم، ئەگەر غیرەتم بوایە لە نیوەی ڕێ دەگەڕامەوە."

"من بەردەوام هەوڵم دا بگەڕێمەوە، بەڵام ڕووداوەکان لە من بەهێزتر بوون. بەڵام بە دەستی من، کەس خوێنی لە لووتی نەهاتووە."

"سەلەشکەریش هەر دەڵێ لە ژیانیدا شەپلاخەیەکی لە ڕوومەتی کەس نەداوە."

"من بە هاوشان و هاوکاری سەرلەشکر دەزانی؟"

"نەمویست پێکتان بگرم. بەڵام هەتا دکتۆر بیژەن و جیهانگیر و ئازمایش و دکتۆر فەرید و خاتی هەبن، چ پێویست دەکا سەرلەشکر دەستی خوێناوی بێ؟ ئێوەش بەشێک لە کارەکانی ئەوتان لە ئەستۆ بووە."

قسەی هەق ئاو رادەگرێ. چەند ساتێک قسەمان نەما.

"قەت سەد هەزار پاوندم نەبووە. ئەگەر ئەوەی هەمە بیدەم، لە تاوانەکانم خۆش دەبن؟"

"جا خۆ من قازیی تۆ نیم. ئەگەر من بایەم دەمگوت نا. جگە لەوە، تۆ هەرکات حەزت لێ بێ دەتوانی ئەو بڕەپارەیە لە سندووقەکە دەربێنی و بیدەیە خاوەنەکانی خۆی."

"چیتان لە گیانی من دەوێ."

" من هیچ شتێکم ناوێ، جگە لەوەی ئەم ڕووداوەی ئەمڕۆ لەبیر بکە. لە خوشکەکەت بپرسە چیی لێت دەوێ."

"ئەو شریتەم دەدەنێ؟"

"شریتەکە بە من نییە. ئێستا بە دڵنیاییەوە سووتاندوویانە بۆ ئەوەی نەکەوێتە دەست کەس."

"تۆ خۆت ڕوقیەت دیتووە؟"

"قەول بوو لەو بوارەوە پرسیارم لێ نەکەی."

"ئەی خوشکەکەمت خۆش دەوێ؟"

"مەپرسە."

"وەڵامەکەم وەرگرتەوە. من چەندەم لە توانادایە، چەکێکتان دەدەمێ، بەو مەرجەی ڕوقیە ببینم. ئەگەر هاوڕێکانی دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە بتوانن لە بنج و بناوانی کاروبارەی من بگەن، کەوابوو نابێ ڕێکخستنی دیداری من و خوشکەکەم بۆ ئەوان کارێکی ئەستەم بێ."

"برا.. تۆ هێشتا ساواکیی. متمانەیان پێت نییە."

"ڕاست دەکەی."

تاوێک ئارام دانیشتم. فەرزان ورد ورد چاوی بەسەر جووڵە و هەڵسوکەوتی منەوە بوو. ئینجا پێم گوت:

"زانیارییەکانی تۆ..."

قسەکەی پێ بڕیم:

"من هیچ زانیارییەکم لە کاروباری تۆ نییە."

وەڵامم داوە: "مەبەستم زانیاری لەسەر هاوکارانی ڕوقیەیە. ئەوەی ئەوان دەیخەنە ئەستۆی من، لەگەڵ ڕاستی یەک ناگرنەوە."

"دڵنیای؟"

"دڵنیام."

"ئەو چیرۆکەم دێتەوە بیر کە یەکێک لە برادەرەکانم بۆی گێڕاویتەوە ـ قوتابییەک بوو بەناوی مەرزییە..."

"من ئەوم ڕزگار کرد."

"ئەوەم نەدەزانی. بەڵام چەند ساواکییەک بە دادۆشینی بنەماڵەکەی و بە بەرتیلێکی زۆر ئازادیان کرد. کچە قوتابییەکە تۆمەتێکی قورسی خرابووە ئەستۆی. بە دڵنیاییەوە لە هەر کام لە جەللادەکان بپرسیت کە ئاخۆ تۆ ئەوت کوشتووە، سوور هەڵدەگەڕێ و دەنەڕێنێ و ئەو قسەیە بە تۆمەتێکی بێ بنەما دادەنێ. لەوانەیە..."

قسەم پێ نەبڕی. دڵنیا بووم کە شێخۆ ئەو ڕووداوەی بەو جۆرە گێڕاوەتەوە کە بە سوودی خۆی بووە. لێی گەڕام هەمووی بگێڕێتەوە.

"لەوانەیەو ئەو ساواکییانە هەقیان بێ. بەڵام ئەوان بەبێ ئەوەی بیانەوێ و بزانن ئەو قوتابییەیان بەدەست چوو. ڕزگاربوونی ئەو کچە لە سۆنگەی سەرمایەی باوکییەوە چاوقایمتری کرد و جارێکی دیکەش هاتەوە مەیدانی خەبات و بەردەوام لەوە دڵنیا بوو کە بە سامانەکەی باوکی دەتوانێ ڕزگار ببێتەوە، نەیدەزانی ئەو جەستە لەڕ و لاوازەی ئەو، بەرگەی ئەو بارە قورسەی نەدەگرت کە خستبوویانە ئەستۆی و خۆی ناگرێ. جاری دووەم باوکی هەموو دنیا گەڕا بەشکم یەکێکی دەست بکەوێ کچەکەی بۆ ڕزگار بکا. بەڵام دەم لەپووش ما. کچە لە زیندان و لە بن ئەشکەنجەدا مرد. مەسەلە ئەوەیە: کێ بکوژی مەرزیە بوو. ئەوەی یەکەم جار لە زیندان ڕزگاری کرد، لە حاڵێکدا لەوانەبوو زۆر نەبا ڕزگار بێ، چونکە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبوو، یان باوکی کە پێی وابوو بەرتیل هەموو گرێکوێرەیەک دەکاتەوە، یان دەزگا شەیتانییەکەی ئێوە..."

"جەنابی فەرزان خەریکی لە بنی کوولەکەی دەدەی. ئەو هەمووە شێروڕێوییەی بۆ چییە؟ ئەگەر وا بوایە وا دەبوو."

"مەسەلەی مەرگ و ژیانە. باسی لەناوچوونی میللەتێک و کاولبوونی وڵاتێکە. هەر ئەو کوولەکانەن کە وەک مۆرانە لە ناخەوە بینایەک دەخۆن و هەتا هەموو تەلارەکە دانەڕمێ کەس نازانێ کارەساتەکە چەند قووڵە و دواییش هیچ کەس تاوانەکە ناگرێتە ئەستۆی خۆی."

"من لەو بەڵگاندنانە تێناگەم."

"بە داخەوە تۆ و هاودەستەکانت قەت ئەهلی بەڵگاندن نەبوون."

چیم گوتبایە؟ کابرایەکی خوێندەوار و ئەهلی کتێب بوو ـ دنیایەک ئەزموونی هەبوو. بەو حاڵەشەوە هیچی بە گوێیدا نەدەچوو، قەمچیی واقعیەتی نەچ ەشتبوو و نەیدەزانی چارەنووس چەندەی گەمەی جۆراوجۆر و ڕەنگاوڕەنگ لەبن سەریدایە، کە سیحر لە بنیادەم دەکا. خۆی دوورەپەرێز ببوو و قانع بوو و بە کاری تاقەتبڕ ژیانی خۆی دابین دەکرد و پارەی ئەوەی نەبوو جگەرەیەکی پێ بکڕێ و ژوورەکەی گەرم دابێنێ.

دەرەقەتی ئەو نەدەهاتم. جارێکی دیکە دەستم بە دیواری ئەو بیرەوە گرتەوە کە تێی کەوتبووم و خەریک بوو ڕۆدەچووم. بەشکم پاش ئەو تەنگانەیە فەرعانەیەک هەبێ.

"جەنابی فەرزان، جوابی پرسیارەکەت نەدامەوە."

"قەول وا بوو تۆ هیچ نەپرسی . من هیچ کارە نیم. ئەگەر بۆ ئەم کارەش کە مەترسیی بۆخۆم هەیە بەشدار بووم، لەبەر ئەوەندە خۆشەویستییەی ڕوقیەیە کە لە دڵمدا چاندوویەتی. ئەو داوای کردبوو من ببمە نێوبژیوانی گەیاندنی ئەو پەیامەی کە هەر نەمدەزانی چییە. من قەت ڕوخساری ئەو ژنەم نەدیتبوو کە ئێمەی بردە ژووری هوتێلەکە و قەتیش نایبینمەوە. ئیتر خەریکە درەنگ دەبێ. من دەبێ بچمەوە ماڵەکەی خۆم. ئاوارەیەکی دیکەم داڵدە داوە و بە هەردووکمان کلیلێکمان پێیە." خەریک بوو هەڵدەستا.

ئەگەر ناتەوێ وەڵامی پرسیارەکەی من بدەیەوە، هەر نەبێ ڕای خۆتم پێ بڵێ."

"پرسیارەکەت چ بوو؟"

"ئەگەر ئەو چەکە بدەم، دەتوانم چاوم بە ڕوقیە بکەوێ؟"

"من چ بڵێم؟ بڕیاردەرەکە ناناسم. ئەزموونی من ئەوەیە کە ئەو لەخۆبوردووانە یان خۆیان واتەی گیانلەسەردەستانە (جانباختگان)، سەر بۆ هیچ شەرت و مەرجێک دانانوێنن."

"ئەی چ بکەم؟"

"رۆژێکیان ئەم پرسیارەت لە من کرد. ئەودەم پێم وابوو روقیە کەوتووەتە مەترسییەوە. بۆ رزگارکردنی دەستەوداوێنی تۆ بووم و گوتم بچۆوە ئێران و تۆیش چوویەوە و قیت و قنج و بە شانوشکۆیەکی زیاترەوە گەڕایتەوە. بەڵام ئێستا ئەوە خوشکەکەت قسەی لەگەڵ کردووی و لە مەترسیدا نییە. تۆی لە مەترسیدای، ئیتر خۆت باشتر دەزانی."

هەستا و تەوقەی کرد و رۆیشت.

تۆزێک شەراب لە میناکەدا مابۆوە، تێم کرد و چاوم بڕییە رەنگە ئاڵەکەی ـ کە لە ناکاو شۆفێرەکەی باڵیۆزخانە لە بەردەمم قوت بۆوە.

"ئەوە بۆ لێرەی؟"

"لە ئێوارێوە لێت دەگەڕێم. کە ئیتر هیوا بڕاو بووم، هاتمەوە ئەم کافترِیایە کە پێکەوە هاتبووین. بەو هیوایەی ئەو برادەرە بدۆزمەوە. بە رێکەوت لێرە تووشی تۆ بووم."

"چ باسە؟"

"لە بەیانییەوە بە تەلەفۆن لە لەندەنەوە بانگت دەکەن."

شڵەژاو لە جێی خۆم هەستام. حیسابی خزمەتکاری رستورانتەکەم دا و سواری ترۆمبێلەکەی باڵیۆزخانە بووم. یەکەوڕێ چوومە باڵیۆزخانە و تەلەفۆنم بۆ تاران کرد. دەسبەجێ خستیانە سەر هێڵی سەرۆکی ئاژانس. لە ماڵەکەی خۆی بوو. لە پێشدا گوێم لە دەنگی هاوسەرکەی بوو و دوایی خۆی هاتە سەر خەت.

"دەمویست پێش خۆم پیرۆزبایی لە تۆ بکەم ــ بە پێی ئەمری خاوەنشکۆ، تۆ لەمڕۆوە جێگری منی، پیرۆزباییت پێ دەڵێم. تا زووە وەرەوە و کاروبارەکەت رێک بخە. هەر ئەمڕۆ فەرمانەکەیان بە ت لێگراف پێ راگەیاندم کە تۆ کراویتە جێگری من ـ لە وەزارەتی دەرەوەشڕا بە باڵیۆزی مەزنیان راگەیاندووە، ئەرکی نوێنەرایەتیی رۆشنبیری لەسەر شانی جەنابت لابەرێت.

شاهەنشا شێوەی کارکردنی ئاهاریی لە رێکخستنی کاروباری کتێبخانەی پاشایەتی زۆر بە دڵە و وەختێک جەنابیان ئاگادار کرانەوە کە ئەم برادەرە دەسپەروەردەی جەنابتە و لە ژێر چاوەدێریی تۆدا دەرسی خوێندووە، تۆی کەوتە بەردڵ و ئەمریان فەرموو کە بەرپرسیارەتییەکی گەورەترت بخرێتە ئەستۆ..."

ماوەیەک تەلەفۆنەکەم هەر دانەنا.

سەعاتێک پتر دانیشتم و بیرم کردەوە. نەمدەتوانی دەستم لە سەر تەلەفۆنەکە هەڵگرم، نەکا لێ بدا و دیسان ئەمر و فەرمانەکانی روقیەم گوێ لێ بێ.

چارەنووس چ گەمەیەک بە بنیادەم دەکا. دەستێک جامی بادە و دەستێک زولفی یار.

ئەی لەو ژیانە کارەساتبارەی هاوڕێیانی روقیە بۆیان داناوم. لە کاولاشێکی ئەمریکای لاتین لە کووبا و یان بەنارەس هەڵکورمێی و ببیتە بەرماوخۆری کەسانێک، کە هیچ کەس نازانێ لە کام گۆڕەوە سەریان دەرهێناوە. هەر دەزانن کچی ساویلکە و خاو و خلیسک بخەڵەتێنن و بە دەردی خۆیان لە کڵ بیانهێننە دەرێ و لە خەڵکیان بەربدەن. ئێوها دەیانەوێ چارەنووسساز بن. ئەی لەو ئازایەتییە. ئەوانە دەیانەوێ پادشایەتیی دووهەزارو پێنجسەدساڵەی ئێران برووخێنن. ئەی لەو درۆیانەی بۆ بنیادەمی هەڵدەبەستن. ئەم هەواڵە راست و درۆیانەیان لەکوێ هەڵبەستووە؟ بنیادەم وەشک دەکەوێ. نەکا دزەیان کردبێتە نێو دەزگاکەی خۆیشمانەوە. وەک چۆن من لەگەڵ شێخۆ و فەرزان و خوشکەکەم پێوەندیم هەیە.

لەوانەشە حاجی عەلی ساوجی و تیمسار سەلەشکر و تەنانەت سەرۆکی ئاژانسیش کەینەوبەینەیەکیان لەگەڵ ئەو دۆڕاوانە هەبێ و نهێنییە زۆر شاراوەکان بەو هەرچیوپەرچیانە بڵێن.

روقیە جۆرێک قسەی دەکرد وەک بڵێی لە خوایش بێمنەتە. باسی سزا و عەزابی بەژانی دەکرد. وەک بڵێی سەرەداوێکیان دەست کەوتووە و دەسەڵاتیان گرتووەتە دەست.

چما ئەقڵ دەیبڕێ حکوومەتی پاشایەتی بڕووخێ و دەسەڵات بکەوێتە دەست کەسانێک، کە کەس نازانێ گوجوولەی چ سەیەکن؟

باشە بێت و تاڵەمووچەک لەسەری شا کەم بێتەوە چ زیانێک بەمن دەگا؟ بەو چەند قەرەپووڵەی پاشەکەوتم کردووە، دەتوانم لە سکۆتلەند و میامی و کالیفۆرنیایش بژیم، دەی بۆ بچمە بنارەس؟ پووڵی خۆم بدەمە کێ کە دوایی گاڵتەم پێ بکا و هەڕوگێڤم بەسەردا لێ بدا؟"

دڕدۆنگی دڵکرمۆڵی دەکرد. هەر زەبرێکی بەر سینگم دەکەوت، هەستم دەکرد قورسایییەکەی بەولایەدایە کە نەقدە. چۆلەکەیەکی گیرفان، سەدی سەر چڵووکانی بەقوربان بێ. دەیگوت چی؟ ئێوە پیاوی بەڵگاندن نین. ئەی چەند جوانی لێ دەزانم.

قسەی قۆڕی دەکرد ، تۆ دوژمنایەتیت لەگەڵ ئێران و ئیسلام هەیە. بە پێچەوانەوە من خزمەتی ئیسلامم کردووە. هەموو ئەوانەی زیانیان لە من دیتووە، کافر بوون. ئەو رۆژەی مامۆستاکانم لە بەندەکەی زانکۆ ئازاد کرد، خزمەتم بە ئیسلام و دین نەکرد؟

پەروەردەکردنی ئاهاری و خان عەلی و دەماوەندی، کە ئەگەر فریایان نەکەوتبایەم، دەبوونە کۆمۆنیست، ئەی ئەوە خزمەت بە ئیسلام نەبوو؟ سیخوڕی لە حیزبدا کە هەر هەموویان زوڕنایان بۆ رووسەکان لێ دەدا خزمەت بە ئیسلام نەبوو؟ ئەی سزادانی تەیمووری بەختیار لە سەر فەرمانی خاوەنشکۆ کە دەیەویست حکوومەتی خوونکاری لە ئێراندا دامەزرێنێتەوە، چ بوو؟ تاوانی من چ بوو، کە کێرلەسەردەستەکانی تیمسار سەرلەشکر دەیانەویست بچنە زگ ژنانی زیندانی؟ ئەوکات کوژرانی کوڕەکەی مەلاشیان دەخستە ئەستۆی من.

نەقڵیان زۆرە. جا چەندیش چاوەڕوانی؟!

ئەوەی لەو 17 ساڵەدا دیتوومە، بێت و بینووسمەوە تا کۆنفدراسیۆنییەکان لە رۆژنامەکانیاندا بڵاوی بکەنەوە؟ نا، ئەوە بە من ناکرێ. ژنەتیوە لە زیندان‌دا چ شیعرێکیشی دەخوێندەوە: بڕۆ داوت بنێوە بۆ یەکی تر....

فکر و خەیاڵ شەپۆل شەپۆل دەهاتن و دەچوون. جێگرییەکەی سەرۆکی ئاژانسم لەگەڵ گۆشەنشینی لە کووبا و بنارەس پێک دەگرت و سەنگوسووکم دەکرد. هەموو رۆژێ چاولەدەست، چاوەڕوانی تۆز قاڵێک بەشەخواردن و وەسواڵکەوتن لەلایەک و چێژوەرگرتن لە نیعمەتەکان و چێژوەرگرتن و چوارناڵەتاودان بە سواری دەسەڵات، دوو جەمسەری دژیەکی چارەنووسی من بوون. رێگەی نێوەند، نە لەمەوە دیار بوو نە لەویشەوە. لە هەموو شتێک باشتر ئەوە بوو کە هەر لەو لەندەنە بمابایەمەو و ئەگەر خوا بەو رۆژە نەکا و زمانم لاڵ بێ ، کۆڵەکەکانی پادشایەتی تۆزێک لەرزۆک بووناێ، هەر لێرە بەڕەی خۆمم لە ئاو دەردەکێشا و ملم لە ژیانی خۆم دەنا.

سەعاتێک زیاتر دەستم بە تەلەفۆنەکەوە و لە تاریکایی سامناک و خولیا شیرینەکاندا دەتلامەوە و نە رێی چوونەپێش و نە رێی گەڕانەوەم هەبوو.

هەستام و هەر بەو شەوە سواری تەکسی بووم و چوومە فرۆکەخانەی ئێڤرلی. لە رستورانتەکە دانیشتم و قاوەیەکم خواردەوە و ویسکیم داوا کرد و تا کەڕەی بەیانی کە فرۆکە بەرەو لەندەن فڕی.

پاش چەند سەعات بیرکردنەوە و وردبوونەوە، ساغ بوومەوە و بڕیارم دا خەریکی کاری خۆم بم. ئەقڵ بەسەر هەست و کوڵدا زاڵ بوو و خۆشەویستیی خوشکەکەشم ئەوەندە نەبوو رێم لێ بگرێ. پێم وابوو دەتوانم رەگی خوشک ە

خۆشەویستییەکە لە دڵم دەربێنم. مانەوە و بەردەوامبوون، زۆر لە میهرەبانی و خۆشەویستیی ئەو کەسانە گرینگتر بوو کە نەیاندەهێشت چاوم بە روقیە بکەوێ و راوێژێکی پێ بکەم. لەبەرخۆمەوە دەمگوت، ناکرێ هیچ چاوەڕوانیەکت لەو ژنە هەبێ کە ئاوا بە زەبروزەنگەوە بەرەنگاری من بۆوە. لە فڕۆکەخانەی هیسرۆ دابەزیم و مکووڕ بووم لەسەر ئەوەی خۆم بۆ بەرپرسیارەتییە تازەکە ئامادە بکەم. با بزانم کێ دەوێرێ داوای چەکم لێ بکا؟ سەعات هەشت و نیو خۆمم گەیاندە باڵیۆزخانە. پاش چەند خولەکێک لە تەلەفۆنەکەوە گوێم لە دەنگی باڵیۆزی گەورە بوو کە داوای کرد بچمە نووسینگەکەی. تێلگرافەکەی نیشان دام و تۆزێکیش زویر دیار بوو.

"جەنابی.. تۆ کە دەتهەویست بەرپرسیارەتییەکی ئاوا گرینگ بە پلەوپایەیەکی دیکە بگۆڕیتەوە، وا باشتر بوو پێشتر منت ئاگادار کردبایەوە."

"قوربان، من هەر ئاگام لەو مەسەلەیە نەبوو، دوێشەوێ ئاگادار کرامەوە کە لەو جێیەیان داناوم. ئەوەندەی بیستووشمە کەوتوومەتە بەر سێبەری گەورەیی جەنابی خاوەنشکۆ. لە کارکردنی خۆم رازی بوومە و باشیش دەزانم چاکە و پشتگیریی جەنابت چەندە لە سەرکەوتنەکانم و پووچەڵکردنەوەی تێکدەریی کۆنفدراسیۆنییەکان و دژبەرەکانی دیکەدا یارمەتیدەرم بووە."

"زۆر سپاس و خۆشحاڵم ئەو راستییە لە زاری خۆتەوە دەبیستم. منیش زۆر زۆرت لێ رازی بووم. راپۆرتەکانی من لە وەزارەتی دەرەوە ئەوە دەسەلەمێنن. زۆر باشە. وەک دەڵێی بڕیارەکە، بڕیاری پایەبەرزەکانە و ئێمەش ملکەچین. ئەی کەنگێ دەچیتەوە تاران؟"

"قوربان هەوڵ دەدەم بەپەلە کاروبارەکەم رێک بخەم. جگە لەوەش پێوەندیی بە بڕیاری بەرپرسەکانمەوە هەیە."

"کەوابوو لەبیرت بێ چەند رۆژێک پێشتر ئاگادارم بکەیەوە. دەمەوێ بە بۆنەی ماڵاواییکردنتەوە، ڕووناکبیرانی ئەم وڵاتە و قوتابییە دەرچووەکانی زانکۆ بانگهێشت بکەم بۆ شیرینی و چاخواردنەوەیەک. بەڕێکردنەکەت دەبێ ئابڕوومەندانە بێ. ئەی ئاگاداری کێ دێتە جێگەت؟"

"عەرزم کردی کە دوێ شەوێ من تەنیا بە تەلەفۆن ئاگادار کراومەوە."

وامان دانا حەفتەیەک پێ    ش گەڕانەوەم، رۆژەکەی بە سکرتاریای باڵیۆزخانە رابگەیەنم بۆ ئەوەی رێوشوێنی ئابڕوومەندانە رەچاو بکرێ. دوو حەفتە پتر رابرد و هێشتا کەس نەهاتبووە لەندەن کە نوێنەرایەتیی فەرهەنگی بگرێتە ئەستۆ و جێی من بگرێتەوە.

بۆ چارەڕەشی، ئەو هەواڵی دانرانەی من و ئەوەی وەها پۆستێک لە بەریتانیا چۆڵ کراوە، لێرە و لەوێ بڵاو بۆوە. تینووەکانی خزمەت کەوتنە جموجۆڵ. هەر سەرکردەیە و هەوڵی دەدا مۆرەی خۆی لەوێ دابنێ. سەدان تێلگرافی پیرۆزبایی دەگەیشتە دەستم. لە تارانەوە تەلەفۆن نەدەبڕایەوە. ئەمریان دەکرد تا زووە بگەڕێمەوە. چونکە بیستبوویانەوە دەبێ خۆم یەکێک هەڵبژێرم بۆ جێیەکەی پێشووم. سەریکی رێکخراوی وڵاتانیش چاوەڕوانییان هەبوو. تەنانەت باڵیۆزی سەیار"یش کە لە ژنێڤ دادەنیشت نیوسەعاتێک بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردم و ئامۆژگاریی کردم کە بەردەوام کاررێکخەر بم. ئەو نامە و تەلەفۆن و تێلگرافانە نەیاندەهێشت کارەکانم بکەم. چونکە نەمدەتوانی ماوەیەکی زۆر لە لەندەن بمێنمەوە وام پێ باش بوو کاروبارە رۆشنبیرییەکان جارێ بە یەکێک لە کارمەندە بەئەزموونەکانی باڵیۆزخانە بسپێرم. بوو بە هەرایەک هەر مەپرسە. هیچ وەرووی خۆم نەهێنا.

سەفیری مەزن میوانییەکی بەشکۆی رێک خستبوو. دوو سێ کەس لە وەزارەتی دەرەوە و چەند مامۆستایەکی زانکۆکانی بەریتانیاش هاتن.

ئەی لەو هەمووە ماستاوەی بازرگان و کارمەندەکانی کۆمپانیای فڕۆکەوانی و ئەوانیتر بۆیان دەگرتمەوە. بە حیسابی خۆیان شووتییان وەبن هەنگڵم دەدا و جا خوا بزانێ چۆنیان پێدا هەڵدەگوتم.

منیش خۆمم رادەنا کە نەخێر هیچم نەکردووە. ئەرکی خۆمم بەجێ هێناوە. هەر شتێک بووە لە گەورەیی پادشاوە بووە و لەمەودوایش بە پێی ئارەزووی شا دەجووڵێمەوە بۆ ئەوەی ئامانجەکانی جەنابیان کە دەفەرموون ئێران دەبێ لە چەند ساڵێکدا بکەوێتە پێش پێنج وڵاتە مەزنەکەی جیهانەوە، وەدی بێنم.

لەو هەراوهەنگەمەیەدا کە من گاڵتەم بە ئەقڵی ماستاوچییەکان دەهات و ئەوانیش بە من، یەکێک لە سیخوڕەکان بە سرتە پێی گوتم:

"جەنابی ...، قوتابییەکان خەریکن دەیکەنە فەرتەنە، نزیکەی دووسەد و پەنجا کەس لەبەردەرگای باڵیۆزخانە کۆ بوونەتەوە و دروشم دەدەن. نوێنەرانیان دەیانەوێ نامەیەک بدەنە باڵیۆزی مەزن. کۆمەڵێک هەواڵنێر و وێنەگر و رۆژنامەنووس و کامێرامانیشیان لەگەڵە. چ بکەین؟"

یەکێکی دیکەش سەری بردبووە بن گوێی باڵیۆزی مەزن. ئەو داوای سکرتێری یەکەمی کرد و لە تەلارەکە چووە دەرێ و پاش چارەگێک گەڕایەوە و من خۆمم گەیاندێ و لێم بیست کە فەرمووی:

"ئەفسەرێکی پۆلیس سکرتێری یەکەمی ئاگادار کردووەتەوە کە ئەمانە گەنجانی 18 تا 25 ساڵانن و نایانەوێ تێکدەری و سووکایەتی بکەن یان هەر نەبێ تا ئێستا فیتنەیان نەگێڕاوە و دەیانەوێ لە حزووری میوانەکاندا نامەیەک بدەن بە نوێنەرەکەی دەوڵەتی ئێران و ویست و داخوازییەکانیان بگەیەننە بەرپرسانی پلە یەکی وڵات. چونکە دمونستراسیۆن بە ئەمری بەرپرسانی پێوەندیدار بووە و تا هەرا و فەرتەنە نەنێنەوە پۆلیس بۆی نییە کاری بەسەریانەوە بێ. بە رای تۆ دەبێ چ بکەین؟"

گوتم: "لێم گەڕێن با بچم قسەیان لەگەڵ بکەم."

"فەرموو."

هەر گەیشتمە پێش هەیوانی باڵیۆزخانە، چەند کەسێک هەرایان کرد:

"ساواکی، ساواکی، ئێمە ئەتۆمان ناوێ. بچۆوە تاران و خەریکی جەللادییەکەی خۆت بە."

پاڵەپەستۆکە ئەوەندە توند بوو، کە پۆلیسەکان بوونە پەرژینی نێوان من و ئەوان. لەناکاو لە نێو هەرا و جنێوەکان گوێم لە هاوارێک بوو. نازانم خەیاڵ هەڵیگرتم و گوێم زرینگانەوە یان راست بوو.

"ساواکی، ئەی چ جوابێ خوشکەکەت دەدەیەوە؟"

سوور هەڵگەڕام و ئەگەر لەبەر پۆلیسەکان نەبایە وەڵامی جنێوەکانیانم دەداوە. سکرتێری یەکەمی باڵیۆزخانە هات و نێوبژیوانیی کرد و گوتی:

"برادەرینە لەسەرخۆ بن. جەنابی باڵیۆزی مەزن ئەمشەو میوانی پایەبەرزی هەیە. مامۆستاکانی خۆتانن، تکایە نامەکەتان بدەنە من. من دەیگەیەنمە خزمەتیان."

ئەگەر روقیە بۆیەی خۆ نیشاندام بەشکم ئاگادارم بکاتەوە ئاخۆ چیی لە بن سەریدایە، دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەوە یەکەم شەپڵاخە بوو کە لە دەموچاوم درا. ئیتر کەسانی وەک حاجی عەلی ساوجی و تیمسار سەلەشکر نەبوون کە لە بنەوە پاشقولیان دەدام، ئەمجارە کۆمەڵێک ئاژاوەگێڕ بوون و سیخورمەیان تێ دەکوتام و ناویان دێنام و راشکاوانە دوژمنایەتیی خۆیانیان دەردەبڕی. "ئەی چ جوابی خوشکەکەت دەدەیەوە؟"

پێم وابوو کەس ناتوانێ لە سۆنگەی روقیە و هاوڕێکانییەوە زەبرێک لە من بدا، بەڵام ئەو هاوارەی نێو خەڵکەکە ئاگری تێبەردام.

دانم بە جەرگی خۆمدا دەگرت و وەشوێن کارەکەم دەکەوتم.

کارە تازەکەم کێچی خستبووە کوڵمەوە و غرووڕێکی بێهەوسار پاڵی پێوە دەنام و وای لێ کردم ئیتر واقیعم نەدەدی و بەرزەفڕییەکەم سەری لە ئاسمان دەسوی.

ئاشنا و هاوکارەکانیشم خۆ دەستیان هەڵنەدەگرت. هەر نقورچکیان لێ دەدام. کە بۆچی نایەمەوە؟ جارێکیان سەرۆکی ئاژانس کە مەسەلەکەی هێنایە بەرباس، گوتی:

"پێشتر ئاژانس ئاگادار بکەوە کە چ رۆژێک دەگەیەوە، تا جەنابی خاوەنشکۆ ئاگادار بکرێتەوە."

ئەوە ئیتر وریاییدان بوو. خۆمم ئامادە کرد و بڕیار بوو لە لەندەنەوە بەرەو تاران بکەومە رێ. شۆفیرەکەی من دەبوو دوو سەعات زووتر بێتە ماڵەکەم و لە کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانمدا یارمەتیم بدا بەڵام نەهات.

نیو سەعاتێک دواتر کە تەلەفۆنچییەکەی باڵیۆزخانە گوێی لە دەنگم بوو، خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی و تاوێکی خایاند تا جەنابی باڵیۆز پیرۆزبایی لێ کردم:

"خۆشحاڵم زیندووی. شۆفیرەکەت کارەساتێکی ناخۆشی بەسەر هات. ترۆمبێلەکە تەقییەوە. راوەستە تا خۆم دێم و دەتگەیەنمە فڕۆکەخانە."

زۆر ترسام. لە ژیانمدا ئەوەندە نەترسابووم. ئیتر خەریکە شتەکە وەڕاست دەگەڕێ. فیدایی و مجاهدین و فەلەستینییەکان دەستیان دەگاتە ئێرەش. لە ژوورەکەمدا بەدەم چاوەڕوانیی باڵیۆزی مەزنەوە هەر دەهاتم و دەچووم. لە پشت پەردەی پەنجەرەکەوە راوەستام. هەر ژنێکی بە کۆڵانێدا تێدەپەڕی، لێم دەبووە روقیە و مەرزیە. پاڵتۆکەمم داکەند ـ پیرە کارەکەرەکەم کە لە دەرگای دا، هێنایە ژوورێ و خۆم دەرگاکەم پێوە دا.

لە هاوکارانی باڵیۆزخانەم چەند کەسێکی دیکەشیان هاتن ــ هەموان زراویان چووبوو و من لەوان پتر. شۆفێرەکە دەسبەجێ مردبوو. هەموان سەیری یەکتریان دەکرد.

باڵیۆزی مەزن رەنگی بە ڕووەوە نەمابوو. هەر لەبەر هەیوانەکە لەسەر کورسییەک دانیشت و من ئەمرم کرد پیرەژن چاوی تازە دەمکراوی بۆ بێنێ. پێکەوە دووکوڕی دانیشتین.

"جەنابی وەزیری ئەمریان فەرموو کە تۆ هەر ئەمڕۆ سواری فڕۆکە بیت بۆ تاران. باوەڕی وابوو کە نابێ دەرفەت بە رۆژنامەکان بدرێ هەرایەکی تازە دروست بکەن."

هیچ کارمەندێک نەیدەزانی و نەیدەتوانی مەزەندە بکا کێ دەستی لەو کارەساتەدا هەبووە. یەکێک لە کارمەندانی باڵیۆزخانە کە ئەوم لە بنکە نهێنییەکانی ئاژانس دیتبوو، خۆی گەیاندمێ. قەت نەهاتبووە ماڵی من. دیارە لەوپەڕی نهێنیکاریدا ئەمری ئاژانسی پێ راگەیاندم. هەر ئەمڕۆ بگەڕێمەوە تاران و ئەوەندەی پێشم دەکرێ بە "بریتیش ئەیرڤیز" خۆی راسپێردراوە بە رووداوەکە رابگا.

"فەرموویان تۆ کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە و دەبێ بەر لەوەی ئەم رووداوانە لە رۆژنامەکاندا بڵاو ببنەوە، بە رێگەوە بیت."

من لە فڕۆکەدا بووم و سەعات 11 گوێم لە هەواڵەکانی بی بی سی بوو. تەقینەوەی بۆمبێک لە باڵیۆزخانەی ئێراندا و کوژرانی شۆفێری کارمەندی بەشی راگەیاندن هەواڵە داغەکەی رۆژ بوو و، بە دوایدا خۆپێشاندانی ئاشتیخوازانەی قوتابیەیکان لەبەردەم باڵیۆزخانەدا. هیچ ئاماژەیەک بە ناوی من نەکرابوو. دواتر کە بی بی سی ناوەرۆکی بابەتەکانی میدیای بەیانیانی دەخوێندەوە، گوترا، کە قوتابییەکان حەزیان لێ نەبووە قسە لەگەڵ نوێنەری فەرهەنگی بکەن و رۆژنامەیەکی چەپ گوتبووی، نوێنەری فەرهەنگی کاربەدەستی ساواکە و قەول وایە بکرێتە جێگری ئاژانسی پاراستن و زانیاریی وڵات. ئەوە یەکەم جار بوو لە رۆژنامەکانی ئەورووپادا ناوی من بێ. دیارە مەبەستم رۆژنامە فەرمییەکانە بە زمانی ئینگلیزی. لەولاوە کۆنفدراسیۆنییەکان پارووەکی چەوریان وەگیر کەوت. زۆر زیاتر لەوەی بیرم لێ دەکردەوە ئاگایان لە ژیانم بوو و ورد ورد هەموو شتێکی منیان وەها دەزانی کە من دڵنیا بوومەوە، خەڵکێکی نێو خۆمان لە نێو ئاژانسەوە ئەم وردەکارییانەی ژیان و پێشکەوتنانەی منی لە نێو ئاژانسدا پێداون و لە هەندێ شتیشدا سێبەری روقیە هەبوو.

ئێستا ئیتر دارودەستەی سەرلەشکر و روقیە هاوکاریی یەکتریان دەکرد.

لەو بەڵایەش خۆم رزگار کرد، بەڵام دەتوان بڵێم ئیتر لەو سەعاتەوە ئاوێکی خۆشم لە گەرووی نەچووە خوارێ. سات بە سات لە ترس و دڵەڕاوکێدا ژیام. سەرەڕای ئەوەش زۆر چاوقایمانە ملم پێوە نا.

پاش چاوپێکەوتنێکی چەند سەعاتی لەگەڵ سەرۆکی ئاژانس و سەرۆکی ئیدارە گشتییەکان و ل قەکان و کارمەندەکانیان، ئیجازەم خواست چەند رۆژێک پشوو بدەم و بچمەوە لای دایکم کە ئاگای لە تەقینەوەی ترۆمبێلەکە و کوژرانی شۆفێرەکەی نەبوو.

لە هەموو شتێک زیاتر حەزم لێ بوو بپرسم چ خەبەرێکی تازەی روقیەی لایە و ئاخۆ ئاگای لە شریتە ڤیدیۆییەکەی هەیە یان نا. ئەگەر روقیە دەتوانێ خۆی هەرچەندە لە ڤیدیۆیشدا نیشانی من بدا، هیچ دوور نییە دایکیشیمی لەبیر کردبێ.

دایکم لە خانووەکەی شەقامی کەلانتەردا دەژیا. کە چوومەوە لای شاد و بەکەیف بوو. هیچ گلەیی لە ژیانی خۆی نەبوو. بە پێچەوانی جاران ئەو چەند رۆژەی لای بووم، هەر ناوی کچەکەی نەهێنا. هەوڵم دا بزانم بۆچی وا بەکەیفە. مووساگیان ژیانی دابین دەکرد.

"ئەو ژن و مێردە نێوانیان لەگەڵ من زۆر خۆشە ـ پاش مردنی دایکی و راگوێزرانی بۆ بانکی نیشتمانی، هەر لە باخەکەی ئەوێدا بەرپرسی هەسێڵەکەیە. لە کارەکەی خۆی رازییە. داهاتێکی باشی هەیە و ناوی تۆی لە زاری ناکەوێ و هەمیشە دەڵێ خوا سێبەری ئەومان لەسەر لانەبا. هەر دوو سێ رۆژان جارێک خواردن و دەرمانم بۆ دێنێ. زۆری بۆ خەرج کردووم. دەبێ بۆی ببژێری. کورم، دەستت دەڕوا؟ دەتوانی تۆزێک دەستی بگری؟ من تۆزێکی قەرزبارم..."

هەر باسی مووسا گیان و ژنەکەی بۆ دەکردم:

"خوا کچۆڵەیەکی شیرینی داونێ.. ئەی خوایە نازدارە..."

لە حەوشە بچکۆلانەکەدا تووتکێکی تووک لوولی رەش راکەڕاکی بوو و جار و بار حەپەیەکی دەهات. پرسیم:

"دایە گیان ئەو توڵەیەت لە کوێ هێناوە؟"

"ئەوە مووسا گیان بۆ کچەکەی کڕیوە. ئەو رۆژانەی خۆیان لە ماڵێ نین دەیهێنێتە ئێرە. بەتەنێ بێتاقەت دەبم. بە حەپەحەپەکەی تۆزێک خەفەتم دەڕەوێ."

"دایە گیان، کە بەتەنیا دەبی، جگە لە گەمەکردن بەو توڵەیە، چیی دیکە دەکەی؟"

"جلوبەرگی ساوا بۆ مەنیژە دەدرووم. نازانی چەندەی پێخۆشە."

هیچ باسی روقیە نەهاتە گۆڕێ. نەمدەویست درۆ بکەم و بڵێم هیچ ئاگایەکم لە خوشکم نییە. گوتم:

"دایە گیان حەزم لێیە مووسا گیان ببینم. ئەمرۆ نایەتە لات؟"

"دێ، زۆریش دێ، ئەمرۆ یان ئەم شەو دێ، خوا دەزانێ."

تاوێک رامام. دوایی دایکم گوتی:

"دەی خۆت بچۆ ماڵەکەی و لەگەڵ خۆت بیانهێنە ئێرە."

گوتم: "ئاخر رەنگە پێی خۆش نەبێ لەناکاو خۆ بەماڵیدا بکەم."

"بچۆ تەلەفۆنی بۆ بکە."

"بۆ ئێرە تەلەفۆنی لێیە؟"

"ئەم دراوسێیەمان هەیەتی. هەر ئەوەی لە هەژاریدا نیوەی خانووەکەمانم پێ فرۆشت."

کەوابوو زاوا بووەتە خاوەن تەلەفۆن ـ ئیتر دووقرانییەکەم کەوت. کەوابوو ئێرەش یەکێکە لە بنکەکانی ساواک.

"دایکە گیان ناتەوێ لەگەڵم بێیەوە خانووەکەی خۆمان لە نیاوەران. من تەنیام. تۆ دەتوانی ژیانم بڕازێنییەوە."

"نا، نا کوڕم. ئیتر پێ نانێمەوە ئەو خانووە. ئەو دامودەزگایە لە من ناوەشێتەوە؟

"بۆ لە تۆ ناوەشێتەوە؟ بۆ تۆ لە تەختەخەوێکت پتر دەوێ و لە دوو ژەمە نان پتر دەخۆی؟"

"نا، نا،ماڵەکەی تۆ بێنوێژە."

"ئەوە کێ ئەو قسەیەی بۆ کردووی و گوتوویەتی نوێژی دایک لە ماڵی کوڕ وەبەر ناکەوێ؟"

"ماڵی تۆ بێنوێژە. ئەوێ مڵکێکی داگیرکراوە."

"ئەوە کێ گوتوویەتی؟ کێ ئەم قسە قۆڕانەی لە گوێ ئاخنیوی؟"

"کوڕم شەڕم لەگەڵ مەکە. خۆ هەمووان ئەوە دەزانن. دەڵێن هەموو ساواکییەکان دوژمنی خوا و پێغەمبەرن."

"ساواکی چییە؟"

"لە من مەپرسە. بچۆ لە مەلا تەقیی پێشنوێژی گەڕەک بپرسە. بزانە لە پاشەملەی ساواکییەکان دەڵێن چی."

"دایە گیان، من دوژمنی خوا و پێغەمبەر نیم. ئەوانەی ئەو تۆمەتانە هەڵدەبەستن، خیانەت لە نیشتمان دەکەن."

بێسوود بوو لەوە پتر سەر بخەمە سەری. ئەوەندەم لێ روون بۆوە، کە بانگەشەی هاوکووفەکانی روقیە وا بە قووڵایی کۆمەڵگەدا رۆچووە، کە ئیتر کەس ناترسێ لەوەی راستەوخۆ و راشکاوانە بە ساواکییەکان بڵێ خیانەتکار و مرۆڤکوژ.

هەستام دایکمم بەجێ هێشت و چوومە لای زاوا. لە دەرگام دا. یەکێک دەرگاکەی لێ کردمەوە نەمدەناسی. پرسیم:

"ببوورە. زەحمەتم دای. خاوەن ماڵ ئاشنای منە. جەنابت ناناسم. دەمویست ئەگەر ئیجازە بدەی بە تەلەفۆنەکەتان تەلەفۆن بۆ دۆستێکم دەکەم. مسافیرم و ئەمڕۆ لە سەفەر هاتوومەوە."

"فەرموو. من جەنابت دەناسم. تۆ کوڕی ئەو خاتوونەی دراوسێمانی. فەرموو وەرە تەلەفۆن بکە."

مووسا گیانم دۆزییەوە. هەر ئەو شەوە خۆی و ژنەکەی هاتنە سەردانم. کە دایکم و مە نیژە بە منداڵەکەوە چوونە ناندینەکە و من و مووسا پێکەوە کەوتینەوە، هەلم بە دەرفەت زانی و وەقسەم هێنا.

"مووسا گیان دەنگ و باس؟ دایکم دەنگی زۆر دڵێر بووە. ئیتر لەگەڵ من هەڵناکا. ئەو ساواکی و ماواکییەی لە کوێ هێناوە؟"

"دیارە ئاگات لە دنیا نییە. ئەو شتانە بوونەتە بنێشتەخۆشکەی سەر زاران. کارەبا نەبێ خەتای ساواکە. نان خراپ بێ هەر خەتای ساواکە. منداڵی خەڵک شوێنبزر دەبن، دیسان هەر بەربینگی ساواک بگرە. وشەی ساواکەکە بە سرتە دەڵێن بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەیان گوێی لێ نەبێ. خەڵک ترسیان رەوییوەتەوە و بەبێ ئەوەی خۆشیان بزانن ساواک چییە هەروا پێیدا دەدەن. ئەوانەی تێگەیشتووترن دەزانن مەبەست لە ساواک شایە. دایکە نە دەزانێ ساواک چییە و نە دەشزانێ تۆ کارت بۆ کردوون. بەڵام زانیوێتەوە کە هەرکەس شاپەرست بێ ساواکییە. دایکە ئێستا بووەتە رۆژنامەخوێنیش. تا چەند مانگێک لەوەپێش لە منی دەپرسی لە رۆژنامەکاندا چیمان خوێندووەتەوە. رۆژنامەکانی لێ وەردەگرتین و دەیخوێندنەوە. چاویلکەیەکمان بۆ کڕی، ئێستا ئەوە دوو سێ حەفتەیەکە رۆژنامەفرۆشەکە، رۆژنامەیەکی لە کەلێنی دەرگاوە بۆ دەخاتە حەوشەکە. دایکە خۆی دەیخوێنێتەوە، بۆچی پێت سەیرە کە لە ساواکی دەترسێ؟"

"تۆ هیچ ناترسێی ئەو قسانە بۆ من دەکەی؟"

"کوڕە ئەو سنوورانە بەزیون. رۆژێکیان وەرە بانکی نیشتمانی بزانە چ باسە. خۆ هیچ کارێکی دیکەیان نییە جگە لەوەی لەسەر ئەم قسانە چەلەحانێیان بێ. دەی دیارە خەڵکی وەک منیش راپۆرتەکە دەدەن. جا فایدەی چی. دەبێ سەردەستەکان بدۆزنەوە. وا دیارە باشاریان ناکەن. خۆ ناکرێ ئەو خەڵکەش بەپانەوە لە بەندیخانە بکەی."

"یانی دایکم بووەتە دژەشا وا بەکەیفە؟"

"نا، پێم وایە بەکەیفبوونەکەی ئەو بۆ شتی دیکەیە."

"بۆ چ شتێک؟"

"لەخۆی بپرسە."

"کەواتە تۆ دەزانی و نایڵێی؟"

"من نازانم بەڵام مەزەندە دەکەم."

"چ مەزەندەیەک؟"

"گیانی من، بۆچی تووشی گێچەڵم دەکەی؟ دایکی خۆتە و متمانەی پێتە."

"دەست هەڵگرە و سەری پرێسکەکە بکەوە."

"من خۆم هیچم نەدی. بەڵام رۆژێکیان خێزانم مەنیژەی چەند سەعاتێک لای دایکت بەجێ هێشتبوو. کە گەڕابۆوە دەبینێ دایکت ئەوە کاغەزێک دەخوێنێتەوە. هەر چاوی بە خێزانم دەکەوێ، کاغەزەکە دەشارێتەوە."

"کێ نامە بۆ دایکم دەنێرێ؟"

"لە خۆت بپرسە."

"لە تۆ دەپرسم."

"دەی خۆ دایکت لە تۆ و روقیە بترازێ کەس شک نابا. خۆ نامەی تۆش لە ئێمە ناشارێتەوە."

قسەکەم بڕی. کە مووسا گیان و ژن و منداڵەکەی رۆیشتنەوە، بەربینگم بە دایکم گرت.

"دایە هیچ خەبەرت لە روقیە هەیە؟"

"نا، بەڵام لە دڵم چەقیوە بەو زووانە دێتەوە و هەموومان پێکەوە دەبین. تۆ و روقیە و من."

"روقیە نامەی بۆ دەناردی؟"

"ئەی بۆتۆی نەناردوە؟"

"نا بۆی نەناردووم."

"با، پەیامی بۆ ناردووی کە دەست لەو کارە هەڵگرە و خۆت بحەسێنەوە."

"چووزانی؟"

"بۆ چما تۆ هەرچی دەیزانی بە منی دەڵێی تا منیش چیی دەیزانم بەتۆی بڵێم؟"

"دایە گیان خەریکی گەمە بە ژیانی خۆت و منیش دەکەی. من نامەوێ تۆ تووشی چەرمەسەری بی."

"تۆ خەم لە خۆت بخۆ. من پاش باوکتان لە تۆ و روقیە بەدەر کەسم نەبوو. ئێستاش دەزانم تا دەمرم هیچ هیوایەکم نییە جگە لەوەی هەردووکتان بێنەوە کن خۆم. ژیانی من چ نرخێکی هەیە؟ برۆ خەریکی کاروباری خۆت بە و منیش دادەنیشم و چاوەڕێی روقیەم و هەر کات ژنەکەی مووسا دێ و لە دەرگا دەدا دڵم خۆش دەبێ، چونکە شیعر حافزم بۆ دەخوێنێتەوە و دڵم خۆش دەبێ کە: "دڵە مزگێنی کە دێ لێرە مەسیحا نەفەسێ".. ئەوەم بۆ لێک دەداتەوە و لەسەرخۆ خەوم لێ دەکەوێ، بەو هیوایەی سبەی بەیانی لە دەرگا دەدرێ و تۆ و روقیە دەست لە ناو دەستی یەک وەک سەردەمانی منداڵیتان لێم وەژوور دەکەونەوە و لە باوەشم دەگرن و منیش لە خۆشیان دەمرم..."

نەیدەهێشت قسەکەی ببڕم. لە دنیای خەیاڵدا دەتلایەوە. خەونی خۆش خۆشی دەگێڕانەوە. ئەو ئارەزووانە هێندەی چاوترووکاندنێک وەکوڵیان دێنام. روقیە گیانم دەدی کە پێکەوە لەسەر لێواری هەسێڵەکە دانیشتووین و لاقمان لە نێو ئاوەکەدا لێک دەدەین و سوورەماسییەکان دەترسێن و دیسان دێنەوە. ئەو وێنە تیژتێپەڕە دەڕەوییەوە و من دیسان قەڵافەتەی هەڕەشەکەر و توندوتیژخوازی ئەوم لە شاشەکەدا دەدی، کە دەستی لە کەلەکەی ناوە و باسی عەزاب و ئەشکەنجە و سزادان دەکا. ئێمە دوژمنی یەکتر بووین و بە خوێنی یەک تینوو. ئەو شەڕەکەی هەڵاییساندبوو و من چارم نەبوو جگە لەوەی بەرگری لە خۆم بکەم و بڵێی و نەڵێی چارم نەبوو جگە لەوەی خۆمی لێ بێبەری بکەم و گوێی نەدەمێ.

بەڵام لەو لاشەوە رێیەکی دیکەم نەبوو. لە بگرەوبەردەی نێو ماڵێدا منی خستبووە گۆڕەپانێکەوە، کە نەمدەزانی چۆن تێیدا زۆرانبازی بکەم. تا ئێستا کاری من هەر ئەوە بوو نەهێڵم چەند کوڕ و کچۆڵەی بێ ئەزموون و ئاشقەناوبانگ بە هەرا و هەنگەمەکانیان، سیاسەتی وڵات تاوانبار بکەن. من دەمتوانی بەو کەرەستانەی هەمبوو پێشیان بگرم. هەڕەشەم لێ دەکردن. پاسپۆرتەکانیانم زەوت دەکرد، دراوە بیانییەکەیانم نەدەدانێ و بە شەڕ و ململانێ لە دادگای وڵاتانی خانەخوێدا غەرامەم لێ دەستاندن. کاروپیشەم ئەوە بوو شاپەرستەکان لە کۆنفدراسیۆنییەکان بەردەم، وێنەی بەرهەڵستکاران بگرم و تۆماری بکەم و بینێرمەوە تاران و هەزاران دەهۆی دیکە. ئەزمونم هەبوو و سەرەداوەکەم بەدەستەوە بوو. ئەو کارانە دیارە وردبینی و خوێندنەوە و ماندوونەبوون و دووبەرەکی نانەوە و هەزار فرتوفێڵی دیکەی دەویست. ئەم کارە بە هەموو کەس دەکرا.

بەڵام ئەو کار و پۆستەی بە منیان دابوو، خوێندەواری و زانیاری و پێگەیشتوویی سیاسی و هەزار بگرەوبەردەی دیکەی پێویست بوو، کە من لێیان بێبەری بووم. بۆم نەدەچۆوە سەر یەک، شاهەنشا بە چ مەبەستێک پاش رووداوەکەی جۆزەردانی 1342 ئەو حیزب حیزبێنەیەی خستبووە رێ؟ بە راستی تێنەدەگەیشتم "سیاسەتی هاوسەنگی" یانی چی. بۆ وێنە ئەگەر من لە رێی خەباتەکەمدا بەرەنگاری کۆمۆنیزم یان چەپەکان ببامەوە و بەربینگیانم گرتبا و ماڵوێرانم کردبان، ئەودەم چۆن شاهەنشای رێبەری پایەبەرزمان لە مۆسکۆ دەیانفەرموو: " ئەگەر بە ویستی خۆمان دراوسێمان هەڵبژاردبایە، بێ ئەملاوئەولا یەکێتیی سۆڤیەتمان هەڵدەبژارد." هەڵبەت ئەم حوکمە دەبێ شتێکی تێدا شاردرابێتەوە. ئاخر سیاسەتی ئەمریکا کە لە ڤێتنام هەموو لەتوپەت بوون، چ پێوەندییەکی بە ئێمەوە هەیە کە خاوەنشکۆ فەرمانی دابوو رۆژنامەکان باسی ئەو مەسەلەیە هەر نەکەن. بەرهەڵستکاران دەیانکردە هات و هەرا و دەیانگوت بەکوشتدانی لاوانی ئێران بۆ پشتیوانی لە ملهوڕێکی هیچوپووچ چ سوودێکی بۆ ئێمە هەیە.

دەبێ چ وەڵامی ئەو بەڕێزانە بدەینەوە؟ ئاخۆ مەبەست ئەوەیە کە ئێمە دەبێ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە کەنداوی فارسدا بپارێزین؟ چەپییەکان دەیانگوت خاوەنشکۆ گوێلەمستی ئەمریکایە و، بەبێ ئەمریکا ناتوانێ پەنجە لە ئاوێ رۆ بکا. دەی خۆ ئەوە لەگەڵ سیاسەتی ناسیۆنالیستی یەک ناگرێتەوە. منی ماڵوێران زۆر کرچوکاڵ بووم و هیچ سەر ودەرم لێ دەرنەدەکرد، هەڵبەت ورد ورد وتارەکانی خاوەنشکۆم لە رۆژنامەکاندا دەخوێندەوە و هەندێ قسەیم ئەزبەر دەکرد. بەڵام لەبەردەم سەرکردەکانی ئاژانسدا، هەر ئەوەندەی باسی مەسەلەیەکی تازە کرابایە، وەک کەرێ لە قوڕ دەچەقیم. نەزان بووم و تەنیا بە پێی ئەزموون و زیرەکیی خۆم دەمزانی خەڵکی بەرچاوتەنگ چاوێکیان کردووەتە چوار و خواخوایانە قسەیەکم لە زاری دەربچێ و وای لێک بدەنەوە قسەم بە شا گوتووە. زاتی شاهەنشا هەموو شتێک بوو و هەرچی دەیانفەرموو، بەبێ کەموزۆر شیاوی جێبەجێکردنن. کێشەکە ئەوە بوو کە من لە هەندێ شت تێنەدەگەیشتم. بە رای من راکردنی وەرزێرەکان لە گوندەوە بۆ شاری شتێکی وا نەبوو هەر دانیشن و چەند سەعاتان لەسەری چەلەحانێ بکەن و پسپۆڕی لە ئەمریکاوە بۆ بێنن و گوندیی لە دێهات راکردوو بە دار و تێڵا بنێرنەوە بیابانەکانی باشوور. من بەو ئەقڵە نوقستانەی خۆمەوە دەمگوت: دەی چ دەبێ ئەگەر فڵانە جوتیار بۆ کارێکی ئاسانتر بێتە شاری و ژن و منداڵەکەی لەگەڵ خۆی بێنێ و ماڵ و هێلانەیەک لێرە پێکەوە بنێ. زۆر شتی ئاوا هەبوو کە هیچ کەس نەیدەوێرا هەر باسیشی بکا.

من کەسێکی وام نەبوو لەو کێشانەدا راوێژێکی پێ بکەم. هەر مووسا گیانم هەبوو. ئاخر ئەویش خۆ هەموو شتێکی نەدەزانی. لەو 18ساڵەدا لە کاروباری بانکدا ببووە پسپۆڕ. ئیتر دیپلۆمەکەی خۆی وەرگرتبوو. ئەو وەک من نەبوو، بەو حاڵەشەوە هیچ لە نهێنییەکانی سیاسەت تێنەگەیشتبوو و، هەر ئەو شتانەی دەگوتەوە کە لە بانک بیستبوونی. باسی هرووژمی وەرزێر بۆ شارەکان. دەیگوت:

"نزیکەی سێ ملیۆن دێهاتی روویان کردووەتە شارەکان."

"بۆچی؟"

"ئەو شتومەکانەی ئێمە لە دەرەوەڕا دەیانهێنین، هەرزانترن لەوەی گوندی دروستی دەکەن و دەیهێننە بازاڕ دەیفرۆشن. ئیتر بۆیان دەرناهێنێ پەنیر بگرن. پەنیری دانیمارک لە پەنیری خۆمالای خۆشتر و هەرزانتریشە.

"دەی بۆچی دەیهێنن؟"

"ئەوە ئاگات لە کوێیە؟ ئەی ئەوەندە ساڵە لە لەندەن چیت دەکرد؟"

"قسەکەت بکە."

"لەبەر تۆ نەبا، قسەی دڵم هەڵدەڕشت."

"بیکە."

"بە قوربان، یان کەری، یان خۆتمان لێ کەر دەکەی. کێ هاوردەی دەکا؟ خۆیان دەیکەن. هەر هەوانەی لەو دیزەبەدەرخۆنەکردنەدا شەریکن. بۆخۆیان دەیبڕن و بۆخۆشیان دەیدروون. هەر هاودەستەکانی دەربار. حەزرەتی خاوەنشکۆش ئاگادارە."

لەبەرخۆمەوە گوتم: "کوڕە ئەو مووسایەش چاک بێشەرم بووە. سەیرم کرد وا باشترە لێیگەڕێم قسەی دڵی بکا. پرسیم:

"دەی باشە چ زیانێکی هەیە گوندی بێنە شار؟"

"بێن چ بکەن؟ ئەوانە نان و ئاویان دەوێ. کاریان دەوێ."

"ئەی کارخانە بۆچی دروست دەکەین؟ چمان دەوێ؟"

"کارخانەکانی ئێمە، پێنج هەزار، دە هەزار، سەد هەزار کرێکاریان دەوێ نەک سێ ملیۆن کەس. ئەویش کرێکاری پیشەیی کە لە پاکستان و کۆریاوە دەیانهێنین، نەک دێهاتیی گێل."

"کەوابوو ریفۆرمی زەوی و زار و کۆمپانیا هەرەوەزییەکان هەمووی فشەیە؟"

"کاکی خۆم، من نازانم. لە گوندیش نەبوومە. ناشتوانم هیچ بڵێم. ئەم کارمەندگەلەی بانک دەڵێن، هەمووی قسەی قۆڕە. دەیان جار ئەو دژبەرییانەم ڕاگەیاندووە. ئیتر چەند ڕۆژێکیان دەگرن و بە پارەیەک بەریان دەدەن و ئازاد دەکرێن. نە چەپی بوونە، نە ئیسلامی و نە کۆمۆنیست. چییان لێ بکەن؟ ئەوانە دەڵێن: گوندییەکی بە دوو هێکتار زەوی تێروپڕ دەژی، ژیانی خانەوادەیەکی چەند کەسیی پێ دابین ناکرێ. خوونکارەکان دەستیان بەسەر زەوییە باشەکاندا گرتووە و ئەو زەوییانەش کە قەت ئاو نایانگاتێ داویانن بە جووتیاران. جا وەرە دەوڵەتیش هات ژیانیان باشتر بکا، هەر گووی تێکرد. مامان دووکەس بن، منداڵەکەی سەری خوار دەبێ. دەوڵەت هات و نرخی کاڵا کشتوکاڵیەکانی ڕێک خست، لەو سۆنگەیەوە دێهاتی زەوی و زار و گا و جووت و وەردی بەجێ هێشت و هاتە شاری. لێرە دەبێتە کرێکار و کارەکەر و سواڵ و دزی دەکا، بەڵام لە برسانیش دەمرێ."

"یانی چۆن؟"

"یانی ئەوەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ بەرهەمی کشتوکاڵی کەم دەبێتەوە و پێداویستیی شارەکان ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەبێ. چار چ بوو؟ هەر کاڵای پێویستیان لە دەرەوە هێنا و لەولاشەوە بەرهەمی خۆماڵی کەم بۆوە. من ئەوەم لە یەکێک لە مودیرەکانی بانک بیست. پسپۆڕی ئامار بوو. ڕاپۆرتەکەم گەیاندەوە. چەند ساڵێک لە ژاپۆن دەرسی سەرژمێریی بە کۆمپیوتەری خوێندبوو و لە بەشی ئامارەوە ڕایانگوێست بۆ بەشێکی دیکە."

"ئەڵاهوئەکبەر، سەرم لەو کارانە دەرناچێ."

"بە گیانی تۆ، منیش مێشکم کای تێدایە. لە هەموو ئەوانەش خراپتر ڕۆژ بە ڕۆژ مەسەلەی هەڵاوسانی پارەیە...."

"هەڵاوسان چییە؟"

"وەڵاهی ئەوەش نازانم. دەبێ لە پسپۆڕان بپرسی."

"ئەی پارە چۆن هەڵداوسێ؟"

من جووتێک کەوشم دەکڕی، بۆ وێنە بە دووسەد تمەن. بە مووچەی مانگانەکەم دەمتوانی سەد جووت بکڕم. ئێستا مووچەکەم بووەتە دوو هێندەی جاران و ناتوانم سەد جووت کەوشی پێ بکڕم. نرخی جووتێک کەوش گەیشتووەتە ئاستی مووچەکەی من."

"تێگەیشتم. لە لەندەنیش هەر وا بوو".

دەمویست لە بارەی ناڕەزایی کرێکارانەوە پرسیاری لێ بکەم. گوتی:

"وەڵاهی ئاگام لەوە نییە، دەبێ لە ئەهلی خۆی بپرسی. دەڵێن، ئەوانە کۆمۆنیستەکان دنەیان دەدەن."

"من نازانم ئەو کۆمۆنیستانە چ زۆڵێکن کە دەتوانن هەموو هەوڵەکانی جەنابی شا پووچەڵ بکەنەوە. مەگەر بۆخۆیان پشکیان لە کارخانەکاندا نییە؟ خۆیان لە پەرلەمان نوێنەریان هەیە، ئیتر چییان دەوێ؟ ئێستا ئێران گەورەترین وڵاتی کرێکاریی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. پێنج ملیۆن کەس لە ئابووریی وڵات مووچە وەردەگرن. ئەوانە پشتیوانی خاوەنشکۆن. ئینجا چەند جووجە کۆمۆنیستی لەوانەی من لە ئەورووپا کەوڵم دەکردن، هاتوون سەریان لە خەڵک شێواندووە."

ئەو شتانە بوون کە سەرم لێ دەرنەدەکردن. ئەوجار یەکێک لەو بەچکەکۆمۆنیستانە لە نامەی دکتۆراکەیدا وای نشان دابوو کە قەیرانی ئابووری دەبێتە هۆی شۆڕشی کۆمەڵایەتی. نەمهێشت وەزارەتی زانست نامەکەی قبووڵ بکا. لە کارە تازەکەمدا لەگەڵ ئەو مەسەلە ئاڵۆزانە ڕووبەڕوو بووم.

کە تووشی کۆنەئاشناکانم دەبووم، کەسانی وەک ئاهاری و خ انعەلی و دەماوەندی، کە ئێستا پاروویان لە ڕۆن کەوتبوو، کوێتەم دەشەلی و بارم لار دەبوو. خۆی خاوەنشکۆ ڕۆژێکیان، بژاردە بیرمەندەکان و کۆنەئاشناکانی منیشی بانگ کردبوو و ئەمری فەرمووبوو: بچن و بکۆڵنەوە بزانن ئەو خەڵک لە هەموو چین و توێژەکان لە چی تووڕەن و، وەرنەوە ئاکامی لێکۆڵینەوەکانی خۆتانم پێ بڵێن و من خۆم بڕیار دەدەم. یەکێک لەو برادەرانە ئاماژەی بەوە کرد کە لە وڵاتدا تەنیا یەک کەس حوکم دەکا و فەرمانڕەوایە و راوێژ بە کەس ناکا و ئەوە خۆی هۆکاری پشێویە و دەبێ ڕێیەکی دیکە بگرینە بەر. منیان ئاگادار کردەوە کە لە پشت پەردەکەوە کاروبارەکەم ڕێک دەخست و منیش ئەمرم کرد بە شەقان دەریان کردە دەرێ.

لە کۆنفرانسی سەرۆکی ڕێکخراوی هەموو وڵاتان و زۆربەی وڵاتانی ئەورووپایی و ئەمریکایش باسی هۆکارەکانی ناڕەزایەتیی هەندێ چین و توێژی کۆمەڵ بوو بە باسێکی گرینگ. یەک دوو کەس گوتیان، جەنگی رواڵەتیی نوێنەرانی "ئێرانی نوێ" و حیزبی خەڵک" تاقمێکی وا لێ کردووە گومان لە سیاسەتی شاهەنشا بکەن و ڕەخنەری لێ بگرن. دەبێ ئەو دەرکۆکەیە دابخرێ. بەشێکی زۆری دانوستانەکان هەر باسی ئەو شتانە بوون کە لە کۆبوونەوەی "پێداچوونەوە و چاوپێداخشاندنەوە"دا تاوتوێ کرابوو.

دەسەڵات دەبێ وردە وردە بکەوێتە دەستی خەڵک، ئەویش نەک ئەوەندەی کە قسەی شا بشکێنرێ.

لێرەش باسی هەموانیکردنی ئابووریی وڵات بوو و، پێویستبوونی کۆمپانیای سەرمایەی وردەدەوڵەمەندان بۆ دامەزراندنی پیشەسازیی نوێ. کڕینی هەموو کارخانەگەورەکان، بە حەق و ناحەق پاوانی چەند کەسێکە بەتایبەتی ئەوانەی خۆیان بە دەربارەوە دەنووسێنن و، ئەم دیوارەیش دەبێ هەڵبگیرێ. ئەوانەی موویان لە ماست دەردەکێشا، دەیانزانی مەبەست سەرکردەکانی سوپا و ئاژانسە، کە ساتوسەودای کەلوپەلی تەکنیکیی سوپا و دەریاداری و فرۆکەوانییان بە مافی بێ ئەملا و ئەولای خۆیان دەزانی. دیارە ئەو وتاردەرە لەوە قسەزانتر بوو کە نەزانێ لەوانەیە ڕەخنەکانی ببنە پەتێک و بکەونە گەردنی خۆیەوە. هەر بۆ شوێنەونکردن پێی لەسەر ئەوە داگرتەوە کە، شاهەنشا دەبێ

هاندەری سەرمایەداری بێ و، کێ هەیە نەزانێ کە جەنابیان لە خۆشبژێویی خەڵک بترازێ هیچیان ناوێ و هەموو سامان و دارایی بەڕێزیان لە خزمەتی خەڵکدایە.

ئەگەر هەوڵی شێلگیرانەی ئەو نەبوایە، سەرمایەداری لەو وڵاتەی ئێمەدا هیچ گەشەیەکی نەدەکرد و ئەم ناوبانگەی ئێستای نەدەبوو. ـ مەبەستی وتاردەرەکە ئەوە بوو، کە ئەو تاقمە بچووکەی لە لووتکەی ئابووری و بازرگانیی ئێراندان، نابێ سەرپێچی بکەن و ببنە ڕێگری بەردەم ئەو بازاڕانەی سەرمایەیەکی کەڵانیان نییە تەنیا بۆ ئەوەی خۆیان سوودێکی زیاتریان پێ ببڕدرێ. هەرچۆنێک بێ، دەسەڵاتی خاوەنشکۆ چ لە سەرکردایەتیی سیاسی و چ لە بواری گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا نابێ سنووردار بکرێ. ئەوە بوو کورتەی دانوستانەکان لە ئەنجومەنی بەرزی ئاژانسدا.

هەر لەو سەردەمەدا، گرانبوونی نەوت، ئابووری و پیشەسازیی مەملەکەتەکانی ڕۆژئاوای تەواو لەرزۆک کردبوو و شاهەنشا بەرنامەیەکی هەبوو و، خەریک بوو جێبەجێی دەکرد بۆ ئەوەی بە قەڵەمبازێکی پیشەسازیدا بگەنەوە "شارستانییەتە مەزنەکە." کڕینی پشکەکانی گووپ و دانی وام بە وڵاتانی دیکە و ئەو سوودە زۆروزەوەندەی بە نەسیبی پیاوانی ئابووری دەبوو و، هەلقۆستنەوەی ئەو کەسانەی لە ئاستە هەرە بەرزەکانی حوکمەتدا جێی خۆیان خۆش کردبوو و تاڵانی پێداویستیی خەڵک، وەها چاوپێداخشاندنەوەیەکی کردبووە شتێکی پێویست.

هەموو ئەو شتانە و مشتومڕ و کۆنفرانسەکان و کێبڕکێی نابەجێ و ئەو سەروەت و سامانە زۆرەی سەرکردەکان کۆیان دەکردەوە و ئەو زێدەڕۆیانەی سەرمەستانی دەسەڵات و سامان، هەتا وای لێ هات دوو وەزیر لەسەر قومار دەمانچەیان لێک کێشا و سەرلەشکرێک، ئەو ئەموستیلە بەرلیانییەی شاهەنشا داوای کردبوو بۆ شاژنی بکڕن، شەوێکیان بە نیوەقیمەت لە گەوهەرفرۆشێکی کڕی و دیارە بەدفەڕیی نهێنی و بڵاڤۆکی بەزەڕ* نەک هەر لە کاغەز و نووسراوی کۆمۆنیستەکان و کۆنفدراسیۆنییەکاندا، بگرە لە سیپارەی مەلاکانیشدا هەبوو و هەموو ئەو شتانە بوونە هۆی ئەوەی جەنابی خاوەنشکۆ دڵی زۆر شکا و بڕیاریان فەرموو پێش بەو بێسەروبەرییە بگرن و چاوقایمەکان جڵەو بکەن.

هەر بەو مەبەستە ڕۆژی 11ی ڕەشەمەی 1353 فەرموویان، حیزبەکان هەڵوەشێنرێنەوە و حیزبی "ڕەستاخیزی ئێران" دابمەزرێنرێ. لە فەرمانی شایانەدا وا هاتبوو، کە هەموو کرێکار و وەرزێر و زانا و بازرگان و پیاوانی حوکمەت و هەموو ئەوانەی خۆیان بە ئێرانی دەزانن و حەز دەکەن وەک ئێرانییەک لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکرێ، دەبێ هەر لە ئێستاوە تا بەیانی بێنە نێو ئەم حیزبەوە و ئەوانەی ئەم فەرمانە بشکێنن، یان هەر وا ئەندامی ڕێکخراوێکی نایاسایی بن، دەبێ یان بچنە بەندیخانەوە یان وڵات بەجێ بهێڵن و بەبێ ئەوەی تێچووی سەفەریان بدرێتێ بۆ کوێ دەڕۆن، بڕۆن.

لە ناکاو وەزعەکە گۆڕا. بەرژەوەندپەرستان دەمامکیان لە روخساریان دا و سفرەیەکی ڕەنگینیان دۆزییەوە و بە هیوای داگیرکردنی پۆستە بەرزەکان و بەدەستهێنانی پلەوپایە، هرووژمیان هێنا. ئاهاری بوو بە وەزیری داد. خان عەلی بوو بە سەرۆکی زانکۆی تەورێز و دەماوەندی بوو بە وەزیری دەربار.

سەرۆکی ئاژانس گۆڕدرا. تیمسار سەرلەشکر دیسان هاتەوە نێو ئاژانس. سوپاییەکان هاتن. سەرۆکایەتیی ئاژانس درایەوە بە سەرلەشکرێکی دیکە. هەر کامە و وردە دەستوپێوەندەکانی خۆیانیان هێناوە.

من شەخسی خاوەنشکۆ داینابووم و کەس نەیدەوێرا دەستم بۆ بەرێ. بەڵام کەس کارێکی بە من نەدەسپارد. بە ڕواڵەت کاروباری قوتابییەکان لە هەموو دنیا لە هیندستانەوە تا ئەمریکا و کانادا لە ئەستۆی من بوو. بەڵام کەس کارێکی بە من نەدەسپارد. کەس بە قسەی نەدەکردم. هەر کام لە ساواکییەکانی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکا و ئاسیا سەر بە یەکێک لەو باڵیۆزانە بوون کە خۆشەویستی شا و حیزبی ڕەستاخیز بوون و ڕێگەیان نەدەدا خەڵک خۆیان لە

* بە زەڕ: هەر شتێکی زیانی هەبێ. دووپشک زەڕی هەیە بۆیە دەیکوژین.

کاری هەڵقورتێنێ. چەند بەرپرسێکی ئاژانسیان لەسەر کار لابرد بەو خەیاڵەی کە داروەستەی منن. گوتیان لە هەرای هەڵاوسان نرخ و گرانبوونی شتومەکدا ئەوەندەیان حەپەلووش کرد، کە پێویستیان بەو قەرەپووڵەی ئاژانس نییە.

حەفتەیەکی مابوو بۆ نەورۆزی 1355، ئاهاریی وەزیریی داد هاتە لام. هێشتا هەواکەی سارد بوو. هێشتا چەند ڕەگە بەفرێک لە باخەکەی نیاوەراندا مابوو. دارەکان رووت و ڕەبەن بوون. تاک و لۆ گوڵی وەنەوشەیی و گەزیزە چووزەرەیان دابوو. چووزەرە لێرە و لەوێ مزگێنیی هاتنی بەهاریان دێنا. سەعات حەوتی ئێوارە بوو. خۆر خەریک بوو لە پشت سنۆبەرەکانەوە خۆی دەشاردەوە.

هێشتا دانەنیشتبوو، پرسیی:

"دەنگوباس؟ ئەوە چیە جێگۆڕکێ بە هەمووان دەکەن؟"

"واز لە دیپلۆماسی بێنە. دەڵێن تا ئێستا کارەکان بە دەست ساواکییە نەرمونیانەکانەوە بوون و، ئەو نەرمونیانییەش کارێکی وای کردووە دژبەران سەر بەرز بکەنەوە و ڕاپەڕن."

دەیویست قسەم لێ دەربکێشێ. بێدەنگ بوو. دەرفەتم نەدا.

"دەی قسە بکە، بۆم باس بکە. تۆ لە من باشتر ئاگاداری."

"لێت دەترسم."

"هاتوویەتەماڵەکەم و لێشم دەترسی؟"

"هەرچۆنێک بێ تۆ جێگری سەرۆکی ئاژانسی."

"بەڵام دەرەقەت وەزیرێک نایەم کە شاهەنشا خۆی هەڵیبژاردووە."

"کێ چووزانێ؟ بە چەند ڕاپۆرتێک و چەند کەسێکی وەک من سەرموقلات لێ دەدەن."

"دەست هەڵگرە، قسەکەت بکە."

"ئەمریان فەرمووە چەند کەسێک دادگایی بکەم."

"لە ئاژانس؟"

"هی ئاژانسیشیان تێدایە. یەکێکیان سپاسالار بووە. دەبێ وەڵام بداتەوە."

"نەکا منیشیان لەگەڵم؟"

"نا، لەگەڵ تۆیان نییە. بەڵام ئەو دوو وەزیرەی دەمانچەیان لێک کێشا، ئەوانن. فەرموویانە دەبێ بکرێتە هەرا. دەبێ خەڵکە ناڕازییەکە ئارام بکرێنەوە."

پرسیم:

"ئەی چ زانیارییەکت لەسەر من هەیە؟ ئێستا ئەوە بیست ساڵێکە یەکتر دەناسین. هەر لەو ساڵەوە کە لە حیزبدا بووین. زۆرم چاکە لەگەڵ کردووی. قەت پاشقولم نەداوی. بەندکردنی مامۆستاکان فێڵ بوو. دوژمنایەتی لەگەڵ تۆ نەبوو. ئەوەندەی دەزانم تۆش لە هیچ کوێ خراپەی منت نەگوتووە. ئێستا کە هەندێ دەیانەوێ لە عەرزم بدەن، کەسانی وەک ئێوە دەبێ وەڵامی چاکەم بدەنەوە. خۆ تیمسار سەرلەشکر دەناسی، مێردەکەی مۆنیکا..."

"ئاگات لێی نییە، ئێستاش بە نازێک پیاو دەکوژێ و دڵان دەبا بە تاڵان. لەگەڵ ژنەکەی لەسەر سامان و ماڵی دنیا شەڕیانە. تەڵاق و جیابوونەوە. ژنە قورس و قایم ڕاوەستاوە و دەڵێ، چیمان هەیە دەبێ نیوەی بکەین، ئەگینا ئاشکرات دەکەم. پەروەندەکانیان لە دادگا باری حوشترێکە. کەس کاری بەتۆ نییە. ئەوانەی خراپەی تۆیان دەوێ، دەست لە ڕوقیە هەڵناگرن. خوشکەکەت لە کوێیە؟"

"هەر ئەوەندەم لێ ڕوونە لە زیندان نییە. لەوانەیە لە دەرەوە بێ. لە فەلستین، لە ئەورووپا. لەوانەشە نەمابێ."

"نا، بێ ئەملا و ئەولا زیندووە، ئەگینا هاوکارەکانی ئێستا و جارانیشت ئەوەندەی وەشوێن نەدەکەوتن. ئەگەر ڕاستیت دەوێ، من بۆ ئەو کارە نەهاتوومە لات."

"ڕاوەستە."

ئەمرم بە "زاوا" کرد، کە ئێستا هەم بەردەستم بوو و هەمیش ئاگای لێم بوو، چا و شیرینی بۆ جەنابی وەزیر بێنێ. تۆزێک قسەی خۆشمان کرد و زاوام ناردە ڕاوە ژیشک*، بۆ ئەوەی بەتەنیا بین و نەتوانێ گوێمان لێ هەڵبخا. لەودەمەوە کە کرابوومە جێگری سەرۆکی ئاژانس و لە باخی نیاوەران دەژیام، چەند کەسێک بەردەوام لە دەوروبەری قاسید و ئێشکگر بوون، نەکا ناحەزان زەبرێکم لێ بوەشێنن. یەکێکیان "زاوا" بوو، کە ئیتر ببووە پسپۆڕی بنەماڵەکەم و پێشینە و هەموو شتێکم. ئەو بەندەی خوایە کابرایەکی سادە بوو و پاش ئەوەی کەوتینە نامەگۆڕینەوە لە لەندەنەوە، متمانەمان بە یەکتر کرد و، هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتمەوە، پێی گوتم کە جیهانگیر ڕایسپاردووە هەموو ڕۆژێ ڕاپۆرتێکی لەسەر هاتوچۆیەکانی من بۆ بەرێ. دیارە دەیتوانی بنووسێ کە وەزیری داد هاتووەتە لای من، بەڵام نەمدەویست ئاگای لە بنج و بناوانی کاری من بێ و بزانێ چ دەکەم. کە زانیم کەسمان لە دەور نییە، گوتم: "جا پرێسکەی دڵت بکەوە. مەترسە. قسەکانمان لە هیچ کوێ نانووسرێنەوە و لە هیچ کوێیش ناگێڕدرێنەوە."

"لە بارەی سپاسالار هادییەوەیە، کابرایەکی ملهوڕە و لە هیچ کەس و هیچ شتێ ناترسێ و هێشتا، سەرەڕای ئەوەی چەند مانگە لە زیندانە، هێشتا هەر پێی وایە سپاسالارە و چەندین لەشکری لەبەر دەستن. ئەفسەرێکی خوێنەوار و بەئەزموونە، کە چەندی چەند ساڵان سەرۆکی کۆلێژی سەربازی بووە و یەکێکە لەو کەسە بەناوبانگانەی لە ئازەربایجان سەرکەوت."

"چ تۆمەتێکیان داوەتە پاڵی؟"

"هیچ بەڵگەیەک لە گۆڕێ نییە. ئاماژە زۆرن. چەندی چەند ساڵان بەرپرسی کڕینی چەکوچۆڵ لە ئەمریکا بووە. لە سۆنگەی پێشنیاری ئەوەوە نەوتێکی زۆر درا بە ئەمریکا بۆ ئەوەی چەکی لێ بکڕدرێ، تا وای لێ هات لە ڕۆژنامەکانی دەرەوەی وڵاتدا دەڵێن، دەوڵەتی ئێران پاش ئەڵمانیا و بەریتانیا لە هەموو وڵاتانی ناتۆ چەکدارترە. لەو بوارەوە کۆمەڵێک زانیاری لە ڕۆژنامەکانی فەرەنسا و سۆڤیەتدا بڵاو بوونەتەوە. ئەو کڕینانە، جگە لەو و هاوکارێکی دیکەی کە لە فەرەنسا ماوەتەوە و نەهاتۆتەوە ئێران، کەس لێیان ئاگادار نییە. تەنانەت شاهەنشاش. هەر ئەو گوێنەدانە بە خاوەنشکۆ، ئەوی زویر کردووە و ئێستا هادی کەوتووەتە بەر غەزەب و دەبێ تاوانەکەی بدا."

"تۆمەتی ماڵییشی دراوەتە پاڵ؟"

"ئەی ئەو هەمووە مڵک و ماڵە نمروودییە لە کوێوە هاتووە؟ بەڵام بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە. هیچ شتێک نییە. خۆی پێوەندیی بەم دادگەیەوە نییە. دەبێ لە دیوانی حیزبدا یەکلا بکرێتەوە. بەداخەوە چونکە خاوەنشکۆ خۆی باشاری ناکا و دەترسێ ئەگەر زۆری بۆ بێنن ناو و ناوبانگێک بۆ خۆی دەستەبەر بکا، بۆیە کارەکەیان بە دادگا سپاردووە و، ئێستایش من تێدا ماوم. بە دڵنیاییەوە لە ئەمریکایش تۆمەتبار خەڵکێکی هەیە هاودەستی بن و لای بگرن. ئاساییە کە بایی سەدان ملیۆن دۆلار کڕین، بەبێ فرتوفێڵ جێبەجێ نابێ و کارخانەکانی چەکسازییش سوودێکی باشیان لەو ساتوسەودایە وەرگرتووە و حەز ناکەن دارەدەستەکەیان بکەوێتە مەترسییەوە و لەمەودوا کەس نەوێرێ ساتوسەودایان لەگەڵ بکا. ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی نووسیبووی، لە هەر دۆلارێکی کە ئەمریکییەکان لەبری نەوت دەیدەنە ئێران، دوو دۆلاری دەگەڕێتەوە. بەرهەڵستکارانیش هەرایان لێ بەرز بۆتەوە. سەناتۆرێک ناڕەزایەتیی دەربڕیوە، کە ئێمە خەریکین بەبێ ئەوەی خۆمان بزانین دەخزێینە نێو کۆمەڵێک مشتومڕەوە، کە هیچ پێوەندییەکیان بە ئێمەوە نییە. بەرژەوەندییە

*ڕاوەژیشک/ژووشک: ناردنی کەسێک بۆ ڕاوەژووشک، وەختێک دوو یان چەند کەسێک دەیانەوێ کارێک بکەن بەڵام یەکێکی دیکەیان لەلایە و حەزناکەن ئاگادار بێ، بەشوێن کارێکیدا دەنێرن بۆ ئەوەی تا دێتەوە ئەوانەی ناردوویانە کارەکەی خۆیان بکەن.

حەیاتییەکانی وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوت، لەبەر ئەوەی ئێمە خەریکین ئێران پڕچەک دەکەین، دەکەوێتە مەترسییەوە و، هیچ دوور نییە ئەم چەکوچۆڵە لە کەنداوی فارسدا شەڕ و دوژمنایەتییەکی لێ بکەوێتەوە و زۆر شتی دیکەش...
شاهەنشا پێیان وایە ئەم هەڕوگیڤانە بە مەبەستی پشتیوانییە لە سپاسالار. خۆشیان بەگومانن. جارێکیان فەرموویان، دەبێ کارەکە یەکلا ببێتەوە. ئێمەیش پێنج ساڵمان زیندانی بە تاوانی بێ دسپلینی بۆ بڕییەوە.

دوایی خزم و کەس و دۆستەکانی لە بەریتانیا و ئەمریکا کردیانە هەرایەک هەر مەپرسە. شاهەنشا دەماری بەزەییان جووڵا. فەرموویان، زۆرتان بۆ هێناون و لەوانەیە پێویست نەبووبێ ئەوەندە سزا بچێژێ. خۆ دەبینن من چارم نییە و گیرم خواردووە و ئێستایش ئەوە فکرێم بە مێشکیدا هاتووە و هاتووم تەگبیر بە دۆستێکی بیست ساڵانەی خۆم بکەم."

بە لەبزێکی ئەوەندە پاکوبێگەرد و خۆمانە ئەم قسەیەی کرد :"هاتووم تەگبیر بە دۆستێکی بیست ساڵانەی خۆم بکەم."

"حەز دەکەی کۆنیاکێکت بۆ بێنم؟"

"ئەگەر بە مەبەستی پتەوتربوونی دۆستایەتیمان بێ و تۆیش بخۆیتەوە، زۆرم پێخۆشە."

شووشە کۆنیاکەکەم هێنا و لە دوو پیاڵەم کرد و لێکمان دا و هەڵمان دان.

"دەی جا بزانم چ تەگبیرێک؟"

"ئەوەم بۆ وەزیری دەربارییش باس نەکردووە، کە یەکێکە لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆم. تۆ یەکەم کەسی لەم شتە ئاگادار دەبی."

"دەمەوێ پێشنیار بە حەزرەتی خاوەنشکۆ بدەم، لە جێژنی نەورۆزدا کۆمەڵێک لە زیندانییەکان ئازاد بکا."

"دەتەوێ لێخۆشبوونی گشتی لە خاوەنشکۆ وەرگری؟"

"چ زیانێکی هەیە؟ شاهەنشا خۆشەویستتر دەبێ. هەم لە ناوخۆ و هەمیش لە دەرەوەی ئێران، کە هەموو ڕۆژێ باس باسی مافی مرۆڤە و دەبێتە ئامرازێکیش بۆ بانگەشەی ئەو بۆچوونە کە ئێران وڵاتێکی دیموکراتیکە و خەریکە لەو بوارەوە هەنگاوی گرینگ هەڵدەگرێ و هەم لە ناوخۆی وڵاتیشدا، بڵێی و نەڵێی دەبێ پێشی ئەو ناڕەزایەییانە بگیردرێ. ئێوە بە 30 تا 50 هەزار کارمەند و سێ ملیۆن سیخوڕەکەتانەوە و ئێمەی حکوومییش بە ڕاگەیاندنی لێخۆشبوونی گشتیی شایانە..."

"ئەو سێ ملیۆن سیخوڕ و شەش هەزار ساواکییەت لە کوێ هێناوە؟"

"ئەوانە ئەو دەنگۆیانەن کە لە میدیا بیانییەکاندا بەتایبەتی لە لێخۆشبوونی نێودەوڵەتیدا بانگەشەیان پێوە دەکرێ."

"مەبەستت لەو لێخۆشبوونی گشتییە چییە؟ دەتەوێ چ بکەی؟"

"ئەوە پرسیارێکی بنەماییە. یەکەم ئەو سپاسالار هادییە لەکۆڵ خۆمان دەکەینەوە و دوای ئەوەش، بەو گومانلێکراوانەی خۆیان شاردووەتەوە، تێیان دەگەیەنین و پێیان دەڵێین دەست لە شەڕاشۆیی هەڵگرن و بێن خەریکی بنیاتنان بن، کەس کاری پێیانەوە نییە. بۆ وێنە، یەکێکیان هەر ڕوقیە خانمەیە، کە تا ئێستا کەس نەیگوتووە خراپەکارە. هیچ تاوانێکیشی نەکردووە، یان لانیکەم ئێمە ئاگامان لێ نییە. لێخۆشبوونێکی گشتی دەرفەتی پێ دەدا بچێتەوە سەر کارەکەی و، ژیانی خۆی بە فیدای چەند کەسێک نەکا. پێم وایە ئەم لێخۆشبوونە گشتییە ئاوێکە و بە سەر تێکدەریی ئاگرهەڵاییسێنەراندا دەکرێ."

"ئێمەیش لە گفتوگۆ تایبەتی و فەرمییەکانماندا بیر لەوە دەکەینەوە خەڵک هان بدەین بۆ شاپەرستی و نەهێشتنی ناڕەزایەتیی گشتی، بەڵام تا ئێستا کەس ئەوەی نەهێناوەتە گۆڕێ کە دەکرێ لەم ڕێگەیەوە بە ئامانج بگەین. ڕاشکاوانە دەڵێم، ئەو لێخۆشبوونە گشتییەی تۆ ڕێک پێچەوانەی سیاسەتی ئاژانسە. ئێمە وا خەریکین قانوونی 1310ی دژەکۆمۆنیستی توندتر دەکەین و بۆ ئەندامانی حیزبی توودە و لایەنگرانی مارکسیزم لێنینیزم لەبری دەساڵ زیندان، بە

لایەنی کەمەوە زیندانی تاهەتایی دەبڕینەوە، کەچی ئێوە چونکە بەدەست سپاسالارەوە گیرتان خواردووە، دەتانەوێ بۆ دەسرۆکەیەک، قەیسەرییەک ئاگر بدەن. هەر دەڵێی نازانن مەملەکەت خەریکە ئاگر دەگرێ. نەتانبیستووە لە مانگرتنەکەی پاڵاوگەی تەورێزدا چیی نەمابوو هەموو شارەکە خاپوور بێ؟ ئاگاتان لە مانگرتنی چیمەنتۆسازیی سۆفیان و ئێران ناسیۆناڵیش نییە؟ جەنابی ئاهاری، چۆن بزانی لە تێکهەڵچوون لەگەڵ فیداییان و مجاهدین و مارکسیست ئیسلامییەکاندا چەند کەس کوژراون و چەند کاربەدەستی ئاژانس گیانیان بەخت کردووە؟ خۆ ئەوەشت بیستووە کە پار بەهارێ سەرۆکەکەشیان کوژرا؟ جەنابی وەزیر، خۆ تۆ کابرایەکی کرچوکاڵ نی و دڵنیام تۆیش ئەوەت بیستووەتوە کە لە حوسێنییەی ئیرشاد چ روو دەدا. دەتەوێ یەکێک لەو تۆمارانەتان بۆ بخوێنمەوە کە هەموو رۆژێ سەددانە سەددانە لە ئێراقەوە بۆمان دێن، بۆ ئەوەی بزانی چ ناو و ناتۆرەیەک لە حەزرەتی خاوەنشکۆ و بنەماڵە شەریف و نەجیبەکەیان دەنێن؟"

جەنابی وەزیر نەیهێشت باقییەکەی باس بکەم.

"بەڵێ بیستوومە. بەڵام ئێوە تەنیا روویەکی دراوەکە دەبینن، دەبێ سەیرێکی ئەودیوی دراوەکەش بکەن. لەوبەریشەوە، ئەوە ئێوە و شاهەنشا و سوپا راوەستاون. خۆیان فەرموویانە کەس باشاری من ناکا و لەگەڵ منی پێ ناکرێ. مەلا کێن؟ کۆمۆنیستەکان هیچ گوویەکیان پێ ناخورێ. ئەو "بەرەی ئازادی"یەم وا کلک و گوێ کردووە، بۆ حەوت پشتیانم تەمبێ کردوون. من حەوسەدهەزار سەربازم هەیە. بفەرموو با بێنە مەیدان."

"ئەو قسانە راستن. بەڵام ئاخر دەزانی، کە ئەو شریتانە دەکەونە دەست ئەو خەڵکە رەشۆک و گێلە، چەندەیان کار تێ دەکا؟ دەبێ بڵێم زۆر زیاتر لەوەی میدیاکان هەوڵ دەدەن بیخەنە مێشکی خەڵکەوە. ئەو شریتانە خەڵک دەورووژێنن. بەڵێ، با بکەونە دەست موسەدیقییەکان، جا دەزانی چ هەرایەکی پێ دەنێنەوە. ئەوان ئازادییان دەوێ. داوای مافی ئینسانی دەکەن. داوای هەڵوەشاندنەوەی حیزبی رەستاخیزە، هەر ئەوشتەی شاهەنشا ئەوەندە دڵی پێوەیەتی. خۆ لە ناوەرۆکەکەی تێدەگەی؟بەو حاڵەوە ئیتر من ناتوانم لە نیاوەران باخ و خانووەکم هەبێ و تۆیش جەنابی وەزیر ناتوانی لەسەر کورسیی وەزارەت پاڵ بدەیتەوە."

"ئەی کەوابوو رێگەکەی چییە؟ هەموو ئەو شتانەی تۆ باسیان دەکەی، ئەوەیان لێ دەکەوێتەوە کە ئاگرێک لە بن خۆڵەمێشەکەدایە و خەڵکێکیش هەرچۆنێکی بێ بە شریت و وتار و ئامۆژگاری و بەیاننامە فووی لێ دەکەن و دەیگەشێننەوە و بڵێسەکانیشی بە مانگرتن و هەڵکوتانەسەر ناوەندە دەوڵەتی و دامەزراوە ئەمریکاییەکان بڵێسە دەستێنێ."

تاوێک راوەستام. دیتم ئەو تازەبەسەرداکەوتووە خەریکە یاری بە ئاگر دەکا. خۆم پێ نەگیرا.

"گەنجۆ، وادیارە لە کارەکەت رازی نی و لەوە زیاترت دەوێ. ئەگەر دەوێری ئەم قسانە بە تیمسار سەرلەشکر بڵێ با نێفەکت ببڕێ. نازانم چیی لێ قەوماوە، هەموو شەوێ دەستەی سەربازان دەباتە سەر ماڵی خەڵک و تاوانبار و بێتاوان دەگرن. هەموویان شڕ و شپرز دەکەن. پێت وایە دڵی نایە تۆ و سەرۆکوەزیرەکەت و هەمووتان وا هەڵدێرێ، کەس بەدەنگتان نەزانێ؟"

جەنابی وەزیر مات بوو و هیچی نەگوت. کۆنیاکێکی دیکەم بۆخۆم و ئەویش تێکرد و گوتم:

"بە خۆشیت."

"خۆشت بێ".

دەیویست هەستێ بڕوا. دەستم لەسەر شانی دانا و گوتم:

"لە خۆوە هەڵچووم. من تۆم وەک برای خۆم خۆش دەوێ و دڵنیاشم کە ئەگەر رۆژێک تووشی تەنگانە بم، تۆ و دۆست و برادەرەکانت رزگارم دەکەن. مەبەست ئەوەیە کە لە خۆوە هیچ نەکەی. لێخۆشبوونی گشتی کارێکی باشە،

بەڵام ئێستا کاتی نییە. دەبێ سەبرت بێ تا ئەم هەڵبژاردنەی ئەمریکا دەکرێ. سەفەرەکانی شاهەنشا بۆ سۆڤیەت و ئەمریکا تەواو ببن و دڵنیا ببنەوە کە لە لایەن چەپەوە کەس زەبر ناوەشێنێ و، لە ساتوسەوداکەشیدا لەگەڵ ئەمریکا سەرکەوتووانە بێتەوە، ئەوکات لەوانەیە ئەگەر هەلەکە لەبار بوو دیسان دابنیشینەوە و دوو قسە بکەین کە بزانین کێ بۆ تەگبیر و راوێژ باشە. بۆتۆش وات بە قازانجە ئەم باسە لای کەس نەکەی. ئیتر تەواو."

بانگی زاوام کرد. هەر هات پەردەکانی لادا. هێشتا تەزووی سەرمای زستان چزووی دەگرت. گوتم:

"جەنابی وەزیر ئەمشەو میوانی ئێمەن. ئەمر بکە خواردنێکی خۆشمان بۆ لێ بنێن."

ئیتر قسەیەکی جیددیمان نەبوو بیکەین. بۆ ئەوەی لەو دڵتوندییە دەری بێنم، لە خاوخێزانیم پرسی. دەمزانی کچە شیرازییەکی بەناوی گوڵەندام هێناوە. لێم پرسی:

"دیارە لە ئاشناکانی ئەو سەردەمەتە کە لە شیراز دژیای."

"تۆ کە خۆت هەموو شتێک دەزانی، بۆ دەپرسی؟"

"توودەییش بووە؟"

"نا، لە شیراز بنەماڵەکەیم ناسی. گوڵەندامیان نارده فەرەنگ (ئەورووپا)" و داوایان لێ کردم ئاگام لێی بێ. دۆستایەتییەکەمان لەوێوە دەستی پێ کرد."

"منداڵیشتان هەیە؟"

"چوار ساڵانەیە."

"تەمەندرێژ بێ."

ئیتر تا وەختی رۆیشتنەوەی هەر قسەی قۆڕ و سواومان کرد. تەلەفۆنی کرد و داوای شۆفێرەکەی کرد و منیش تا بەر دەرگای باخەکە بەڕێم کرد. تاوێک لە دەوری هەسێڵەکە پیاسەم کرد و چوومە هۆڵی میوان و ئەو شریتەی بە دزییەوە لە قسەکانیم هەڵگرتبوو، خستمە تەسجیلەکەوە و لەبەر خۆمەوە گوتم:

ـ ئەی لەو کەرە. هەر کەسە و لە فکری خۆیدایە.

نیوسەعاتێک لە سەر مۆبڵەکە لێی تخێڵ بووم و ئەوە لەگەڵ ئەم جەنابی ئاهارییەم تێپەڕ کردبوو، هەمووم هێناوە بەرچاوی خۆم. ئینجا فکرێکم بە خەیاڵیدا هات. هەستام دیبسان چوومەوە نێو باخەکە. سەیرم کرد هەر سێ پاسەوانەکەم لە ژوورەکانیاندا خەوتوون. ژوورەکەی زاوا رووناک بوو. لە دەرگام دا و چوومە ژوورێ. لە پشت مێزەکە دانیشتبوو و خەریکی نووسین بوو.

"بەو درەنگانی شەوە راپۆرت دەنووسی؟"

"ئیتر ئەرکە و دەبێ رایپەڕێنم."

"بچۆ بخەوە. بەیانیش کاتت هەیە."

"نەخێر، تا تۆ نەخەوی، ناچم بخەوم."

"ئەی ئەو سێ پاسەوانەم بۆ چییە؟"

"قوربان، ئەوانە خەڵکێکی سەرسەرین. بەکرێ گیراون. ئەوانە بەکاری ئێمە نایەن. من نازانم ئەگەر تاڵە موویەک لەسەری تۆ کەم بێتەوە، چ بەڵایەک بەسەر من دێنن؟"

"جا خۆ تەختێکی خەویشت نییە لێرە؟"

"ئاخر، شەوانە کە تۆ خەوتووی، سەرێکی ماڵەکەی خۆمان دەدەم."

"هەم ئێرەت پێ ئەسپێردراوە و هەمیش ئەوێ؟"

"لەبری ئەوە مزێکی باش وەردەگرم."

"به ڕۆژ كه تۆ له ماڵەوه نی، كاتی خەوتنی منه."

"له بیرت نەچێ، ڕاپۆرتەكه ورد و دروست بگەیەنی، كه وەزیر له كەیەوه تا كەی میوانم بوو."

"خەمت نەبێ. لەو وەختەوه كه دیسان دكتۆر بیژەن هاتووەتەوه ئیداره، دەیەوێ ئاگاداری هەموو شتێك بێ."

"ئەی خەبەری ڕوقیه؟"

"خەمی ڕوقیەت نەبێ. لێره نییه. بێ و نەبێ له دەرەوەی وڵاته. دەڵێن له فەلستین سۆراغیان كردووه. هیچ شتێكیش له ماڵی دایكت نەقەوماوه. جگه له جەنابی مووسا خان و ژن و منداڵەكەی كەس سەر لەوێ نادا. دایكت جاروبار دەچێته مزگەوت و ڕەوزەخوێنی. ئێستا ئەوه دوو حەفتەیەكه له ماڵێ وەدەر نەكەوتووه. خوا بكا نەخۆش نەبێ."

"خوا بكا."

ئەگەر ڕاستیت دەوێ، شتێكم به خەیاڵیدا هاتبوو، هاتم لەگەڵ جەنابی زاوا بیهێنمه بەرباس.

"ئەرێ ژنەكەت چۆنه؟ منداڵەكەت چەند ساڵانه؟"

"قوربان، ئێستا دەچێته قوتابخانه. دەستت ماچ دەكا."

"دەمەوێ هەر لەم مانگەدا كه تەزووی سەرما شكا، دوو سێ برادەری خۆم بانگهێشت بكەم. دەتوانی خزمەتیان بكەی؟"

"جەنابت ئەمر بفەرموون قوربان لەسەر چاومی دادەنێم. به ژنەكەم دەڵێم ڕۆژێك پێشتر بێته ئێره و هەموو شتێك ئاماده بكا."

"دەكرێ كار بەو پاسەوانانەش بكەی."

"قوربان ئەوانه هیچیان پێ ناكرێ. ڕۆژتائێواره مەستن. تەنیا به كاری شەڕەشەق و ملهوڕی دێن. ئەویش باشه لێره ئەوشتانه نییه تا هونەری خۆیان بنوێنن."

"بەو حاڵەشەوه وا باشتره یەكێكیان تا بەیانی بەخەبەر بێ و ئێشك بگرێ."

"چۆن دەفەرمووی با وابێ. به دكتۆر جیهانگیر دەڵێم جەنابت وات فەرمووه."

دەمویست هەر سێ دەسپەروەردەكەی خۆم وەك بیست ساڵ لەوەپێش بۆ شەوێ بانگهێشت بكەم. ژنەكانیشیان لەگەڵ خۆیان بێنن. به نانی ئێواره و شەراب و شیرینی بیانخافڵێنم. پێم وابوو وەك له قسەكردن لەگەڵ وەزیری داد زۆر شتم لێ ڕوون بۆوه، ئاوا له قسەوباس لەگەڵ خانعەلیی سەرۆكی زانكۆی تەورێز و دەماوەندیی وەزیری دەرباریش هەندێ شت هەڵدەكرێنم. هەرچۆنێك بێ، دەبێ به فێڵێك خۆ بخزێنیته نێو دڵی یار.

ئەو میوانییه سەری نەگرت. پەروەندەكانیان شتێكی سەرنجڕاكێشی تێدا بەدی نەكرا. دەماوەندی خەریكی كڕینی مڵك و ماڵ بوو له گیلان و مازەندەران. زستانانەش له ئاوەلی خەریكی خلیسكانێ بوو. خانعەلیی سەرۆكی زانكۆی تەورێز ناقایل بوو و ئیرەیی دەبرد كه برادەرەكانی دیكەی بوونەته وەزیر و ئەو له گۆشەیەك كەوتووه. حەزی لێ بوو ببێته پارێزگاری خۆراسان و سەرپەرشتیاری شوێنه پیرۆزەكان. سەیرم كرد ئەو ئیمامزادانه كەرامات و پەرجۆیان لێ ناوەشێتەوه. هۆكارێكی دیكەی ئەو كۆبوونەوەیه نەكرا، نەخۆشیی دایكم بوو.

هەر سەعاتێكی بۆم لوابایه سەرێكم لێ دەدا. پزیشكم دەبرده سەری. بردمه لای پرۆفیسۆرێكی ئەمریكایی كه له زانكۆ دەرسی دەگوتەوه. هیچ كامیان دەردێكی تایبەتیان تێدا نەدۆزییەوه.

دەستەوداوێنی مووساگیان بووم:

"دایكم چیەتی؟ دكتۆر دەڵێن هیچ ئەلەمی لێ نییه. دەردی پیرییش نییه. نەكا دیسان سەروسەكتی ڕوقیه دەركەوتبێتەوه و ناڕەحەتی كردبێ؟"

"قوربان، من خزمەتكارتم. ناوێرم ئامۆژگارییەكت بكەم. بەڵام دەیڵێم. دەبێ ئەو بەڕەیەت له گێژاوێ دەركێشی."

"یانی چی؟"

"دەڵێم دوو سێ مانگێک ئیجازە وەرگرە و دایکت بەرە شوێنێک. شوێنێکی وا کە تەنیا نەبێ و بیر لە روقیە نەکاتەوە. لێرە خەریکە بە خەفەتان خۆی دەکوژێ. هەرکەس بە کۆڵانێدا رادەبرێ، دێتە بەردەرگا و پێی وایە کچەکەی هاتۆتەوە. شەو و رۆژی لێ بووەتە یەک. لە خەو هەڵدەستێ و رادەکاتە بەر دەرکێ. هەمیشەی خوا شڵەژاوە. لە دیتنی روقیە بترازێ، بیر لە هیچ ناکاتەوە."

"ئەو شیعرەی گوتت، یانی چی؟"

"قوربان، دۆخەکە زۆر خراپە."

"دیسان یەکێک لەوانەی بانک، کێچی لە کەوڵت خستووە؟"

"قوربان، ئیتر باسی کارمەندانی بانک نییە. کەس نییە بە ئاشکرا باسی وەزعەکە نەکا. زۆر خراپ باس دەکەن. ئەو رۆژژمێرە نوێیە کاریگەریی زۆر خراپی داناوە. خەڵک دەڵێن ئەوە رۆژژمێری گاورانە. دەڵێن شا کافر بووە."

نەمویست و لێی نەگەڕام ددانی لێم سپی بێتەوە و چیی دیتوویەتی لەبەرچاوم بیڵێ.

"مووساگیان، من هاتووم لێت بپرسم دایکم چۆنە."

"قوربان دایکیشت هەر بەو شتانە تێک چووە. شتێکی لە روقیە بیستووە، بۆیە وا خۆی دەخواتەوە."

"چیی بیستووە؟"

"من هەر ئەوەندە دەزانم کە دایکت ژنەکەی مانگێک لەوەپێش نییە کە شاد و بەکەیف بوو. زۆر مات بووە. هەر بۆیە پێت دەڵێم، هەڵیگرە و لەو گێژاوەی رزگار بکە."

فکر و خەیاڵی بۆ دروست کردم. خوا بەو رۆژە نەکا، بێت و شتێکی لێ بێ، هەموو دینا و بەتایبەتی روقیە دەڵێن، من بوومە باعیسی و من کوشتم.

بەتەنێ بوو کە چوومە لای.

"دایە گیان، وەرە چەند حەفتەیەک پێکەوە سەفەرێکی بکەین."

"من ناچمە هیچ کوێ. لێرە دەبم تا روقیە دێتەوە."

"چووزانی روقیە دێتەوە؟"

"دەزانم. ئەمڕۆ سبەی دێتەوە."

لە دڵی چەقیبوو و ئیمانی هێنابوو و ئیتر هیچ کەس باشاری نەدەکرد و پاشگەزی نەدەکردەوە.

دەستمم توند قووچاند. نووکی پەنجەم لە لەپی دەستم رۆ کرد و لەبەرخۆمەوە گوتم:

ئەو کچەتیوە لە هەموو جێیەک بەڵای گیانمە.

مووسا گیان راستی دەکرد. خەڵک چاویان کرابۆوە. بگرەوبەردە چاری نەدەکردن. خۆ نەدەکرا هەمووشیان بگری و ئەشکەنجەیان بکەی و گوللەبارانیان بکەی. ئەوانە ئیتر مجاهید و فیدایی نەبوون کە بڵێین لە راکردندا کوژران. چەند مەلایەک و چەند کەسێکی بەرەی نیشتمانییان قۆڵبەست کرد. فایدەی نەبوو. دەنگێکمان کپ دەکرد، سەد دەنگی دیکە لە ئەورووپا و ئەمریکاوە هەڵدەستا. خاوەنشکۆ خەریک بوو دەهری دەبوو.

لە کۆتاییەکانی ساڵی 1356ـدا بەرەی نیشتمانی ڕاگەیەنراوێکی دەرکرد. بەرنامە 12 مادەییەکەی خۆی بڵاو کردەوە. داوای هەڵوەشانەوەی ساواکیان دەکرد. ڕزگاریی هەموو زیندانییە سیاسییەکان. ئازادیی حیزبەکان و ڕۆژنامەنووسان و ڕێکخراوە کرێکارییەکان. سزادانی ئەشکەنجەگەران بەشێک لە ئامانجەکانیان بوو.

ئەگەر من و کەسانی وەک من تەواو پشتمان بە شاهەنشا گەرم نەبایە و لێی دڵنیا نەباین، بەجێ بوو هەر ئەودەم کالەی لێ هەڵبەستین و تێی تەقێنین. زۆر کەس پووڵەکانیان دەبردە بانکەکانی دەرەوەی وڵات. تەنیا لە بانکی "سادرات" و "واردات" لە ماوەی ساڵێکدا بەپێی ڕاپۆرتی سەرۆکی بانک، دووسەدوبیستوهەشت ملیۆن دۆلار ڕاگوێزراوەتە ئەمریکا و ئەورووپا. بە پێی خەملاندنێک، لە هەموو بانکەکانی ئێران ئەو بڕە پارەیە لە دوو ملیارد دۆلار تێپەڕیوە. ئەوە، بڕی ئەو دراوە بیانییەش حیساب نەکراوە کە دەوروبەرییەکانی خاوەنشکۆ ڕایاندەماڵی.

کۆتایی مانگی بەفرانبار بوو، کە ڕۆژگار پشتمی شکاند و من قەت لەبیری ناکەم. بەفر هەموو شەقامەکانی دەوروبەری نیاوەرانی گرتبوو. دارە سنۆبەرەکان کفنی سپییان پۆشیبوو. هاڕە و دەنگی ترۆمبێل کەم ببۆوە و تەنیا دەنگی نەرمی خشکانی تایەکانیانت دەبیست کە بیست تا سی سەنتیم لە بەفرەکە ڕۆدەچوون. نیو سەعاتێک بە باخەکەدا گەڕام. سەیرم کرد هێشتا چرای ئۆفیسەکەی زاوا داییسێ. نەمویست هەروا چاوەڕوانم بێ و نەتوانێ بنوێ. چوومە ژوورێ و درەگاکەم داخست.

نیوەشەو زاوا بە تەلەفۆن بەخەبەری هێنام و گوتی، هاوکارەکەی ژنێکی دیتووە کە بە چارشێوەوە سەربانە و سەربان ڕۆیشتووە تا گەیوەتە ماڵی دایکم و، ئەویش واتە زاوا بە پێی ناونیشانی بەژن و باڵا و قەڵەمبازی لەسەر دیوارەکانەوە لێی سوور بووە ئەوە ڕوقیە بووە. بە هەڵەداوان سواری ترۆمبێلەکەم بووم و بە هەڵپە خۆم گەیاندە شەقامی کەلانتەر و چیی لە دەرگام دا دایکم دەرگای نەکردەوە. لە دیوارەکە وەسەر کەوتم و خۆم فڕێ دایە نێو حەوشە و دایکمم لە خەوی شیرین هەستاند. هیچ نەترسا و شلوێ نەبوو. لەسەر خۆ وەڵامی پرسیارەکانمی دەداوە. هەر نەیگوت چ رووی داوە. پێم چەقاند بیبەمە ماڵەکەی خۆم لە نیاوەران. بێ فایدە بوو. "دایە گیان، ئەم ماڵە بۆ تۆ جێیەکی ئەمن نییە. وەرە سەرمان پێکەوە دەنێین. وەرە لە کن خۆم بە. وەرە پێکەوە بچینە خانووەکەی من."

"تۆ تەنیا دەتوانی تەرمەکەی من لەم ماڵە بەریتە دەرێ."

"تۆ لێرە پارێزراو نی."

"بۆچی! چ کەتنێکت کردووە؟"

"چ کەتنێک؟"

"ئەو شتانە چین هەڵتانگرتوون و لە ڕۆژنامەتان خستوون؟"

"ئەڵاهوئەکبەر، ئاگای لەو کورتە وتارە بوو کە لە ڕۆژنامەدا دژی ئایەتوڵا بڵاو ببۆوە. تەنیا ئاگای لەوەندەیە نەبوو کە بە دنەدانی تیمسار سەرلەشکر ئەو وتارە دانرابوو، ئەویش بە مەبەستی سەرکوتکردن."

"دایە ئەتۆ چیت بەو جۆرەکارانە؟"

"چۆن کارم پێیانەوە نەبێ؟ ئەی تۆ هەتبێ؟ ڕوقیە هەیبێ؟ من نەمبێ؟"

دەرەقەتی دایکم نەهاتم. ئەو تارماییەی هاوکارەکەی زاوا لە سەربانی ماڵی دایکم دیتبووی ڕوقیە بوو یان نا، روون نەبۆوە. بەڵام لێم ڕوون بوو دایکم و ڕوقیە پێوەندییان پێکەوە هەیە.

وڵات وا شێوابوو، کە ئیتر هەموو ڕۆژێ سێبەری سیاسەت دەگەیشتە گشت جێیەک و دەخزییە هەموو کون و کاژێرێکەوە. دایکم هەستی دەکرد زۆر شت دەقەومێ. بەڵام ئەو ڕووداوانەی لە شێوەی گەڕانەوەی کچەکەیدا دەدی.
کە فەقێکان لە قوم کۆ دەبوونەوە و دروشمی "مەرگ بۆ شا"یان دەگوتەوە و تیمسار سەرلەشکر بە دەردی کۆمۆنیستەکان لافاوی خوێنی هەڵدەستاند، ئیتر دیار بوو جەنگەکە هەڵاییساوە و شەڕی نێوان خەڵک و ساواک. لایەک ئێمە بووین و لایەکیش رووخێنەرانی پادشایەتیی مەرجدار و مەلاکان و مجاهدین و فیداییان و "جانباختگان" و ملیۆنان خەڵک.
ئەوە گەمەیەکی گورچوبڕ بوو. هەندێ لە کارمەندان حیسابی خۆیان کرد و مشوورێکی گیان و ماڵی خۆیان خوارد و بار و بنەیان کۆ کردەوە و تێیان تەقاند. زۆربەی ساواکییەکان دوو قاچی دیکەشیان قەرز کرد و فیزماڵکیان دایە و لەگەڵ خێزانەکانیان پێچایانەوە و چوونە ئەمریکا و بەریتانیا و ژمارە حیسابی دیکەیان کردەوە.
راستە منیش هەر بیرم لەوە دەکردەوە. عەزابی ویژدانم نەبوو کە پشت لە خاوەنشکۆ بکەم و راکەمە ئەورووپا، ئەگەرچی ئەو سامانەی هەمبوو بەشی ئەوەی نەدەکرد بتوانم تا دەمرم بە بەهرەی سەرمایەکەم بژیم. کۆسپی سەر رێگەم دایکە نەخۆشەکەم و روقیە خۆشبەزەکەی خوشکم بوو.
زۆر زوو روون بۆوە کە خوشکم یەکێکە لە سەرکردەکانی تێکدەران.
هەموو چلەیەک بە بۆنەی خوێنڕژانەکەی قومەوە، لە شار و دێهاتەکان رێوڕەسمی تازیەباری رێک دەخرا، قوتابخانەکانیان دادەخست. بازاڕ دادەخران و مانگرتنی کرێکار لە کارخانەکاندا نیشانەی بەرگریی هەموانی بوو.
لە چلەی خوێنڕژانەکەی قومدا لە تەورێز خەڵک بە مەبەستی تازیەباری دەچوونە مزگەوت. پۆلیسی گەڕەکی 6 دەرگای مزگەوتەکەی داخست و دروشمەکانی دڕاندن. جوامێرێک لە ناوی تاجعەلی لە هەمبەر ئەو بێڕێزییەدا ناڕەزایەتیی دەربڕی. سەرۆک پۆلیس بە نەزانی لێی هەڵکێشایە دەمانچە و دەمودەست کوشتی. جا وەرە خەڵک پەنجەرە و شووشەی دووکانیان شکاند. لە بانکەکاندا چیی بەڵگەنامە بوو دڕاندیانن. سوپایی تەقەیی هەواییان کرد بۆ ئەوەی جەماوەرەکە بترسێنن. ساواکییەکان لە کۆڵانێ خۆیان مەڵاس دابوو و دایاننە بەر رەهێڵەی تیربار. بە لانی کەمەوە 600 تا 700 کەس بریندار بوون و سەدان کەس کوژران.
بەهاری ساڵی 1357 زیندانییەکان مانیان گرت و 450 کەس برسێتییان چێشت. چەند کەسێکیان چیی نەمابو بمرن. شیعری داشۆرین و جوێن بۆ شا، زار بە زار دەگەڕا.
دایکم لە ئاکامی دوژمنایەتی لەگەڵ شا، کە دوژمنی کچەکەی بوو، هەقایەتی ماسیگرەکەی بۆ ... کە هێشتا زمانی نەگرتبوو گێڕاوە و، من بەدەم قسەکردن لەگەڵ مووساگیانەوە گوێم لێ دەبوو. ژنە، نە برنجی هەیە و نە رۆن و نە خەڵوز، بۆ ئەوەی شیوێک بۆ مێردەکەی لێ بنێ. ماسیگرە لە داخان ماسییەکەی فڕێ دایەوە نێو ئاوەکە. ماسی لە ئاوەکەدا جووڵەیەکی کرد و هەرای کرد: "بژی شا، بژی شا". خەڵکیان ئاوا تین دابوو. ئیتر سەیر نەبوو کە رۆژی 28ی گەلاوێژی 1357 سینەما رۆکسی ئابادان ئاگر درا و لە هەموو جێیەک، هەموان دڵنیا بوون ئەو جەنایەتە ساواک کردوویەتی. شەش سەد کەسیان بە دووکەڵ خنکاند و بە ئاگر برژاند. دایکم لە منی پرسی:
"تۆش لە ئابادان بووی؟"
ساواکییەکان دەنگۆیان بڵاو دەکردەوە، کە ئەم خراپەکارییە، "رێکخراوی سوور و رەش" کردوویەتی.
ئیتر کار لە کار ترازابوو. ئەوەی دەبوو ببێ، بوو.
ئەو شەوەی بۆ سبەینێکەی، سوپایی و ساواکی لە تەورێز رەشەکوژییەکەیان کرد، سەرەڕای ئەوەی پاسەوانەکانی من لە سێ کەسەوە کرابوونە پێنج کەس، دوو بەتڵی شەو راشکا بوو، کە لە پڕ دەرگای ژوورەکەم کرایەوە و زاوا لەگەڵ روقیە و چەند چەکدارێک لەبەر دەرگاکەم قوت بوونەوە. لە پێشدا زاوام دیت روقیە لە پشتەوەی بە دەمانچەیەکەوە. لە

پشتەوەی ئەویش چەند کەسێکی ڕەشپۆشی مسەلسەل بەدەست. خوشکەکەم ئەمری بە مێردە چەندرۆژەکەی کرد "قسە بکە"

"قوربان، روقیە خانم دڵنیای کردوومەوە کە هیچ خوێنێک نارژێ. خەریک بووم لە باخەکەم دەچوومە دەرێ و دەمویست لە دەرەوە دەرگاکە دابخەم، کە دووکەس توند گرتیانم. دوو پاسەوانەکەی دەرەوەی باخیش گیرابوون. قفڵەکەیان کردەوە و هاتنە ژوورێ. بە ئەمری روقیە خانم ئەمرم بە پاسەوانەکان کرد چەکەکانیان دابنێن. ئەمری ژوور خۆیان بوو. بە قسەیان کردم. دوایی هەر سێ پاسەوانەکەیان کە سەرخۆش بوون، لە گەراجەکە کرد و قفڵیان لە دەرگاکەی دا و مسەلسەل بەدەستێکیان لەوێ بۆ دانا. منیشیان هێنا بۆ ئەوەی ژوورەکەی تۆیان نیشان بدەم."

سەرسڕماو و لە ترسان قەڵەمی دەستوپێ شکاو، سەیری خوشکمم کرد. ئەو کچۆڵە نازدارەی من دەمناسی هەو نەبوو. چاوی سوورهەڵگەڕاوی شەونخوونی چەشتوو، ڕوومەتی تێک قوپاوی ڕەنگبزرکاو، لێوی ڕەشهەڵگەڕاوی شەقارشەقار، روخساریان پڕ کردبوو لە قین و رق. لووتە باریکەکەی، وەک سەردەمی منداڵی نەمابوو. دەمارگرژی و شێلگیری و چاوقایمی بە هەموو جووڵەیەکییەوە دیار بوو. کە دڵنیا بۆوە من جلوبەرگی خەوم لەبەرە و چەکم پێ نییە، دەمانچەکەی لە قایشەکەی ختستەوە و بە قەدییەوە هەڵواسی.

ڕەشپۆشەکەی هاوڕێی، دەمانچەکەی منی کە لە نێو گیرفانی جلەکانمدا بە مێزەکەمەوە هەڵواسیبوو، دەرهێنا.

"فەرمووی دانیشتنم ناکەی؟"

مەبەستی تانە و گاڵتە نەبوو. گوتم:

"ماڵی خۆتە. لە کوێ دادەنیشی، دانیشە."

"ئێرە ماڵی من نییە، ماڵی من لە شەقامی کەلانتەرە. ئەمشەو نەهاتوومەتە لای براکەم. ویستبووت بمبینی. ئەوە من و ئەوەش تۆ..."

چیی نەمابوو بگریم. دەتگوت هەرچی شکۆ و پێگە و پلەی فەرماندەییمە، دەمودەست بوونە بڵقی سەر ئاو و وەک چڵکێک لە گیانم هەڵوەرین. خۆمم زۆر پێ دەستەوستان نەبوو. زاڵم بووم و خۆم مەزڵووم کرد. پێم وابوو بەزەیی پێمدا دێتەوە. بەڵام هیچ بەزەییەکم لێ نەدی.

گوتم:

"ئاوا؟"

"بۆ دەمتوانی جۆرێکی دیکە بتبینم؟"

"عومرێکە بە شوێن تۆوە بووم خوشکێ. لە هیچ تۆم نەدۆزییەوە..."

"تۆ لە من نەدەگەڕای، سیخوڕەکانی تۆ لە من دەگەڕان. بێت ئەوان منیان دۆزیباوە، ئیتر چاوت پێم نەدەکەوتەوە. من دەمێکە چەکدارم و ئیتر خۆم نادەمە دەست فێڵ و تەڵەکە و زوڵمەوە..."

"لە پێناوی چی؟"

"بۆ ئەوەی زوڵم نەبینم."

"هاتووی باسی سیاسیم لەگەڵ بکەی؟"

"نا، هاتوومە ئێرە وەڵام پەیامە ڤیدیۆییەکەمت لێ وەرگرم."

"جا بە دەمانچە و مسەلسەل؟"

"بۆ ئێوە بە نوقڵ و نەبات و ناز و نیعمەتەوە دەهاتنە شوێن ئێمە؟"

"چیت لە گیانی من دەوێ؟ پارە؟"

"نا، ئیتر پێویستمان بە پارە نییە. ئەوێ ڕۆژێ هەزار پاوند بۆ ئێمە، بایی نۆ هەزار شاهی بوو. ئەمڕۆ ئیتر دە ئەوەندەش زیاتر بە کەسانی وەک تۆ دەدەین کە لەگەڵمان بن و ببنە هاوسەنگەرمان."
بێدەنگ بووم. چاوم لەسەر یەک دانا. وەک بڵێی شتێک بە مێشکمدا هات: کە، خۆ بەدەستەوە بدە، دنیا بەسەری بە پووش نەگیراوە. لە ریزی ئەوانەشدا وەک دامودەزگاکەی خۆمان، دووڕوویی و دووبەرەکەی و چاولێکەری و خراپەکاری و فریو و پێگەپەرستی و سامانپەرستی هەیە. دەسەڵات هەموو ئەو گەندەڵیانەی بەدواوەیە. لەپڕ قەڵافەتی تێکدەرە کوژراوەکانی سەرکوتی مجاهدین و فیداییان و مارکسیست ئیسلامییەکان لەبەر چاوم قوت بوونەوە. تیمسار سەرلەشکر چەند بێبەزەییانە لە قوم قڕی کردن. هەر مێشێکیشی میوان نەبوو کە سەرباز ڕژانە ماڵەکەی ئایەتوڵا عوزماوە و چەند کەسێکیان کوشت. ڕق و قین و تووڕەیی و نەفرەت لە ڕوخساری کوژراواندا شەپۆلی دەدا. ئەرێ کەسوکاری ئەو کوژراوانە بۆ متمانە دەبن؟ ڕوقیەش یەکێکە لەوان.
خوشکەکەم ئەم بێدەنگییەمی زۆر خراپ لێک داوە. پێی وابوو دەمەوێ لەگەڵی ڕێک بکەوم. دەمارێکی ئینساف و جوامێریی لێ بزووت. هەرچۆنێک بێ ئەو ئافرەتە چەکدارە لە گۆشت و خوێنی خۆمە و ژنە و دڵێکی هەیە کە هێشتا خۆشەویستیی سەردەمی منداڵیی تێدا دەجووڵێ. ئەمری بە پیاوە چەکدارەکە و زاوا کرد لە بەر دەرگا ڕاوەستن و چاوەڕێ بن. قسەکەی خۆی بە براکەم دەست پێ کرد.
"براکەم، هیچ گومانت نەبێ. ئەم حوکمەتە دەڕوا. ئێمە بەدەسەڵات دەگەین و لەگەڵ تۆش هەڵدەکەین. ئەمشەو دەبێ بڕیار بدەی."
"ئەگەر ئەم شەو بڕیار نەدەم، بە فیشەکێک ساردم دەکەیەوە؟"
"نا، گیانی تۆ لای ئێمە بایی پووشێکە. قەرەبووی کوشتارەکەی قوم و تەورێز نییە. تۆ دەڕۆی و چەند کەسێکی دیکە دێن شوێنەکەت دەگرنەوە. بەڵام ئەگەر لەگەڵمان بێی، زۆر لە جەلادە هاودەستەکانی تۆ بەخۆیاندا دەچنەوە و فیزماڵکی دەدەنێ. ئەوە بۆ ئێمە سەرکەوتنە. تەرمەکەت پووشێک ناهێنێ، زیندووەکەتمان بەکار دێ."
"کەوابوو ئەگەر هەر ئێستا خۆمتان ڕادەست نەکەم، چ دەکەن؟"
"هیچ، دەڕۆین و لێت دەگەڕێین. چەند ڕۆژی تر هەرچی ڕۆژنامەی دنیایە دەنووسن، کە ئێمە چەند سەعاتێک تۆمان گرتووە و هیچ ماڵەکەشتمان تاڵان نەکردووە و لێت خۆش بووین. ئینجا ئەو جوامێرییە دەکەنە بەڵگەی ڕەوابوون و ئازادیخوازیی ئێمە و ڕێز لە شێوازی خەباتەکەمان دەگرن. ئێوە لە نێو خۆتاندا هەرچی بەخۆتانی بڵێن بایی پووشێکە. هەموان تۆ بە خیانەتکار دەزانن و لێک بەگومان دەبن. هەر وەک چۆن کۆمەڵێک لە هاوڕێکانت ئێستا جێی شک و گومانن و لە خزمەتی ئێمەدان. تۆش خۆت باشتر دەزانی کامانە دەڵێم."
بە مەبەستی خەڵەتاندنی بەڵێنم پێی دا بیر لەو پێشنیارەی بکەمەوە بەو جۆرەی لە ڤیدیۆکەدا داوای کردبوو.
"براکەم، دوا مەرجی من ئەوەیە. خۆت باشتر دەزانی، ئەگەر ئەوەی بیستووتە و گوتووتە لێی پاشگەز بیتەوە، ئیتر دیدارە و ئاخر. ئێمە لەسەر قسەی خۆمان سوورین. ئەگەر نەکرا، ئیتر ئێمە پێکەوە لە شەڕێکی بێ ئەماندایین. ئەوەش بزانە. چونکە دووبەدوو پێکەوەین، با پێت بڵێم و بڕۆم. ئەوەی بۆت دەسووتێ منم. تۆ ئەگەر چێژت لە ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکیش وەرنەگری، لانیکەم لەگەڵی ڕاهاتووی. بەڵام من نازانم تاکەی دەتوانم ئەو بەڵا و ئازارانە تەحەمول بکەم. بە ئاواتەوەم لە کن تۆ و دایکم بم. منت لە ماڵێ دەرکرد و من دەربەدەر بووم..."
قسەی پێ نەکرا. لێوی خۆی کرۆشت و چاوی لەسەر یەک دانا. بە پشتی دەستی چاوی سڕییەوە. ویستم خۆم بەسەر لاقیدا بکێشم. دەستی ڕاستی بەرز کردەوە و تێی گەیاندم لێی نەچمە پێش.
دەستێک لە دەرگای ژوورەکەمی دا. زاوا و ڕەشپۆشە چەکدارەکە وەژوور کەوتن. ئینجا فەرماندەرانە ڕووی لە من کرد و گوتی:

"تا نیو سەعاتی دیکە لە ژوورەکەت نایە دەرێ. ئێمە هەر شەش کەسەکە لە گەراجەکەدا بەند دەکەین. پاش نیو سەعات خۆت دەچی و کلیلی دەرگای ماڵ  باخ و گەراجەکەت دەدۆزییەوە و پاسەوانەکانت ئازاد دەکەی و ئەمر دەکەی زاوا ورد ورد راپۆرتەکەت بداتەوە سەرووی خۆت."

تاوێک لە ژوورەکەمدا بەتەنێ مامەوە. جلوبەرگم لەبەر کرد و چوومە لای پەنجەرە و لەوێوە دیتم زیاتر لە پانزە دەمامکدار لە ژێر فەرمانی روقیەدا بوون. بە فەرمانی ئەو هەموان لە باخەکە چوونە دەرێ. دوو کەسیان لە سەر دیوارەکەوە سێرەی لە پەنجەرە و دەرگای بیناکە گرتبوو و، هەر دەنگی نەرمی کامیۆنێک هات، دوو کەسەکە چوونە خوارێ و ئیتر دەنگەکەش بڕایەوە.

هەر ئەو شەوە سواری ترۆمبێل بووم و چوومە ماڵی دایکم. لە ڕێگە هەر خۆمم دەدواند. چ بە دایکم بڵێم؟ خۆ ئەگەر نەخۆش نەبوایە بەگژیدا دەهاتم و پێم عەیب نەدەبوو هەندێ سەرکۆنەشی بکەم کە بۆچی ئەو شتانەی زانیوێتی، بە منی نەگوتووە بۆ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێ و نەهێڵم ئاوا بە دەمانچەوە بەرانبەرم راوەستێ و هەڕەشەم لێ بکا. دڵەڕاوکێ و بێتاقەتیی پیرییەکەی دەستەشکاوی کردبووم. دوو سەعاتێک لە شەمێران و نێو شار گەڕام. کە رووناکی کردەوە لە دەرگام دا. دایکم لەسەر بەرماڵ بوو. یەک دوو جار ئەڵاهوئەکبەری گوت و ئینجا دەرگای کردەوە. هیچ شلوێ نەبوو. دەتگوت ئاگای لە هەموو شتێکە. لێی پرسیم: روقیەت دی؟

"تۆ چووزانی؟"

"خۆی پێی گوتبووم رۆژێک دێتە لات."

"کەوابوو تۆ ئەوت دەدی؟"

"ئەدی، لێی رادەسپاردم و هەر کات دڵنیا دەبۆوە ئەغیارم لە دەور نین، خۆشی دەهاتەوە."

"ئەی بۆ پێت نەدەگوتم؟"

"ئەمری پێ کردبووم بە کەس نەڵێم. چەند جاران ئاماژەم کرد و گوتم روقیە دێ."

"هیچ دەزانی تۆ خەریکی خۆت و ئەویش دەخەیە مەترسییەوە؟"

"جا شاپەرستەکان منیان بۆ چییە؟ روقیەش ئاگای لە خۆیەتی."

"ئەی بیرتان لە پێگەی من کردبۆوە؟"

"ئەی چۆن. هەر لە فکرتدا بووین و هەین. تۆیان دەردەکرد. من و روقیە کارێکی باشمان بۆت دەدۆزییەوە و نانێکی حەڵاڵت دەخوارد."

"هەر وا سووک و سانا؟"

دەی روقیە خەڵەتاندبووی. چیی دایکم هەولی دا نانی بەیانی بخۆم، بە قسەم نەکرد. دەیویست بچێ نان سەنگەکی تازە و پەنیر و هێلکە و حەڵوام بۆ بکڕێ، ملم نەدا.

ڕێک سەعات هەشت و نیو چوومەوە ئۆفیسەکەم و راپۆرتێکی تێروتەسەلم لە رووداوەکەی دوێنێ شەو نووسی و، بەو راپۆرتەوە چوومە لای سەرۆکی ئاژانس کە ئێستا سەرلەشکرێک بوو.

ئەو کابرایە یەکێک بوو لە گێلەکانی رۆژگار. شاهەنشا بۆئەوەی کابرایەکی ناوزڕاو نەبێتە سەرۆکی ئاژانس و بەرهەڵستکاران هێور بکاتەوە، ئەوی لەوێ دانا. راپۆرتەکەی زاوایان بە تەلەفۆن پێ راگەیاندبوو. ورد ورد نووسینەکەمی خوێندەوە و بەر لەوەی بڕیارێک بدا، یەکەوڕێ چووە دەربار و رووداوەکەی بۆ خاوەنشکۆ باس کرد. دڵنیام جوان و زەریف ترش و خوێی کردبوو، بۆ ئەوەی خاوەنشکۆ رازی بکا من لە جێگریی ئاژانس بخا. خۆی بۆی گێڕامەوە کە تیمسار سەرلەشکر مکووڕ بوو جێی من بگرێتەوە. بەڵام شاهەنشا قایل نەببوو و من لە پۆستەکەی خۆمدا مامەوە.

له ئاژانس بوو به مقۆمقۆ. له پاش ڕووداوەکەی سیاکەلەوه زەبری ئاوایان وێنەکەوتبوو. بوو بە بگرە و بەردە. له پێشدا له ژنەکان دەگەڕان. لەو بارەیەوه هیچ زانیارییەکیان به ڕۆژنامەکان نەدا.

سەیرتر ئەوه بوو، له چاپەمەنییەکانی ئەورووپا و ئەمریکا و له نامیلکه و بەیاننامەکانی کۆنفدراسیۆنیشدا هیچ باسی ئەو مەسەلەیه نەکرا. لەوانەیه هۆیەکی ئەوه بووبێ که هەموو وڵات خەریکبوو دەکوڵا و خەریکبوو ڕووداوگەلێکی دەبوو، که هەڕەشەکردن له جێگرێک، وەکوو پێچ و مۆرەیەکی بچووک وابوو له نێو چەرخی زەبەلاحی مەکینەی ئاژانسی پاراستن و زانیاریی وڵاتدا و شتێکی وا نەبوو سەرنجی سەرکردەکانی وڵات رابکێشێ.

پاش تۆزێک قسەکردن لەگەڵ ئاهاریی وەزیری داد و دەماوەندی، خەریک بووم دەهاتمە سەر ئەوەی که ئەوانیش ئاگادار نین. تەنانەت زاواش بۆ سبەینێکەی هاتەوه سەرکار و هەر وەک جاران پاسەوانی ماڵەوەم بوو. پاسەوانەکانی ماڵەکەم گۆڕدران و زیاد کران. ترۆمبێلێکی زرێپۆش و زرێیەکی فیشەکگێڕەوەیان دامێ و هەموو جامەکانی ماڵەکەمیان به ئاسنەپەرژینی قایم توند کرد و زۆربەی سەرکردەکانی ئاژانس ئەو جۆره پارێزەیەیان بۆ دانرا.

پێشی فیتنه و هەرا بەو شتانه نەدەگیرا.

ڕۆژی 19ی گوڵانی 1357، خەڵک خۆپێشاندانێکیان دژی شاهەنشا وەڕێ خست. دەستیان کرد بە تێکدەری و خراپە و ترۆمبێلەکانیان ئاگر دا. سەرباز هەڵیانکوتایە سەر ماڵی دوو ئایەتوڵاکە و دوو مەلاشیان کوشت.
چەکەکە لە دەستی لایەنگرانی پادشایەتیی مەرجدار کە خوازیاری چاکسازی بوو دەرهێنرا و سەرکردایەتیی شۆڕش کەوتە دەست بناژۆخوازەکان.
مەلاکان و بەرەی نیشتمانی و هەموو بەرهەڵستکاران مانگرتنی گشتییان ڕاگەیاند و ئەمریان کرد خەڵک لە مزگەوت و ماڵەکانیاندا دانیشن و نەیەنە دەرێ. شار وەک گۆڕستانیان لێ هات. شای فرەزانا تێگەیشت و سەرۆکوەزیری لەسەر کار لابرد. کۆڵەوارێکی دیکەیان هێنایە سەر کار.
حیزبی ڕەستاخیز ڕێگەی درا ببێتە دوو فراکسیۆن.
دوژمنانی دەرەکیی ئێران کە لە بۆسەدا بوون هاتنە مەیدان. بێگانەپەرستان، بەرهەڵستکارانیان بۆ شۆڕش و ئاژاوەنانەوە هان دا. لە پەرلەمان وتاری ئاگرینیان دا. ڕۆژنامەکان ڕاشکاوانە باسی دیکتاتۆریی شایان کرد. ۆژنامەیەک بە خەتی درشت نووسیبووی: زیندانییە سیاسییەکان دەبێ ئازاد بکرێن. پەنابەرە سیاسییەکان دەبێ ڕێگەیان بدرێ بێنەوە ئێران. ساواک دەبێ هەڵوەشێنرێتەوە. سەردەستەکانی بەرەی نیشتمان کە تا ئێستا کپ و بێدەنگ دانیشتبوون ڕاشکاوانە لەگەڵ میدیا دەرەکییەکاندا وتووێژیان کرد و هاوکاریی هەموو تاقمەکان بەتایبەتی کۆمۆنیستەکانیان بە پێویست دەزانی. شاهەنشا بەڵێنی دا، ساڵی دادێ هەڵبژاردنی ئازادانە بەڕێوە بچێ.
پشێوی ئیتر سنووری بەزاندبوو. ئەفسەرێکی گێل لە ئیسفەهان خەڵکی دایە بەر دەسرێژ.
سەرۆکوەزیر دانران و لابردران و هیچیان لێ نەکەوتەوە. سەرۆکوەزیرێکی سەربازی شتێکی نەبوو بیخاتە بەردەم پەرلەمان جگە لەوەی نەیشارێتەوە کە وەزیرەکانی نەناسیوە و تەنانەت پیاڵە چایەکیشی لەگەڵ نەخواردوونەتەوە.
هەموو ئەو هەڵەیە، خەڵکی چاوقایمتر کرد و خۆپێشاندانی چەندسەدهەزار کەسی سەرانسەری وڵاتی گرتەوە و یەک ملیۆن خەڵک لە مانگرتنەکاندا بەشدار بوون و ئاخری باری نائاسایی لە یازدە شاری ئێراندا ڕاگەیەنرا.
پشێوییەکان گەیشتنە جێیەک، کە ئیتر سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە. خەڵک هەر گوێشیان بە فەرماندە سەربازییەکان نەدەبزووت. مانگرتنی گشتی دەستی پێ کرد.
ڕۆژی هەینی 17ی خەرمانان، زیاتر لە یەک ملیۆن ئینسان لە مەیدانی ژاڵە خۆپێشاندانێکی گەورەیان وەڕێ خست.
تیمسار سەرلەشکر کە پێی وابوو بە قەڵەمبازێک خۆی دەگەیەنێتە سەرۆکایەتیی ئاژانسی پاراستن و زانیاریی وڵات، هەوساڕپچڕاوانە فەرمانی تەقەی دا و نزیکەی 4000 کەسی لە خوێن گەوزاند. ئەو ڕۆژەیان ناو نا "هەینیی ڕەش".
ئەوە ئیتر نافەرمانییەکی تەواو بوو. جڵەو لە دەست شا و حوکمەتیش هاتە دەرێ. کرێکارانی نەوت دەستیان لە کار هەڵگرت. سەرچاوەی داهاتی حوکمەت خەریک بوو وشک دەبوو. کارمەندەکانی وەزارەتخانەش چوونە پاڵ کارمەندانی نەوتەوە. خاوەنشکۆ پێی وابوو ئەگەر پێوەندیی نێوان خەڵک و ئایەتوڵا خومەینی ببڕێ، کاروباری وڵات ڕێک دەخرێتەوە. ڕاوێژکارە بێمێشکەکان وایان تێگەیاندبوو، کە بەڕێزیان دوور بخەنەوە بۆ ئێراق. ئەویش چووە فەرەنسا و میدیا گشتییەکانی هەموو جیهانی کەوتە بەردەستی. ڕۆژنامەکانیش مانیان گرت. لە دوو مانگی ڕەزبەر و خەزەڵوەر زیاتر لە دوو ملیارد دۆلار دراوی بیانی لە ئێران بردرایە دەرەوە. ئیتر کەس پیتاکی نەدەدا.
جا وەرە لەو بێنە و بەرەیەدا کار بکە. ئاهارییش پەلەقاژەیەتی و خۆی شیرین دەکا. قانوونی ئازادیی حیزبەکان دێنێتە پەرلەمان و ڕێگە خۆش دەکا. داوا دەکا ئەو گەنج و قوتابییانەی لە ئێران چوونەتە دەرێ، با بێنەوە نیشتمانەکەیان

بەبێ ئەوەی لێیان بپێچرێتەوە. ئەم جارە راوێژی بە من نەکرد. زیانی خورۆ، دووقرانییەکەی کەوتبوو. ئاگام لێ بوو خەریکە خۆی کۆ دەکاتەوە و لە ئێران رادەکا. تازە وەبیری هاتبۆوە کە دەبێ ئەدای ئازادیخوازان دەربێنێ.
تیمسار سەرلەشکر دەستی لەسەر دەست دانەنا. کۆمەڵێک لات و بەرەڵای هان دا سینەما و بانک و دامەزراوە ئابوورییەکان ئاگر بدەن و خەتاکەی بخەنە ئەستۆی راپەڕیوەکان. ئیتر چاوەڕوانییەکانی تیمسار سەرلەشکر سنوورێکی نەبوو. پاش دەست لەکارکێشانەوەی سەرۆکوەزیر کە هێشتا چایەکی نەخواردبۆوە، پێی وابوو شاهەنشا ئەوی لە جێگەی دادەنێ. جەنابیان لەوە ژیرتر بوون جڵەوی کاروبارەکە بداتە دەست خوێنمژێکی نەفام.
ئەفسەرە پایەبەرزەکان کە دیتیان سەرۆکی پێشووی ئاژانس و سەرۆکوەزیری 17 ساڵی ئێران کەوتنە بەندیخانەوە، راکردنیان لە مانەوە پێ باشتر بوو و فڕۆکەکان هەموو رۆژێ پڕ بوون لە مسافیرە دەوڵەمەندەکان و ساواکییە ئەشکەنجەگەرەکان.
بەر لەوەی سەرۆکی من لێ بخرێ، نزیکەی بیست ملیۆن تمەنێک لەبن دەستی مندا بوو و من دەمتوانی بە راماڵینی ئەو پارەیە و گۆڕینەوەی بە دۆلار ژیانی ئایندەی خۆم دابین بکەم. جگە لەوەش بڕیارم دابوو خانووەکەم و باخەکەی نیاوەرانم بفرۆشم و دایکم هەڵگرم و بچمە شوێنێکی پارێزراو و بێ قڕەی ئەم دنیایە و مات بم. ویژدانم ئاسوودە بوو. بە پشتیوانیی شاهەنشا خۆم خستبووە ئەو گێچەڵەوە و ئێستاش کە ئەو نەیدەتوانی بەڵێنەکەی خۆی بەرێتە سەر، ئیتر منیش لەسەرم نەمابوو وەفادار بم. کەس خانووەکەی لێ نەدەکڕیم. لەو هەنگەمەیەدا کێ ئامادە بوو ئەویش لە نیاوەران خانوو بکڕێ.
بۆ نەگبەتی، هەموو ئەو بەرنامانەم لێ هەڵوەشانەوە. کە نەخشەکەی خۆمم بەبێ ئەوەی باسی بیست ملیۆن دۆلارەکە بکەم لەگەڵ نەنکم هێنایە گۆڕێ، لە پێشدا دەتگوت زۆریشی پێ خۆشە و لەوانەشە ــ دیارە ئەوە لە زمان مووسا گیانەوە دەگێڕمەوە ـ دایکم پێی وابووبێ دەتوانێ بچێتە کەربەلا و لەوێ ببێتە دراوسێی. لێی پرسیم دەتهەوێ بمبەیە کوێ؟
"کوێت پێ خۆشە ئەوێ."
"دەتەوێ بمبەیە فەرەنسا و بمترشێنی؟ من بە چ کارێکت دێم؟ حەزم لێیە بچمە زیارەتی مەرقەدی حەزرەتی ئیمام رەزا."
"نا دایە گیان، وڵات شێواوە. بێخاوەنە. بچیتە هەر جێیەک هەر ئەو تاس و حەمامەیە. خۆراسان فەرقێکی لەگەڵ تاران نییە."
"دەی باشە دەچمە زیارەتی گۆڕی ئیمام حوسێن."
"باشە. کەوابوو کارەکانت بکە. دەتبەمە کەربەلا و هەر کات ویستت دێمە سەردانت."
"ئەی چ لە روقیە بکەم؟"
"ئەو دوایی دێتە لامان."
"یانی چی؟ یان دەڵێی ئێمە برۆین و لەو ئاگرەیدا بەجێ بهێڵین؟"
"ئەو شارەزای رێگەکەیە و دەمانگاتێ."
"خۆت پێوەندیت لەگەڵی هەیە؟"
"هەمە. بەڵام خۆ هەر کات بمەوێ نایە. هەر کاتێک پێی بکرێ سەرێکم لێ دەدا."
"دەبێ یەکێک هەبێ کە پەیامەکەی تۆی پێ بگەیەنێ؟"
دایکم دڕدۆنگ بوو. پێی وابوو دەمەوێ شوێنی روقیە هەڵگرم.
"نا کەسم نییە پەیامی منی بۆ بەرێ."

سەرسەختیی دایکم کارەکەمی دوا دەخست. پێی چەقاندبوو و دەیگوت بەبێ روقیە ناچمە هیچ کوێ.
"خۆت برۆ روقیە بدۆزەوە، ئێستا ئیتر ئاسانە. شاکەشتان ئەوە بەزیوە، کەوابوو ئەو هەمووە هەروگیف و خۆڕانانە هەر فشە بوو."
رقی خۆمم بە زاوا هەڵڕشت کە لە کۆڵانێ پاسەوان بوو.
"ئەی ئێوە خەریکی چین؟ روقیە دێتەوە و دەڕوا و ئێوەش لە خەوێ دان."
"قوربان خەتای من نییە. ئیتر کەس کار ناکا. لەوەتەی رۆژنامەکان داوای هەڵوەشانەوەی ساواک دەکەن، کە مل ناداتە کار. هەموو دەترسن تێدا بچن. دکتۆر بیژەن دیسان بووەتەوە حاجی ساوجی، جلوبەرگی وەکیلباشیی کردووەتە بەری و کەوتووەتە گەڵ راپەڕیوان. دکتۆر جیهانگیر هەر دیار نییە. دەڵێن خاتی کە لە ماڵەکەی هاتووەتە دەرێ، خەڵک کوشتوویانە. جگە لەوەش، ئەو تێکدەرانە هەموو چەکدارن. کێ دەوێرێ بەرەنگاریان بێتەوە."
ئەو زانیارییانە گشتی بەشێک بوون لەو راپۆرتانەی من دەرفەتم نەبوو بیانخوێنمەوە. ئاژانس خۆی خەریک بوو هەڵدەوەشایەوە.
فکرێکی تازەم بە زەینیدا هات.
"ئەگەر روقیە بدۆزییەوە پاداشتێکی باشت دەدەمێ. بەڵام بە زیندووییم دەوێ. خوشکی منە، نابێ زیانی پێ بگا."
"قوربان من خزمەتکارم. بەشکم دۆزیشمەوە. شانس و بەختی خۆمان."
هەر ئەو شەوە زاوا هاتەوە لام.
"قوربان بمکە بە مەئمووری زیندان. دەچم لەوێ روونی دەکەمەوە بزانم لەگەڵ کامە دەستەیە."
"فکرێکی خراپ نییە."
"قوربان، ئێمە تا ئێستا نەماندەزانی لە کوێوە شوێن پێی هەڵگرین. دیار نییە لەگەڵ کام تاقم و دەستەیە."
"دەتەوێ چ بکەی؟"
"وەک پاسەوان هەوڵ دەدەم دووسێ تاوانبار بە پارە بکڕم بۆ ئەوەی خۆیان بکەنە ئەندامی مجاهدین یان فیداییان یان کۆمۆنیستەکان. با بزانین چ دەبێ."
ئەو راکەڕاکەی زاوا دوو سێ حەفتەیەکی خایاند. وەزعەکە رۆژ بە رۆژ خراپتر دەبوو. دەرفەتە زێڕینەکان لەکیس دەچوون. بە هەموو بوارەکانی ژیانم رادەگەیشتم. دایکم و روقیە منیان بە تەڵەیەکەوە کردبوو. پاش مانگێک زاوا نیوەی شەوێ تەلەفۆنی بۆ کردم.
"روقیە لە ریزی هیچ کام لەو خراپکارانەدا نییە کە لە زیندانەکانی ئێمەدان. لە لیستەی ئازادکراوانیشدا هیچ نیشانەیەکم لێ نەدی. پیاوەکانی ئێمەش هیچیان نەدۆزیوەتەوە. روقیە دەبێ لەگەڵ تاقمی "جانباختگان" بێ. ئەو دەستەیە چەکدارە و ژنێک فەرماندەیانە." قسەکانی زاوا هیچ بەرهەمێکیان پێوە نەبوو. هیوام نەبوو لەو رێیەوە بگەمە ئامانج. بەڵام زاوا شاگەشکە ببوو و لە خۆشی ئەو خەڵاتەی بۆم دانابوو، لێبڕابوو هەر بەردەوام بێ. بانگم کرد و برێکم پارە دایە و هانم دا رانەوەستێ.
رۆژ بە رۆژ دڵەڕاوکێم پتر دەبوو. دەمدی کە دەورووپشتم چۆڵ دەبێ. هەر رۆژەی یەکێک لە سەرکردەکانی وڵات کلکی لە نەڕەی پشتی دەنا و رای دەکرد. بنەماڵەی پادشایەتی ئیتر کەسیان نەمابوو. لە سۆنگەی مانگرتنەکانەوە وڵات تەواو ئیفلیج ببوو. شا نەیدەتوانی فەرمان بدا. وەزیرەکان و سەربەرێوەبەرەکان دەستەوستان مابوونەوە. بۆشاییەک کە هەموو هەوڵ و جووڵەیەکی قووت دەدا. تاقم و گروپگەلی شۆڕشگێڕ یەکیان دەگرت. یەکبوون ببووە دروشمی رۆژ. بەرەی نیشتمانی و مەلاکان لەسەر هەڵوەشانەوەی پادشایەتی و دامەزرانی دەوڵەتێکی ئیسلامی و ریفراندۆمی پاش رووخان، رێک کەوتن.

لەو مانگی بێ خاوەنی و پڕ لە پشێویانەدا دەیان هەزار کەس کوژران. هەر تەقەیەکی دەکرا، ترس و خۆفی من قووڵتر دەبوو. لە مانگی موحەڕەمدا زیاتر لە سێ ملیۆن کەس لە تاران ڕێپێوانیان کرد. سەربازان دەکەوتنە گەڵ خۆپێشاندەران. رووناکبیرە دڕدۆنگەکانیش هەرایان دەکرد "سەربەخۆیی، سەربەستی، کۆماری ئیسلامی.". سەرکردەکانی سوپایش لەسەر ئەوەی ئاخۆ زەبروزەنگ بەکار بێنن یان لەگەڵ خەڵکەکە نەرمونیان بن، دووبەرەکێیان تێکەوت.

سەرکردایەتیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش راشکاوانە جیاوازیی بۆچوونیان هەبوو. هەر کام و لایەکی پەتەکەیان دەکێشا. یەکێ پشتیوانیی لە شا دەکرد و ئەویتر هەوڵی دەدا رێگەیەک بەرەو شۆڕشگێڕان بدۆزێتەوە. باڵوێز "بەڵێ"ی دەگوت و وەزیر "نەخێر". هەموو سەریان لێ تێک چوبوو. کۆمەڵێک شاگەشکە بوون کە رژیمە تازەکە مستێکی توند لە دەمی کۆمۆنیستەکان دەدا و هەندێکیش کە خاوەنشکۆش یەک لەوان بوو، پێیان وابو هەموو ئەو رووداوانە لە بن سەری کۆمۆنیستەکاندان، کە "سیا"ش پشتیان دەگرێ. وەختێک سی هەزار کرێکاری ئاسنتاوێن (زەوب ئاهەن)-یش مانیان گرت، ئیتر بوو بە جەنگی مەغلووبە. رۆژنامە گرینگەکانیش پشتیان گرتن. هیچ کەس سەری لەو هەرایە دەرنەدەچوو. چەند سەرکردەیەکی پایەبەرزی سوپا بریندار کران. بنەماڵەکانیان ترسیان رێنیشت. سوپا خەریک بوو لێک دەترازا. لایەنگری لە رژیمی پاشایەتی گوناحێکی نەبەخشراو بوو. سەرباز لە سەربازخانە رایان دەکرد. ئیتر دەستە دەستە خەریک بوون دەکەوتنە گەڵ شۆڕشگێڕان. لە سەرەتای بەفرانباردا بەشێک لە هێزە ئاسمانییەکانیشیان کەوتنە گەڵ، بەتایبەتی فڕۆکەوانە سەربازییەکان راشکاوانە رایانگەیاند لایەنگری شۆڕشڤانەکانن و وای لێ هات فڕۆکەخانەی مێهراباد ئیتر لە کار کەوت و بۆوەی نەدەبوو کەڵکی لێ وەرگرن.

لایەنگریی ئەمریکییەکان و عەرەبەکانی کەنداو لە شاهەنشا دەیتوانی دڵی جەنابیان بداتەوە و پشتگەرمی بکەن کە کۆڵەکەکانی پادشایەتی هێشتا نەلەرزیون، بەڵام ئەم دڵۆپە بچووکە چۆن دەیتوانی لە شەپۆلی پڕ جموجۆڵی شۆڕشدا کاریگەریی هەبێ؟

گیرانی سەرۆکوەزیر کە مەلاکان ئەویان بە سەرچاوەی هەموو ئەو ئازار و مەینەتی و تۆمەتانە دەزانی کە لە پیاوانی ئایین دراون و قۆڵبەستکردنی سەرۆکی پێشووی ساواکیش هیچی لە وەزعەکە نەگۆڕی.

ئازادکردنی چەند مەلایەکیش لە زیندان، هەر بە نیشانەی لاوازیی شاهەنشا لەقەڵەم درا و بووە هۆی بەهێزتربوونی هێزی دژە شا. هەموو رۆژێ ملیارد ملیارد پارەی بیانی لە وڵات دەچووە دەرێ.

ئەی چ هەلێک لەکیس چوو.

رۆژێکیان بەیانی کە چوومە ئیدارە، سەیرم کرد سەرۆکەکەی من، ئەو سەرلەشکرە گەلحۆیەی لەگەڵ من کلیلی گەنجینە بیست ملیۆن تەمەنییەکەی پێ بوو، رای کردووە و قرانێکی لە سندووقەکەدا نەهێشتووەتەوە.

کێ باوەڕی دەکرد کە منیش دەستم لەو راماڵینەدا نەبووە؟ دواتر وەختێک روقیە حیسابی منی لێک دەدایەوە، دڵنیا بۆوە من لەو سەرمایەیە هیچم پێ نەبراوە.

خاوەنشکۆ بیری لەوە کردەوە کە سەرۆکایەتیی ئاژانس بە من بسپێرێ. جەنابیان سۆسەی کردبوو کە یەک دوو کەس لە سەرکردەکانی سوپا خەریکی فێڵ و تەڵەکەن. جارێ لە ناڵ دەدەن و جارێ لە بزمار. لە رواڵەتدا بە شا هەڵدەلێن و بە دزییشەوە پشتیان تێ کردووە. لەو وەزعەدا تیروپشکەکە بە ناوی منی داماو دەرچوو.

بانگیان کردم و داوایان کرد ئەو ئەرکە بە ئەستۆ بگرم. چونکە سەرۆکوەزیرە سەربازییەکە دەستی لە کار کێشابۆوە و شاهەنشا لە بەرەی نیشتمانیدا بە شوێن یەکێکدا دەگەڕا بتوانێ وڵات هەڵسووڕێنێ، گوتم هەر کاتێک سەرۆکوەزیری تازەتان دانا، منیش ئەو ئەرکە وەئەستۆ دەگرم.

خۆیان زانییان ئەو پۆستە بۆ من پاروویەکی زۆر چەور نییە، بۆیە پێداگر نەبوو.

ڕۆژی 11ی بەفرانباری 1357 حکوومەتە نوێیەکە بە یەکێک لە سەرکردەکانی بەرەی نیشتمانی ئەسپێردرا و یەکێک لە هەوڵە گرینگەکانی ئەویش هەڵوەشاندنەوەی ساواک بوو و منیش گێچەڵێکی ناخۆشم لەکۆڵ بۆوە.

ئیتر پێم چەقاند، لەگەڵ دایکم یان بەبێ دایکم، لەگەڵ روقیە یان بەبێ روقیەماڵەکەم بفرۆشم یان نەیفرۆشم، حیسابی بانکییەکم دابخەم یان داینەخەم، پارەکانم وەرگرمەوە یان نا.

کە دایکمم ئاگادار کردەوە، لە هۆش خۆی چوو. خەریک بوو دەمرد. خۆم پێ نەگیرا. بڕیارم دابوو لەوێوە بچمە فرۆکەخانە. نەکرا. چووم لە دووی مووسا. داوای یارمەتیم لێ کرد. ناردمە شوێن پزیشک. دایکمم گەیاندە خەستەخانە. زۆریم لە زاوا کرد. وا تێدا مابوو نەمدەزانی چ بکەم.

مووساگیان کە زانیی بەتەمای چیم، بەربینگی پێ گرتم. ئیتر ددانی لێم سپی ببوونەوە، چیی دڵی ویستی پێی گوتم.

"کوڕە ئێوە خەڵکێکی سەیرن. خۆتان یەک یەک رادەکەن و ئێمەش بە گونتانەوە. دایکت ئەوە دەمرێ و روقیە بە مسەلسەلەوە خەریکی شەڕە و تۆ فیزماڵکی دەدەیەی و تێی دەتەقێنی. ئەی من بچمە کوێ؟ چ لە ژن و منداڵەکەم بکەم؟ ئێوە تۆزێک غیرەت چیە نیتانە. من ئیتر ناتوانم بە دایکت را بگەم. گیانی خۆم لە مەترسیدایە. بێ ئەملاوئەولا دەبێ خۆم بشارمەوە. ئیتر کەیفی خۆتە چ دەکەی بیکە."

نەمدەزانی چیی جواب دەمەوە. قەت پێم وانەبوو ئەوەندە بێدەسەڵاتم. هەقی بوو. ئەو قسانەی کرد و خەریک بوو لە ماڵی دایکم دەچووە دەرێ، پێشم پێ گرت.

"باشە دانیشە بیرێک بکەینەوە. دەزانی بێت و من بگرن دەمکوژن؟"

"ئەی من باوەشێن دەکەن؟"

"ئاخر مووسا گیان، زۆر دەخایەنێ تا دەگەنە تۆ."

"نا وا نییە. تۆ ترۆمبێلی زرێپۆشت هەیە و دەتوانی را بکەی، بەڵام من بەو پەیکانە عارەبانەیەمەوە کەی پێیانخۆش بێ بەقوربانی گوللەیەکم دەکەن."

"جارێ، من ترۆمبێلی گوولەنەبڕم نییە..."

"بەڵام خۆ پارەت هەیە و دەتوانی یەکی تازە بکڕی. هیچ بیرت لەوە کردووەتەوە کە چ مووچەیەکیان بە تۆ دەدا و منیش چ مووچەیەکم وەردەگرت؟"

"مووسا گیان ئێستا کاتی ئەو قسانە نییە. پێم بڵێ دەبێ چ بکەین؟"

هەڵیرشت و تاوێک دواتر هێور بۆوە.

"دەبێ روقیە بدۆزینەوە و دەستەوداوێنی ئەو بین."

"جا چۆنی بدۆزینەوە؟

"من لەگەڵ یەک دوو کەس لە فرۆکەوانەکان هاوپۆل بووم. دەچم دەیدۆزمەوە. دەچم خۆمی دەگەیەنمێ. بێ و نەبێ یەکێک لەو برادەرانەم ئەو تاقمانە دەناسێ. ئاخۆ روقیە دەزانێ من و تۆ هاوکار بووین؟"

"چووزانم؟"

"چار نییە. دەبێ غیرەت وەبەر خۆمان بنێین."

هەڵپە و بێ بەرنامەیی، ترس و دەستەوستانی لە هەمبەر رووداوەکاندا مێشکی هەمووانی تێک دابوو. دایکم لە نەخۆشخانە خەریک بوو گیانی دەدا. پزیشکەکان جوابیان کردبوو و دەیانکوت بیبەینەوە ماڵەکەی خۆی. هەر دڵی لای کچەکەیەتی. هیچ هۆکارێک نییە. پیر بووە و دەبێ لێی بگەڕێن لەسەرخۆ چاوی لێک بنێ. چۆن توانیبام بیبەمەوە ماڵەکەی؟ ماڵەکەی خۆشم پارێزراو نەبوو. پاسەوانەکانی جاران دەهاتن و داوای مز و نوقڵانەیان لێ دەکردم، دەتگوت لە قومار بردوومەتەوە.

هەمو رۆژێ، هەموو سەعاتێک، هەموو شەوێ چاوەڕێ بووم هەواڵێکی زاوا و مووساگیان بێ. ئەوانیش ماڵوێران ببوون.
فرۆکەوانەکەی برادەری مووسا گیان لە تێکهەڵچوونێکی نێوان لایەنگران و دژبەرانی شۆڕشدا کوژرابوو. دەستی هەڵگرت و خەریک بوو بار و بنەی دەپێچاوە بۆ ئەوەی بە ژن و منداڵەکەیەوە بچێتە شارێکی بچووک و ماوەیەک خۆی بشارێتەوە.
تەنیا زاوا زێڕینەوە بوو کە هەوڵی دەدا لە رێیەکەوە خۆی بگەیەنێتە "جانباختگان". خۆیشی دەیزانی خەریکی گیانی دەخاتە مەترسییەوە، بەڵام لە دڵی چەقیبوو روقیە ئەو ناکوژێ.
من دەستم بەسترابوو. دایکم رۆژ بە رۆژ وەزعی خراپتر دەبوو. لەو حاڵەتەدا دەستێک لە غەیبەوە هات و ئەگەر بۆ چرکەیەکیش بووبێ، بڵێسەیەکی گەشبینیی دڵمی رووناک کردەوە.
سێ حەفتە بەر لەوەی دەوڵەتە تازەکە بێتە سەر کار، لەگەڵ هەزاران پەنابەری سیاسیدا، فەرزان کە لەگەڵ روقیە بە تەلەفۆن و نامە پێوەندیی هەبوو، هاتەوە ئێران. ئەویش لە روقیە دەگەڕا. زاوا و فەرزان یەکتریان دیتەوە. یەکەمیان، ئەوی دیکەی لە نەخۆشینەکەی دایکم ئاگادار کردەوە کە خەریکە دەمرێ و دەبێ بچێتەوە ماڵەکەی خۆی و کەسیشی نییە ئاگای لێ بێ و منیش هەترەکم چووە.
لەو چوار حەفتەیەدا دایکم هەر دەهات و خراپتر دەبوو و، شان بە شانی پشێوییە گشتییەکان دەڕۆیشت. شۆڕشڤانەکان بە بەرنامەیەکی دە مادەیی خۆیان بۆ دامەزراندنی حکوومەتێکی تازە ئامادە دەکرد. لە خۆپێشاندانێکی چەندسەدهەزار کەسیدا، بڕیارنامەیەک دەرکرا، کە پەرلەمان و سوپا و ئەنجومەنی پادشایەتی هەموویان خۆیان رادەستی شۆڕشگێڕان بکەن. لەو راگەیەنراوەدا گوترابوو، دەوڵەتە تازەکە بۆیە دانراوە، بۆ ئەوەی رێگە بۆ دامەزرانی حکوومەتێکی سەربازیی سەرکردە سوپاییەکان بە پشتیوانیی شا، خۆش بکا. سەرۆکوەزیر ئامادە بوو بچێتە فەرەنسا و لەگەڵ ئایەتوڵا خومەینی دانوستان بکا. ئەو نیەتە جێبەجێ نەبوو. ناکۆکیی سەرلەشکرەکان رۆژ بە رۆژ قووڵتر دەبۆوە. چەقۆکێشێکی ئەمریکایی کە لە لایەن سەرکۆمارەکەیانەوە نێردرابووە ئێران بۆ ئەوەی کاروبارەکان رێک بخا و کێشە و ناکۆکییەکان چارەسەر بکا، سەرەڕای ئەوەی شاهەنشاش ئەمریان کردبوو هەموو فەرمانێکی ئەمریکاییەکان جێبەجێ بکرێ، بەڵام هیچی پێ نەکرا و کلکی لە گەڵۆزی نایەوە و لە دوا چرکەدا بۆی دەرچوو.
لە سەرلەشکرەکان دوانیان کەوتنە گەڵ شۆڕشگێڕان و مجاهدین و فیداییەکان و تاقمە چەکدارەکانی دی و یەک لەوان "جانباختگان" زۆری نەبرد لە حەشارگەکانیان هاتنە دەرێ و خوێنڕشتنی شۆڕشگێڕانە دەستی پێ کرد.
هەر ئەو رۆژە ئایەتوڵا لە فرۆکەخانە دابەزی. فرۆکەوانەکان، کە لە تەلەفزیۆنەوە سەیری رووداوەکانیان دەکرد، پێک هەڵپڕژان و دژبەرانی شۆڕش داوایان لە گاردی پادشایەتی کرد بێنە فریایان. تێکهەڵچوونێکی خوێناوی لە نێوان زۆرینەی فرۆکەوانەکان و گاردی پاشایەتی هاتە گۆڕێ. شۆڕشگێڕان خەریک بوون دەشکان، کە ئیتر دەرگای عەمبارەکانی چەک و تەقەمەنییان شکاند و خەڵکیان چەکدار کرد و لە ماوەی دوو رۆژاندا سەربازخانەیەک و پۆلیس خانەیەک و بنکەیەکی پۆلیسی جەندرمەیان گرت.
رۆژی 22ی ریبەندان، سوپا کە خەریک بوو لێک دەترازا، بێلایەنیی خۆی راگەیاند و دەوڵەتە تازەکە لەکار کەوت.
هەر ئەو شەوە و سبەینێکەی، من لە خەستەخانە لە کن دایکم بووم و سات بە سات لەسەر هەست بووم کە زاوا و فەرزان پێم بڵێن بزانم روقیە کەنگێ دێتە لای دایکم. دایکم لە گیانەڵادا بوو. جاروبارێ چاوی هەڵدێنا و لێوی دەلەرینەوە بەبێ ئەوەی دەنگێکی لێوە بێ، دەتگوت گیانی دەردەچێ. هەر جارێکی چاوی لێک دەنا، غیرەتم وەبەرخۆم دەنا و لە پێشخانی نەخۆشخانەکە پیاسەم دەکرد. پێم وابوو ئەوە ئەمنترین شوێنێکە بۆم ماوەتەوە. زاوا ئاگاداری کردبوومەوە کە هەڵیانکوتاوەتە سەر ماڵەکەم لە نیاوەران و داگیریان کردووە. ئیتر هیچم بەدەستەوە نەمابوو. هیچ جێیەکم نەبوو بچم. مۆرەکانی من هەموو رایان کردبوو. بانک هەموو حیسابە فەرمی و شەخسییەکانی ساواکییەکانی

راگرتبوو. ئاهاری و دەماوەندی رایانکردبووە ئەورووپا و ئەمریکا. خانعەلی گوتیان خۆی شاردووەتەوە. هەموویان بەر لەوەی شا بڕوا، رایان کردبوو. هەموویان ئەمڕۆ بانگەشەی نیشتمانپەروەری دەکەن.
شەو و ڕۆژێک لە ژوور سەری دایکم مامەوە. جاری وابوو لەسەر کورسییەکەی تەنیشت تەختی نەخۆشەکە وەنەوزم دەدا. لە خەو رادەچڵەکیم و دیسان خەو دەیبردمەوە.
23ی رێبەندان سەعات پێنجی بەیانی جیپێکی سوپایی لە نەخۆشخانە نزیک بۆوە. لە ترسی ئەوەی نەکا سەربازە شۆڕشگێڕەکان بن، لە پشت دەرگاکە خۆم مات کرد. فەرزان و روقیە لێی دابەزین. فرۆکەوانێک، کە کاتی خۆی لە قوتابخانەی شارەوانی دەیخوێند، لێی دەخوڕی. روقیە بە گریانەوە باوەشی پێدا کردم. تەوقەم لەگەڵ فەرزان کرد. خوشکم رایکردە ژوورەکەی دایکم. من و فەرزان تەنیا کەوتینەوە. یەکەم قسەی کردی ئەوە بوو کە گوتی:
"نابێ لێرە بمێنیتەوە. دوێنێ خەڵک لە شەقام سەرلەشکرێکی ئاژانسیان بە شەق و پێلەقە و چەقۆ کوشت."
گوتم:
"چ نییە."
"درۆم کرد. دڵم توند بوو. نەمدەویست خۆم بێ ئۆقرە بنوێنم.
بە دوای روقیەدا رامکردە لای دایکم. پیرەژن لەناکاو گیانی بەبەردا هاتەوە. دەیویست هەستێتە پێ. پەرستارێک هات و گوتی:
"خوشکێ ئەوە چ دەکەی؟"
روقیە سەری بە سینگی دایکمەوە نا. ماچی کرد و بۆنی پێوە کرد. من و فەرزان چووینە دەرێ. هەردووکمان لەبەر بێخەوی برستمان لێ براببوو. چووینە پێشخانەکە و لەبەر دەرگا راوەستاین هەوایەک بخۆین. لە ناکاو کابرایەک چەکدار لەو جیپەی روقیەی هێنابوو دابەزی. گوللەیەک وەلاقم کەوت. دەستم بۆ دەمانچەکەم برد. فیشەکێکی دی بە پەنا گوێچکەمدا تێپەڕی. فرۆکەوان بەرەو پاسەوانەکە چوو و فەرمانی دا تەقە نەکا. خۆ نەگەیشتبایە ئیتر من مردبووم. فەرزان منی کێشایە نێو خەستەخانەکە. پەرستار و پزیشک دەوریان گرتم. لە سەر تەختێکی خولخولەدار بردیانمە ژوورێ. رانم خوێنی لێ دەهات. بە فەرزانم گوت:
"بە روقیە مەڵێن. لێی گەڕێن جارێ لای دایکی بێ."
گوێی لە تەقە و هەراکەی نەخۆشخانە ببوو. دایکی دوا هەناسەکانی دەکێشا. چاوی لێک نا و هاتە لای من. پزیشک فیشەکەکەی لە رانم دەرهێنا و برینەکەی پێچا. پاش دوو سێ سەعات کە لە خەو و بێهۆشی وەهۆش خۆم هاتمەوە، هێشتا روقیە لە نەخۆشخانە بوو. ئیتر دەمانچەکەی بە قەدەوە نەبوو. دەستمی گرتبووە نێو دەستە رەقەڵە و گەرمەکەی و چاوی تێوە بڕیبووم. لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد. پێی وابوو هێشتا بێهۆشم.
"شۆڕش قوربانیی دەوێ. ئێمەش ئەوە نرخی خۆمان پێشکەش کرد. براکەم زیندوو دەرچوو، لانیکەم تا ئێستا."
چاوم هەڵێنا و گوتم:
"یانی ئیتر ئیفلیج بووم؟"
"نا دەتوانی بە رێدا برۆی، بەڵام بە گۆچان..."
"چووزانی؟"
"من و فەرزان چووین لەگەڵ سەرۆکی خەستەخانە قسەمان کرد. ئەو بانگی کردین. دەماری رانت پساون و ئیتر یەک ناگرنەوە."
"کەوابوو دەبێ ماوەیەک لێرە بمێنمەوە."

"لێرە نا. سەرۆکی خەستەخانەکە پێی وایە تۆ لێرە پارێزراو نی. هەموو نەخۆش و پەرستارەکان دەزانن تۆ ساواکی بووی. ناوت دوێنێ لە ڕۆژنامەکاندا بووە. هەر ئێستا تا ناوێکی تر لەوانەیە خەڵکی ورووژاو هەڵکوتنە سەر خەستەخانەکە."

"ئەی چ بکەم؟"

"فەرزان و دۆستە فڕۆکەوانەکەی چوون جێیەکت لە خەستەخانەی دۆشان تەپە بۆ بدۆزنەوە. هیوادارن لەوێ جێت بکەنەوە."

هەردووکمان بێدەنگ بووین. روقیە سەرەڕای ئەوەی خۆشەویستی و بەزەیی سەردەمی منداڵییەکەی وەکوڵ هاتبۆوە، نەیدەزانی چیم لێ بکا.

چۆن توانیبام داوای یارمەتی لەو دایک مردووە بکەم؟ دەستیم گرت و ماچم کرد. روقیە دەستێکی بە دەموچاومدا هێنا و هستا. بەرەبەری نیوەڕۆیە بوو. پەرستارێک خواردنی بۆ هێنام. ئاشی برنج بوو و من ئیشتیام نەچوویێ. قاچی چەپم نەدەجووڵا و جێی برینەکە دەبرژایەوە. سەعات چوار و شتێکی دوانیوەڕۆ بوو. 14 سەعات بوو فیشەکەکەم وێکەوتبوو.

فەرزان هات و دەیویست بە ترۆمبێلی نەخۆشان کە شۆفێرێک و فڕۆکەوانەکەی تێدا بوو رامگوێزێ.

روقیە ماچی کردم و خەریک بوو ماڵاوایی دەکرد. پرسیم:

"روقیە گیان کەی یەکتر دەبینینەوە؟"

"نازانم. ئەگەر خوا بیەوێ."

دەستیم گرت و گوشیم.

بردیانمە خەستەخانەی دۆشانتەپە. لە رێگە فەرزان ئاوێکی پاکی بەسەر دەستمدا کرد.

"چەند حەفتەیەک دەبێ لە خەستەخانە وەمێنی. لە ژوورێ خۆت دەشاریتەوە. تەنیا شەوانە، هەر کات پزیشک رێگەی دای دەتوانی تەمرینی رۆیشتن بکەی. بەڵێنم بە روقیە داوە لەگەڵت بم و، رێگەت بۆ بکەمەوە لە وڵات بچیتە دەرێ. چەند ساڵێک من لە دوورەوڵات و دەربەدەری ژیاوم. ئەمجارە نۆرەی ئێوەیە. خوا دەزانێ ئەگەر لێرە رزگار بووی، ئیتر دەبێ چەندە لە هەندەران بژیی. تەنیا بە مەرجێک. ئەوە بەڵێنێکە و بە روقیەم داوە و تۆش دەبێ بە منی بدەی. "

"چ بەڵێنێک؟ ئەوەندە بەس نییە کە ئیفلیج بووم و بەدیلی کەوتوومەتە بەر دەستی ئێوە؟"

"نا، لەسەر ئەو خیانەتانەی دەخرێنە ئەستۆت، زۆر زۆر قەرزباری."

"چیتان دەوێ؟ خۆ ماڵی دنیام هیچ نییە. بمکوژن و نەجاتم بدەن."

"دەڵێن بیست ملیۆن پارەی میزانیەی ئاژانس بە دەست تۆوە بووە."

فەرزانم قایل کرد کە من تاقە دینارێکی ئەو پارەیەشم هەڵنەگرتووە.

"دەبێ بەڵێن بدەی."

"چ بەڵێنێک؟"

"دەبێ بەڵێن بدەی، لە گۆشەیەکی ئەم دنیایە، ئەگەر بە زیندوویی دەرچووی، دابنیشی و ورد ورد چیت بەسەر هاتووە و هەموو ئەو بەڵایانەی بەسەر خەڵکیشت هێناون بینووسیتەوە و بیخەیتە بەردەستی روقیە."

"روقیە دەبینمەوە؟"

"با بزانین چیت لە نێوچاوانی نووسراوە."

ئەوەیە چارەنووسی من.

2016 /7 /21

